# چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی

د. ڕەفیق شوانی

# چەند بابەتێکی زمان و
# ڕێزمانی کوردی

د. ڕەفیق شوانی

٢٠٠١ز ٢٧٠٠ کوردی

## پێشکەشی:

*بەو دەیان هەزار مرۆڤەی کە لەتوونی مەرگی ئەنفالی بەدناوا بە ئاگری رقی ڕەگەزپەرستی توێنرانەوە.

*بەو کوردانەی کە بەبێ هیچ تاوان کردنێک پەڕاگەندەی نۆ کۆماری سۆڤێتی کران و بەهەزاران کیلۆمەتر لە ولاتی دایکەوە بەرەو ولاتی غەریبی و غوربەت دوور خرانەوە، بۆ ئەوەی توانرا بێت بەقەد گەردێک لە کەلتوور و هەستی کوردانەیان دوور بخرێنەوە.

# ناوەڕۆکی کتێبەکە

# پێشەکی:

ئەم بەرهەمەی کە لەدوو توێی ئەم کتێبەدایە، بریتین لەچەند وتارێکی زمان و ڕێزمانی کوردی لە ئاستی ئەکادیمیدا و لەگۆڤارە کوردییە جیاجیاکاندا بڵاوکراوەتەوە. بەچاکم زانی لەکتێبێکدا پێکەوە بڵاوبکرێتەوە، بۆ ئەوەی زیاتر لەبەردەستدا بێت و سوود بگەیەنێت بەلێکۆڵینەوەی ترو لەخزمەتی زمانی کوردیدا بێت.

کتێبەکە کە بەناونیشانی (چەند بابەتێکی زمان و ڕێزمانی کوردی)یە، کراوەتە دوو بەشەوە، بەشی یەکەمیان (زمان)ە، باسی گەشەو گۆڕان و پەرەسەندنی زمانی کوردی و مێژووەکەی دەکات و ئەو لایەنانەی نیشانداوە، کە بوونەتە هۆی ئەو گۆڕانەو، نموونەی پێویست و لە باری ئەو بارە جیاجیانەم هێناوەتەوە، کە لە زمانەکەدا ڕەنگی داوەتەوە.

گەشەو گۆڕانەکەش ئەوە دەردەخات، کە زمانی کوردی، خاوەن سەربەخۆیی و کەسایەتی خۆیەتی، توانیویەتی بەپێی ئەو بوارو بارودۆخەی کەپێیدا تێپەڕیوە، پێویستییەکانی سەردەم، وەکو زمان حاڵی نەتەوەی کورد، لە گەیاندنی زانست و زانیاری و داهات و داهێنانی تازەو نوێ بەکۆمەڵی کوردەواری بگەیەنێت و کەسایەتی و ڕەسەنایەتی خۆی بپارێزێت.

بەشی دووەمی چەند وتارێکی ڕێزمانی کوردییە، کە لە ئاستی دەنگسازی و وشەسازی ڕستەسازی ئەو بابەتانە دەگرێتەوە، کە لێکۆڵینەوەکەی لەسەرکراوە.

وتارەکانی هەردوو بەشەکە لە ساڵی ١٩٩٠ەوە تاکو ساڵی ٢٠٠٠ دەگرێتەوە، نەمویست دەسکارییان بکەم لەرووی ئەو بیروبۆچوونەی کە لەئەنجامدانیان و لەو ماوەیەدا خراوەتەروو، بۆ ئەوەی وەکو خۆی بخرێنە بەردەست و بێجگە لەوەی، کە رەوتی لێکۆڵینەوەی من لەو ماوەیەدا دەخاتەروو.

لەکۆتاییدا هیوادارم ئەم بەرهەمە کەلێنێک لە بۆشایی دیواری زمانی کوردی پربکاتەوەو، لە هەمان کاتیشدا، بەردێک لە بالآی بەرەو بەرزیی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی زیاتر بکات و، بەڵێن ئەدەم بەکوردی دڵسۆز بەپێی توانا لە نووسین و بلاوکردنەوە دوا نەکەوم.

دواشت حەز ئەکەم ئەوە بڵێم، بابەتی نووسینەکانی من، تاکو ئێستا، هەر بواری پسپۆری خۆمی کە زمانەوانییە نەگرتۆتەوە، بەڵکو لایەنی جۆراوجۆری وەکو لێکۆڵینەوەو وتاری ئەدەبی، مێژوویی، سیاسی گرتۆتەوە، هۆکەشی ئەوەیە کە ئارەزوویەکی یەکجار زۆرم لەو جۆرە بابەتانە هەیەو لەگەڵ ناخمدا تێکەڵ بوونە، بێجگە لەوەش ئێمە خوێندەوارو رۆشنبیری کورد، ئەگەر شتێکمان لەباربێت و توانای ئەنجامدانیمان هەبێت و نەیکەین، ئەوا غەدر لەو میللەتی کوردەوارییە ئەکەین، کە ئێمە لە باوەشی گەرمی دایکانەی خۆی پەروەردە کردووەو پاراستووە، لەلایەکی تریشەوە، کەم تەرخەم ئەبین بەرامبەر نەتەوەو ولآتەکەمان، چونکە رۆشنبیران و نووسەران، باری لێپرسینەوەیان و، ئەرکی سەرشانیان لەرادە بەدەرگرانە، بەوەی نەتەوەی کورد تاکو ئێستا ماڵوێران و سەرگەردان و لەیەکتر دابراوە، ئەمجا بۆ ئەوەی برینی ئەم نەخۆشییانە سارێژ بکرێت، دەبێت ئێمەو مانان شاعیر وتەنی - گەر شەویش لەسەر رۆژ دابنێین بۆ میللەتی کورد هێشتا هەر کەمە-و گلەیی دوارۆژیش بەرامبەرمان بەدرێغی کردن لەولاوە بوەستێت.

ئەمجا هەوڵەکانی من، لەنووسیندا دوور لە زیادەڕۆیی و خۆهەڵکێشان، لەو بابەتانەی کە خستەمەڕوو بەشێوەی وتاری بڵاوکراوەن نزیکەی سێ کتێب پێکدێنێت، ئەوە بێجگە لە وتاری بڵاونەکراوە لەو مەیدانانەداو، بەرهەمی شیعرو پەخشانیش لەولاوە راوەستێت، کە گرِوتین و تاو ئەدەن بەنووسینەکانم و فەرامۆشی دەردی دووری هەوارگەی وێرانی ماڵەباوانم ئەدەن و چیای خاڵخاڵان و کەلی سمایل بەگیم دەخەنە یادو بەرچاوو خوڕەی ئاوی شیوەسووریش لایە لایەی کوردانەی دایکم پێ دەبەخشێت.

خوایاربێت، کاری ئایندەم، لەسەر رێزمانی راناو لە زمانی کوردیدا دەبێت و، لە کۆتاییدا سوپاس و رێزی بێ پایانم بۆ ئەو دڵسۆزانەی کە بەرهەمی چاک و بەکەڵکی نووسەران چاپ و بڵاو دەکەنەوە چ وەکو تاکەکەس و چ وەکو دەزگای لەچاپدان و بڵاوکردنەوە.

**د. رەفیق شوانی**

**هەولێر- ٢٨/١٢/٢٠٠٠**

# گۆڕانی باری ئابووری و
# فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی

ئەم لێکۆڵینەوەیە، کە بەناونیشانی (گۆڕانی باری ئابووری و فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی)یە، لە رادەی چۆنیەتی فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی، لەژێر پێشکەوتن و گۆڕانی باری ئابووری، لە بوارەکانی ژیانی کشتوکاڵی و مەڕداری و بازرگانی و پیشەسازی، بە هەردوو لایەنی ژیانی کۆن و تازەیانەوە، بەهۆی داهاتن و داکەوتن و داهێنانی جیهانی زانست و تەکنۆلۆجیاوە، کە لە زمانی کوردیدا رەنگیداوەتەوەو، دەکۆڵێتەوە.

لە لێکۆڵینەوەکەدا، هێمام بۆ ئەوە کردووە، کە ژیان بێ زمانی نابێت و، پێش ناکەوێت و بەهۆیانەوە شارستانیەت دروست دەبێت و، زمانیش بەهۆی رەنگدانەوەی گۆڕانی ژیانەوە، فەرهەنگی وشەکانی، لە گۆڕان و دەوڵەمەندبووندا دەبێت و، زمانیش بەشێکە لە شارستانیەت، کە پێکەوە هەردووکیان داهێنانی دەستی مرۆڤن.

زمانی کوردی بەگوێرەی، ئەو بارودۆخەی کە تیایدا تێپەڕبووە، هێشتا بەگوێرەی زمانی ترەوە گۆڕانی چاکی بەرەو پێشکەوتن و فراوانبوونی بەخۆیەوە دیووە.

لێکۆڵینەوەکە لە پیشاندانی وشەکانیدا، هێمای بۆ وشە وەرگیراوەکان، لە

زمـانی ترەوە، لەو بوارانەی سـەرەوەدا کـردووە. لەناو زمـانەوانانی کـوردا، لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆی بەم جۆرە، مەگەر لەناو وتارو لێکۆڵینەوەی تردا نەبێت نابینرێت.

زمان شتێکی گرنگەو، نیشانەو سیماو مۆرکی ناسینەوەی نەتەوەیەو، یەکێکە لە بنەماکانی بوونی نەتەوەو میللەت و، زمان ئاڵۆزترین دیاردەی سروشتە، مرۆڤ لە دروست بوونی کۆمەڵی سەرەتاییەوە، فێری بووە، پێش ئەوەی قسە بکات، بیری لە فێربوونی زمان کردۆتەوە. لە ترسی ئاژەڵی دڕەندەو دیاردە سامناکەکانی سروشت و، بۆ جێبەجێکردنی پێویستییەکانی ژیان، کۆمەڵی دروست کردووەو، پەنایان بردۆتە بەر پێکەوە ژیان و کۆمەڵی بچووک بچووکی ژمارە کەم کەسیان هێناوەتەکایەوەو بەرەنگاری ژیان و سروشتیان، بەهۆی پێویستییە گرنگەکانی ژیان، لە کۆکردنەوەی خواردەمەنی و، گەڕان بەدوای خواردن و ژیان بردنە سەردا کردۆتەوە.

لێرەوە زمـان وەکـو هۆیەکی دەربڕین، بۆ تێگەیشتن و لەیەک گەیشتن و دەربڕینی پێویستییەکان، هاتۆتە کایەی ژیانەوەو، بۆتە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی و بەشێک لە پلەی هۆشیاری و چالاکی مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا.

بێگومان ژیان بەبێ زمان نابێت، زمانیش بەبێ ژیان پێش ناکەوێت و، بۆتە بناغەی ژیان و بنەماکانی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، زمان ئاوێنەی ژیانەو، دیاردەکانی بە وشە تیا رەنگدەداتەوە. مرۆڤ و ژیان لە ئاستێکی وەستاو دانین و، گۆڕانیان بەسەر دادێت، ژیان هەمیشە بەهۆی گۆڕانەوە، لە بەرەو پێشچوون و پێشکەوتن و پەرەسەندن دایە، ئەم گۆڕانی ژیانە، بەهۆی گۆڕانی باری ئابووری و خۆش گوزەرانییەوە روودەدات و، لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری و رامیاری دەگرێتەوە، کە لە ئەنجامی نزیک بوونەوەی وڵاتانی جیهان، لەگەڵ یەکتر بەهۆی بەستانی پەیوەندی ئابوورییەوە، کە بەهۆی پەیدابوونی هۆی تازەی

بەیەک گەیشتنی ڕێگاوبانی وەک فڕۆکەو، پاپۆڕ، کەشتی، ئۆتۆمبیل، شەمەندەفەری خێراو، دەسگاو هۆیەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەری و، ئێستگەو تەلەفزیۆن و ڕادیۆو سینەما... هتد. ئەم پەیوەندییەی نێوان وڵاتان، لە ژێر پێشکەوتنی باری ئابووریەوە بووە، هۆی ئاڵوگۆڕ کردنی بازرگانی و، ناردن و هێنانی شتومەکی پێویستی بوارەکانی ژیانی وڵاتان، ئەمە بووە هۆی هاتنە کایەی زۆر وشەو زاراوەی تازەی سەر بەپێویستییەکانی ژیانی سەردەم و، کارتێکردنی شارستانێتی پێشکەوتووی ئەوروپا، بەتایبەتی لە ڕووی پیشەسازی تازەو تەکنەلۆژیای سەردەم و، زانست و زانیاری و داهێنانی تەکنیکی تازەی ئابووری و، هۆیەکانی تازەی بەرهەم هێنان و شێوازەکەی، بۆ ناو زمانانی گەلانی دنیا، بەتایبەتی گەلانی ڕۆژهەڵات و وڵاتانی جیهانی سێیەم، ئەمە خۆی لە خۆیدا، کاریگەرییەکی گەورەی کردۆتە سەر بیری خەڵک و شێوازی ژیانیان، کە ئەم هەموو لایەنە لە زماندا، ڕەنگدەدەنەوەو کاریگەری خۆیان هەیە، لە گواستنەوەی وشەی ناوو زاراوەی ئەو پێویستییانە بۆ ناو زمانانی دی، بە هۆی وەرگێڕان و وەرگرتن و داڕشتنەوە.

ئەم دیاردەیە، بەخواست و ویست و ئارەزووی مرۆڤ نایەتەکایەوە، بەڵکو زمان بەپێی یاسایەکی نەگۆڕو چەسپاو دەگۆڕێت و پەرەدەسێنێت و بەبێ ڕێکەوت، واتە لە ڕێکەوتەوە لە دایک نەبووە، پێویستی ژیان دەی گۆڕێت و کەس ناتوانێ بەری گۆڕانەکەی پێ بگرێ(١). بەڵکو بەهۆی پێویستی ژیان و سەردەم کارتێکردنی شارستانییەوە، ئەنجام دەدەرێت و، لە هەمان کاتیشدا وەرگرتن و خواستنەوەی ئەو وشانەی سەر بەو بابەتە پێویستی و شارستانیانەی دەبنە هۆی فراوان بوون و دەوڵەمەند کردنی فەرهەنگی وشەی زمان و، پێویستیشە ئەو وشانە کە لە زمانی میللەتی خاوەن زانست و داهێنەرەکەوەن، بخرێنە ژێر ڕکێفی دەستووری زمانی دووەمەوە لە ڕووی گونجاندنی دەنگ و

دەربڕینەوە، بەرادەیەکی کە دوای ماوەیەک لە ناو زمانەکەدا دەسوێن، دەتوێنەوەو ڕواڵەتی زمانە تازەکە ئەپۆشن.

ئەم وشانە، وەکو ناوو زاراوە، بۆ ناونانی کەرەسە و ئامێری ئامرازە تازە داهێنراوو داکەوتووەکانی دونیای تازەی، پڕ زانست و تەکنولۆژیای جۆربەجۆری تازەترین کۆمپیوتەرەوە دێنەکایەوەو، فەرهەنگی زمانەکە دەوڵەمەند دەکەن و، ئەو گۆڕان و پەرەسەندنەی ژیانیش، وشەو زاراوەو دەربڕینی تازە دەبەخشێ بە زمانی میللەتان.

ژیان و شارستانیەت، کە لە ئەنجامی کردارو رادەی ژیری مرۆڤەوە، لە بوارە جیاجیاکانی پێویستی مرۆڤایەتیدا، سەر هەڵ ئەدەن و، دەبنە سیمای پێشکەوتنی هۆش و بیری مرۆڤ و ئادەمیزاد لەناو کۆمەڵدا. ئەم ژیان و شارستانیەتە، مەحاڵە بەبێ زمان دروست نابێت و پێش ناکەوێت، نەتەوەو میللەت، لە وریابوونەوەو گەشەسەندن و گۆڕانی شارستانیەتدا، پێویستی بە زمانێک هەیە، ئەو گۆڕان و گەشەکردنەی پێ دەربڕێت و لە زمانەکەشدا رەنگبدەنەوە(٢). رەنگدانەوەکەش بەرێگای (وەرگرتن و دارشتن و وەرگێران)ەوە بە ئەو شتە تازانەی، لەناو کۆمەڵدا، لە بواری (مادی و واتایی)یەوە(٣)، فەرهەنگی زمانی دووەم، بە وشەو ناوی تازە، لە بواری کاروبارو ژیانی تازەی کۆمەڵی مرۆڤایەتیدا، بەکاردەهێنرێن و دەوڵەمەند دەکەن. چونکە ژیان، بەبێ زمان، لە ئاستێکی وەستاودا دەبێت و، گۆران و پەرەسەندن بەخۆیەوە نابینێت. بۆیە زمان، بەشێکی زیندووی شارستانییەتەو بە بنەڕەتی دروست کردنی دادەنرێت و، ژیان و شارستانیەتیش بەهۆیەوە، دەگۆڕێن و پێشدەکەون، زمانیش بەهۆی رەنگدانەوەی ئەو گۆڕان و پێشکەوتنە، وشەکانی فراوانتر دەبێت، لە بووژانەوەو تازە بوونەوەی بەردەوام دایە.

زمان لە پرۆسەی گۆڕاندا، ئەوە نییە هەر وشە وەرگرێت، بەڵکو وشەش بە

زمانانی تر دەبەخشت، واتە زمان دیاردەی وەرگرتن و بەخشینی وشەی، لە ژێر کارتێکردنی گۆڕانی ژیان، بەهۆی باری سیاسی و ئاینی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیرییەوە، لە ژێر پلەی پێشکەوتنی ئابووری و قۆناغەکانی ژیاندا تیادا ئەنجام دەدرێت، بە مەرجێک خاوەی زمانەکە ئاگاداری کەسایەتی و تایبەتیی خۆی بێت و، نەبێتە ژێر لافاوی وشەی بێگانەوە، چونکە زمانانی جیهان، ئالوگۆری وشەو زاراوەییان هەیە، لەم رووەوە زمانی کوردی توانیوێتی وشە بنچینەییەکانی خۆی بپارێزێت و کاریگەرییەکی کەمی زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی پێوە دیاربێت و، ئەمەش هیچی لە زمانی کوردی کەم نەکردۆتەوە. چونکە زمانی کوردی، لە چۆنیەتی پێشکەوتنیدا، زمانێکی سەربەخۆیەو، گۆڕانی راستەقینەی خۆی هەیە، نە لە فارسییەوە وەرگیراوە، نە داتاشراوە،(٤) باشترین بەڵگە، بۆ ئەم لایەنە، ئەوەیە ئەگەر بە بەراورد سەیری زمان و نووسینی کوردی، سەردەمی شێخ مەحموود، (رۆژنامەی کوردستان ١٩٢٢-١٩٢٣)، لەگەڵ ئێستادا، بکەین بۆمان دەردەکەوێت، کە زمانی کوردی گۆڕاوەو، پاک بۆتەوە لە وشەی بێگانەو، تەنانەت لە شێوەی نووسینیشدا، زیاتر لە فارسی گۆڕاوە، بۆ زمانی کوردی وەکو هەر زمانێکی تر، کەوتۆتە ژێر کاریگەری وشەی زمانە پێشکەوتووەکانی ئەوروپاو، ولاتە پێشکەوتووەکانی بواری زانست و زانیاری و تەکنۆلۆژیاو، بۆیە بەهۆی گۆڕانی باری ئابوورییەوە، ژیانی پێش دەکەوێت و ئەم پێشکەوتنەش، بەزۆربەی زمانانی ولاتانی جیهانەوە، لە ژێر کاریگەری و وشە وەرگرتنی زمانە پێشکەوتووەکانەوە، دیارەو وشەکانی بۆ ناو زمانانی دی بلاودەبێتەوە، کاریگەری بەسەریانەوە زیاترە. زمانی زیندوو رەسەنیش ئەوەیە کە توانای جێبەجێ کردنی پێویستییەکانی سەردەمی قسە پێکەرانی هەبێت لە وەرگرتنی ئەو زانست و زانیاریانەداو، توانای پێشکەوتنی هەبێت، بۆیە ناتوانرێ، بە زمانی سەدەکانی رابردوو، دەربارەی

گیروگرفت و رووداوو گۆڕانەکانی ئەمڕۆ بدوێین، چونکە هەموو سەردەمێک زمانی خۆی هەیە (٥) و خاسیەتی (تایبەتین)، زمانی زیندووش ئەوەیە بەپێ کات و سەردەمی جیاجیا، لە گۆڕاندایەو، توانای وەرگرتن هەبێت و لە بوارەکانی راگەیاندن و رۆشنبیری و رادیۆو تەلەفزیۆندا بەکاردەهێنرێت. بۆیە زمان بەبەشێکی زیندوو شارستانێتی مرۆڤ دادەنرێت و لێشی جیانابێتەوە، واتە لە شارستانێتی نەتەوە دانابڕێن و تووشی ئەم گۆڕان و پەرەسەندنە دەبێت و، زمانی کوردیش کە تەرخانە، بۆ بابەتی ئەم لێکۆڵینەوەیە، یەکێکە لەو زمانانەی، توانیویێتی وەک زمانێکی زیندوو رەسەن پێویستییەکانی سەردەم و قسە پێکەرانی جێبەجێ (١) بکات و لەگەڵ رادەی پێشکەوتنی بواری زانست و زانیاری و تەکنۆلۆژیا، بەپێی بارودۆخەکەی خۆی بڕوات و رادەیەکی چاکی بڕیوە.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، دەربارەی پێشاندانی وشەکانی زمانی کوردییە، لە بوارەکانی ژیانی کشتوکاڵی و مەڕداری و بازرگانی و پیشەسازی، کە بەهۆی گۆڕانی باری ئابوورییەوە، گۆڕانی بەسەردا هاتووەو، لێکۆڵینەوەکە دەربارەی پێشاندانی وشەی کۆن و تازەی بوارەکانی سەرەوەن، وشەی تایبەتی زمانەکەی خۆی بێت و، گۆڕابێت بە وشەو ناوی تازەی یا وەرگیراو بێت، کە لە ئەنجامی گۆڕانی ژیاندا، بەهۆی گۆڕانی کە بەسەر کەلوپەل و پێویستییە کۆنەکان، بە هی تازەو هاتنە ناوەوەو وەرگێڕانی کەلوپەل و کەرەسەو بەرهەمی نوێی سەر بە زانست و زانیاری تەکنۆلۆژیای نوێ و، وڵاتانی پێشکەوتووی ئەورووپاو بەرەنگدانەوەی لە زمانی کوردیدا، چۆنیەتی لێکۆڵینەوەکە بریتییە لە کۆکردنەوەو دیاری کردنی دوو جۆر وشەی زمانی کوردی، بۆ ناوی ئامێرو ئامرازو کەرەسەو کەلوپەلی ناو خۆی و خۆماڵی و کوردەواری، لە لایەک و هی وەرگیراوو بێگانەش، دەربارەی ژیانی کشتوکاڵ و بازرگان و پیشەسازی لەلایەکی ترەوە،

گۆڕانی زمان، بەهۆی گۆڕانی باری ئابوورییەوە، تەنها لە رووی وشە وەرگرتن و وشە زیادبوونەوە نییە، بەڵکو لایەک دەنگ و پێکهاتنی رێزمانی و، شێوازی دەربڕینیش دەگرێتەوە، بەلاّم لێکۆڵینەوەکەی ئێمە تەنها سنووری وەرگرتن و فراوانبوونی وشەکانی زمانی کوردی دەگرێتەوە، نموونەکانیشی لە شوێنی خۆی و، لە تەک باس کردنی بابەتێک لەو بابەتانەی سەوەوە، بەنموونەوە تەنانەت لە شوێنی پێویستیشدا بەلێدوانەوە دەهێنینەوە.

زمان لە گۆڕانیدا، گەلێک هۆ لە ژێر پێشکەوتنی باری ئابووریدا، کار دەکەنە سەر گۆڕانی و دەوڵەمەند بوونی فەرهەنگی وشەکانی، کە بە هەموویانەوە هۆیە ئابوورییەکان دەگرنەوە، ئەمانەن:

١- «شارستانێتی نەتەوە بەهەموو دەستوورو داب ونەریت و رەوشت و بیروڕاو لایەنی هۆشەکی و رادەی ژیری و هۆشیاری و پلەی رۆشنبیرییان و تێڕوانیان بەرامبەر بە ژیان و گۆڕانی لایەنەکانی، هەر گۆڕانێک لەم روانەوە روودەدات، رەنگدانەوەکەی لە زمانی کۆمەڵەکەوەو بەشێوازی قسەکردن و وشەکانیدا دیارە» (٦)

٢- فراوانبوونی شارنێتی نەتەوەو، زیادبوونی پێویستییەکانی دەزگاو لایەنەکانی ژیانیان و، بەرزبوونەوەی رادەی تێگەیشتن و بیرکردنەوەو، توانای شیکردنەوەیان بەرامبەر دیاردەکانی ژیان و گۆڕانە جۆربەجۆرەکانی، ئەمانە هەموویان زمانەکە دەبووژێننەوەو، شێوازەکەی بەرزو بەهێز دەکەن و، واتای وشەکانی وردتر دەبێت و وشەی زۆر هەیە لایەنی بەرێگای وەرگرتن و وەرگێڕان و دانان و داڕشتن، بۆناونان و دەربڕینی شتە تازە داکەوتوو پەیدا بووەکانی بواری ژیانی تازەی هاوچەرخ و تازەی وەک: کۆمپیوتەر، مانگی دەستکرد، مایکرۆ، فڕۆکە، رۆکێت، پاراسایکۆلۆجی، تیشکی لێزەر، تەلەفزیۆنی رەنگاورەنگ، بێ سیم(بێتەل)، فاکسمایل، ڤیدیۆ... هتد.

٣- دیاردەی چالاکییە ئابوورییەکان، شێوەیەکی تایبەت دەدەن بە زمان لە وشەو واتاو شێواز، ئەم دیاردەیە، دەبێتە هۆی بوونی دیاردەی جیاواز، لە زمانی نەتەوەو ناوچەکاندا، بەبێ جیاوازی جۆری بەرهەم و سیستەمی ئابووری و کاروباری ژیانی مادی و جۆری پیشە و ئیشەکانی وەک کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی و راوکرن.

بەخێوکردنی مەڕو ماڵات، ئەم دیاردانە، هەموویان کار لە زمان و فراوانبوونی وشەکانی زمان دەکەن.

٤- گۆڕان و گواستنەوەی ژیانی نەتەوە، لە کۆچەرایەتییەوە، بۆ شارستانێتی زمانەکەی فراوانتر دەبێت و، شێوازی توندو تیژی پێوە نامێنێت و نەرمی دەگرێتە خۆی، لە دەربڕینی و واتاناسیدا. بۆ نموونە زمانی لادێ و کۆچەر، توندو تیژە. نموونەی وشەکانی ئەم لایەنە، لە زمانی کوردیدا، پێش گۆڕان و گواستنەوە کە وەک: خێوەت، رەشماڵ، کولێن، هەوار، دەوار، پاوەند، شەواژوو، بێرە، یەک بێرە، شەو بەکێ، دووبیرە، بەردە بێرە (داربێرە) تەروالە، لە ژیانی نیشتەجێ بووندا، وشەکان دەگۆڕێن بە: خانوو، ماڵ، هۆڵ، هەرزالە، قەرسیل، دیوەخان، حەوشەو بان.

٥- جیاوازی چینایەتی، لای هەندێک نەتەوەو کۆمەڵ بەهۆی جیاوازی ئیش وکارو پیشەوە، بۆتە جیاوازی پلەی کۆمەلایەتی، لەناو خەڵک و کۆمەڵدا وە بۆ ئیش و پیشەی هەر یەکێک لەو پلە کۆمەلایەتیانە وشەیەک دانراوە، هەندێکیان لەلایەن سوڵتان و خەلیفەی عوسمانلیەوە بۆ پیاوی خاوەن دەسەلات و دەوڵەمەند پێیان.. بەخشتراوە، وەک وشەی: بەگ بۆ نازناوو شۆرەتی بنەماڵە، جا وشەکانی: کوێخا، ئاغا، خان تایبەتن بەو جۆرە کەسانەی، کە دەسڕۆو خاوەن دەسەلات و پیاوی سەر بەدەوڵەت بوونە. هەروەها وشەکانی: سەپان، گاوان، جوتیار، شوان، باخەوان، بەرخەوان، ئاودێر، وەرزێر، تایبەتن بە ئیش و کاری

خەڵکی لەوان خوارترو نزمتری پلەی کۆمەڵایەتی، بەهۆی پلەو پایەو باری مادی و چینایەتی ئەم خەڵکانەوە. ئەمجا بۆ کرینی ئیش و کاری هەر یەکێک لەوانە وشەی تایبەت هەن، وەک: شەرتە شوانی، گاوانی، سەپانی (بۆکرێی شوان و گاوان و سەپان) هەروەها جوتیاری، باخەوانی، بەر خەوانی وە یا وشەی مووچە بۆ کرێی فەرمانبەران. ئەمانە وشەیەکی زۆر دەهێننە ناو زمانەوەو دەوڵەمەندێ دەکەن.

٦- پێویستییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و کاروباری سەردەم، دەبنە هۆی پەیدابوونی وشەو زاراوەی تازە لە زماندا، چ لە ناو خودی زمانەکەوە، سەر هەڵ ئەدەن و، یا لە زمانی ترەوە وەردەگیرێن، لە هەمان کاتیشدا، دەبنە هۆی لەناوچوون و نەمانی وشەو ناونانی شتی تازەو داهاتوو داکەوتوو. گرنگترین هۆیەک لەم رووەوە، دەبنە هۆی لەناوچوونی وشە لە بەکارهێناندا، دەگەرێتەوە بۆ لە ناو چوونی واتای وشەکان و بەکارنەهێنانیان لە ژیاندا، بەهۆی بەسەر چوونیانەوە، وەکو جلوبەرگی جەنگی و هۆیەکانی گواستنەوەو ئامێرەکانی پیشەسازی و پێوانەوە بارەو چالاکی سیستەمی کۆمەڵایەتی لەناو چوون و، بەکارهێنانیان بەسەرچووەو، لەگەڵیانیشدا وشەکانیان لەناو دەچن و وردە وردە نامێنن، مەگەر لە فەرهەنگدا تۆماربکرێن وەک: روپیە، عانە، لیرە (لیرەی رەشادی)، پێنج فلسی، دە فلسی، فلس، مەتاڵ و قەڵغان، سوپەر، شمشێر (شیر)،خەنجەر، تفەنگی یەک تیر، سێ تیر، ماوزەر،قوناخر، قوناغ خڕ)، تازەکانیش: حەربە (سونگی) ئارپیجی، تانک، فرۆکە، هاوەن، ساروخ، هەلیکۆپتەر، هەروەها وشەی کێشان و پێوان وەک: ئەلیدرەم، ئیزرەم، هۆقە، باتمان، گەز، باڵ گۆران و بەکیلۆگرام، مللی گرام، تەن، مەتر، تۆپ. پارە تازەکانیش وەک: دینار، پێنجی، دە دیناری، بیست و پێنج دیناری، پەنجایی/ نیو دیناری..

هەروەها نەمـان و بەسـەرچوونی هەندێک باج و جـۆرەکـانی وەک: ملکانە، دەیەک (العشر)، سەرانە، بزنانە، مـەڕانە، یا باجی خانوو لە هەندێک وڵاتدا، کە لە سەدەی (١٩ز)یەوە تاسیەکانی ئەم سەدەیە، هەندێکیـان لە خاوەنەکانیان و، هەندێکیـانیش هەر مـاون، لـە شـوێن ئەمـانە، وشـەی باجی داهات (ضریبە الدخل) لە زمـاندا هاتەکایەوە، وشە کۆنەکانی سەرەوە فەوتان و لەبیرچوونەوە، بەهۆی نـەمـانی هەندێک دیاردەی چالاکی و رژێمی کـۆمـەڵایەتی، لە فـەوتان و تەواوبوونـن لەگـەڵیـدا، وشـەکـانیـشـیـان بەکـار نـایەن، هەروەها نزیک بوونەوەو کارتێکردنی دوو زمانی وەک ئینگلیزی و نورمـاندی، بەهۆی پێویستی ژیانەوە، کارتێکردن لە نێوانیـاندا روودەدات، زمـانی ئینگلیـزی لە زمـانی نورمـاندییەوە، وشەی وەرگرت، لاتینی لە زمـانی گریکیـەوە زیاتر لە هەموو زمانێکی تر وشەی وەرگـرتووە، یا زمـانـی عـەرەبی، لە یوونـانیـیـەوە وشـەکـانی جەنگی و زانسـتی سـروشـتی و ئـامـێـری چاودێری (الات الرصـد) یا ئەڵـمـانی لە سـویدی و فەرەنسـاییەوە یا کوردی لە عـەرەبی و تورکی فـارسـیـیـەوە وشەی وەرگرتووە. لە تورکـیـیـەوە ئەداغ، یەغـدان، ئاش (چێشت)، ئەگلەنجە، نـاتر، لە فـارسـیـیـەوە: نەردەوان روخسار، بلور، دارچین، کافور، یاقوت.

٨- کـارتێکردنی دوو زمـان لەسـەر یەک و، بەهۆی نـزیک بوونەوەیان و پێکەوە ژیـانیـان لە سنووری وڵاتێکدا وەک کارتێکردنی زمـانی عـەرەبی بەهۆی وەرگرتنی فەلسەفەو شەریعەتی ئیسـلامـەوە، لەلایەن میللەتی ناعـەرەبەوە، کە زمانی ئیسلام و قورئانی پێ نووسراوەتەوە، هەروەها کارتێکردنی رۆشنبیری ئەو زمانە، بەسەر زمـانی کوردی و رۆشنبـیری کوردییـەوە، بەدەیان وشـەی کـەوتووتە ناو زمانەکەوە، وەک: حەج، سەرفترە، کافر، مؤمن، توحید، ئیمان، لیلە القدر، رمـضـان، مـسلمـان، امـام، ئەسـحابەو سەحـابی (صـحابە)، خـەلیـفـەو خـولەفـا، صـوفی، دەروێش، شـێخ... هتد. یا وەرگـرتنی وشـەی شکارتـە (کرێی شوان و

جـوتيـار بەتۆوكـردنی پارچەیەكی بچـووكی زەوی بەگـەنم وجـۆ) لە وشـەی (ئەشكارو، ئەشكارە، شكارە)(٨)ی ئەكەدییـەوە هاتۆتە ناو زمـانی كـوردی و وەریگرتووە. هەروەها وشەی (ئەكارو، ئەكار) بەواتای كارو ئیشی كشتوكاڵی، بەم شێوەیە وشەكانی زمانی كوردی، زیادی كردووەو زمانەكەش دەوڵەمەندبووە گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

٩- زۆر شتی مـادی و بەرهەمی كشـتوكـاڵی، لەبەر پێویست بوونی خۆی و ناوەكـەی بەوڵاتاندا بڵاوبۆتەوەو، بازرگـانی پێـوە دەكـرێ و، چۆتە ناو زمـانی میللەتانەوە، ئەم بەرهەمە كشتوكاڵییەی وەک وشەی (چای، شای، تی)، چۆتە ناو زۆربەی زمانی وڵاتانەوەو كوردیش لەگەڵیاندا، ئەم وشەیە لە زمانی چۆمی (جزیرە)مالیزیاوەیە كە سەرچاوەی بەرهەم هێنانی ئەم (چا)(٩)یەیە چۆتە ناو زمانی كوردی و ئینگلیزی و فەرەنسییەوە. هەروەها وشەكانی (زەعفـەران، شـەكـر، كـافـور، شـەراب، قـاوە، لیـمـۆ، چۆنەتە ناو زمـانانی تری میللـەتـانـەوە لـە وشـەكـانی زمـانـی ئینگلیـزییـەوە وەک Layman, Coffe, Sherbet, Syrop, Camphare,Suger,) Safron) ئەم وشانە، دوای گـۆڕان و گـونجانی دەنگییەوە، زمـانی كـوردیش وەریگرتوون و بەكاردێن. هەروەها وشەو زاراوە ئابوورییەكان، پاش گۆڕانی باری ئابووری و قۆناغـەكانی ناو كۆمەڵ، لە زمـانی میللەت و وڵاتانی پێشكەوتۆوە بەناو زمانانی وڵاتاندا بڵاودەبنەوەو بەكاردێن، یا بەوەرگرتن و داڕشتن یا بەرەو گێڕانیان وەک: پرولیتاریا، برجوازیەت، سوشیالیزم، بیروسترۆیكا، گلاسنۆست، هەروەها وشەی تازەش، لەناو خودی زمانەكەوە، لە قۆناغە جیاجیاكانی ژیاندا دێنە ناو زمـانەوە بۆ نموونە لە كـوردیدا ئابووری، قـۆنـاغی كـۆیلایەتی، دەرەبەگایەتی، سەرمایەداری، كرێكار، زەحمەتكێش، رەنجدەر، سەپان، پالە، وەرزێر، خاوەن ملك، (ملكدار)(١٠)

لە پاڵ ئەم هۆیانەی سـەرەوەشـدا بەهۆی دانان و دەرکـەوتنی بازاڕەوە، بە هەمـوو تایبەت و داب و دەسـتوورەکانیـەوە لە هەندێک وەرزدا، بازاڕی کـڕین و فـرۆشـتنی تایبـەت لە شـارو لادێدا پەیدا دەبن و، جـمـوجـوولێـتی ئابووری دێتەکایەوە، کـە ئەمـەش دەبێـتە هۆی پەیدابوونـی زمانێکی تایبەت بەو وشـەو زاراوەکـانـیـیـەوە، لەکـاتی کـڕین و فـرۆشـتندا (١١)، ئەم دیاردەیەش لـە ناو کـوردەواریدا دێتـە ناوەوە، لەکـاتی وەرزی پێـگەیشـتنی بەرووبوومـی ئاژەڵ و مەڕومـاڵات و میـوە فـرۆشتن لە بەهارو هاویندا وەک وشـەکانی: ماست، پەنیر، لۆر، ژاژی، قەیماغ، کەرە (کەری)، رۆن، موو، خوری، هەروەها شامی (شفتی - شـوتی)، کـاڵەک (گـوندۆرە)، هەرمێ، ئاڵ و باڵـو، هەڵۆژە، هەروەها وشـەکـانی دانەوێڵەی وەک: گەنم (گەنمە قەناری، گەنمە رەشگوڵ، گەنمی مەکسی پاک) جۆ، نۆک/ نیسک، کزن، ماش، هەرزن، لە زمانماندا لە کۆنەوە رەنگیـان داوەتەوەو بە هۆیانەوە هەندێک ناوی پیـشـەو ئیش وکـاری وەک: مـاست فـرۆش، پەنیـر فرۆش، گەنم کڕ، تەڕاح، خوری کـر، جامباز، قەساب، جەڵەب، کافـرۆش، خوێ فـروش، خانی گەنم، لە زمانی کـوردیدا پەیدابوونەو، هەندێکیـان بوونەتە وشـەی نازناوو شۆرەت بۆ خۆیان و بنەماڵەو زمانەکەش بە هۆییانەوە، دەوڵەمەند بوونەو وەک: حەمە کافـرۆشی، سالە جامباز، عەلە قـەساب، حەمە شوان، لەم رووەوە زمـانـی کـوردی وشـەی کـەمی زمـانە بێگانەکـانی مـەگـەر بەدەگـمـەن نەبێت وەرنەگـرتووە، بەهۆی خـاسـیـەتی ئیش و کـارو بازاڕەوە کـە ناوخۆیی یە دوورە لەکارتێکردنی دەرەوە مەگەر وشەی (تەراح، جەلەبی) نەبێت کە کوردی نییە.

لێـرەوە لێکۆڵینەوەکـەمان بەنموونەوە لە شوێنی پێویسـتیـشـدا، بەلێـدوانەوە گۆڕانی باری ئابووری، کە دەبێتە هۆی دەوڵەمەندبوونی وشەی زمانی کوردی، لە بوارەکانی کشتوکاڵ و مەڕداری و بازرگانی و پیشەسازی، بە دووشێوەی ژیانی کـۆن و ژیانـی تازەی ئەو بارانەوە، بەوشـەوە نـاوی ئەو کـەرەسـەو ئـامـێـرو

ئامرازانەی، کە سەر بەولایەنانەی سەرەوەن بەپێی مێژووی کۆن و تازەیی ئەو قۆناغانە:

١- قۆناغی مەڕداری و کشتوکاڵی و سەردەمی کۆن و تازە.

٢- قۆناغی بازرگانی سەردەمی کۆن و سەردەمی تازە.

٣- قۆناغی پیشەسازی سەردەمی کۆن و سەردەمی تازە.

## قۆناغی مەڕداری و کشتوکاڵی دووبەشە:

**أ- قۆناغی مەڕداری**

**ب- قۆناغی جوتیاری و کشتوکاڵی**

أ- **قۆناغی مەڕداری:** بریتییە لە قۆناغی ژیانی خێلەکی و دەرەبەگایەتی لەم قۆناغەدا، خەڵکی ناو کۆمەڵ خەریکی، بەخێوکردنی مەڕو مالاتن، لەم قۆناغەدا بایەخی ژیانی کۆمەڵ، لەسەر، بەرووبومی ئاژەڵ و بەرهەمی کشتوکاڵییە. لەم قۆناغەدا بەرهەم هێنانی رادەکەی بەرز دەبێتەوەو پێویستییەکانیان، لە جاران زیاتر فراوانتر دەبن، ئەم ژیانە لە بواری بەرهەم هێناندا شێوازی تایبەتی خۆی هەیە، کە بریتییە لە شێوەی بەرهەم هێنانی کۆن و پەیوەندی بەرهەم هێنانیش، هەمان شێوەی کۆنە، لەم بوارەدا وشەی زۆر هەن کە لە زمانی کوردی رەنگیان داوەتەوەو، بەهۆی سروشتی ژیانەکەوە کە دوورە لە کارتێکردنی ژیانی دەرەوە، وشەی ناوی ئامێرو ئامرازو کەرەسەو کەلوپەلی ئەم شتانە لەناو خودی زمانەکەوە سەریان هەڵداوەو فەرهەنگی زمانی کوردییان دەوڵەمەند کردووە. پاش داهاتنی ژیانی تازە، بە هۆی گۆڕانی باری ئابوورییەوە، وشەو ناوی ئەو دیاردە کۆنانەی ئەم ژیانە بەهۆی وشەو ناوی تازەی سەر بەژیانە تازەکەوە، بەر راماڵین دەکەون و لەبیر دەچنەوە. نموونە:

**ناوی پیشە و ئیشکەرانی ژیانی مەڕداری و مەڕومالات:** شوان، بزنەوان،

کارەوان، بەرخەوان، گاوان، گولکەوان.

ئەم جۆرە ژیانە لە پیشەو ئیش و کاردا، گۆڕانی بەخۆیەوە نەدیووە، تا وشەی تازە لە زمانی ترەوە وەربگیریت بۆ ناو زمانی کوردی، تا بەنموونە بیهێنینەوەو، ئەو دیاردانە هەروەکو خۆیان ماونەتەوە.

**ناوی کەلوپەلی پێویست:** قاپوت، فەرەنجی (کولە بال)، پوزەوانە، کەلاقۆڕی (شەپقە لە خورییە) ،نانە بەرە (جانتای نان)، گۆچان قەلەنک، هەگبەی شوان، داربێرە (بەردە بیرە).

لە ژیانی تازەدا، هەندێک کەلوپەلی ئەم بوارە، گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

ئەویش بەشێوەیەکی کەم نەبێت، ژیانی مەڕداری و ئاژەلداری گۆڕانی کەم پەیدا بووە، وەک لە جیاتی: قاپوت، سەر کلاو قەمسەلە جزمە لە جیاتی پوزەوانە بەکاردێت لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە بۆ زمانی کوردی.

**ناوی وشەکانی شوێنی بەخێوکردن:** هۆل، ئاخوڕ، بەندگە پەچە (هەوێز - پەچەمەڕ)، حەسار، حەوشەو مەر، بەندگە، کاتە، کۆز، پاوەن، تەوێلە، قەرسیل، پەرێز.

لە ژیانی تازەداو پاش گۆڕانی ئابووری، بەهۆی سروشتی ژیانەکەوە، وشەی تازە نەهاتۆتە ناو زمانەکەوەو، گۆڕانیش ژیانەکەی نەگۆڕیوە، بەشێوەیەکی وا کە لە زمانەکەدا رەنگی دابێتەوە.

**ناوی کەرەسەکانی بەخێوکردنی مەڕومالات:** کۆل، بیر، دەولک (دۆلکە) ئالیک، کاو ئالیک، قەرسیل.

لە ژیانی تازەدا گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، لە کوردەواریدا هەر وەکو خۆی ماوەتەوە.

**ناوی وشەکانی کرێی ژیانی مەڕداری:** شەرتە شوانی، شکارە(١٢)، نانە زگ (نان و زگ) گاوانی (کرێی گاوان)، بەرخەوانی.

له گـۆڕانی ژیانی کـوردەواریدا، لەم رووەوە، تەنهـا کـرێی ئەم پیـشـانەی سـەرەوە، لە وەرزییـەوە بووە، بە رۆژانە، یا مـانگانە، کـە لەژیانە کـۆنەکـەدا، بۆ ماوەی شەش مانگ لە بری کرێ دا دەبڕا، بێ گوێدانە ژمارەی رۆژو مانگەکانی ئیشکردنەکە، شایانی باسە هەندێک لە ژیانی ماوەیەک لەمەوبەردا، تەنانەت تا کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان بەنانەزگ ئەو ئیشانەی سەرەوە لە لایەن کەسانی هەژارو کەم دەرامەتەوە راپەڕێنراوە.

**وشەکانی باج وەرگرتنی ئاژەڵداری:** ئەم جۆرە باجانەی خوارەوە، جاران لە کۆندا، پەیپێی ژمارەی سەر، لە خاوەن ئاژەڵ بەتایبەتی لەکاتی جەنگدا سێنراوە. وەکو لەلایەن دەوڵەتی عوسمانلیەوە، لە جەنگی یەکەمدا بۆ مەڕو بزن و شتی تر دانراوە وەک: مەڕانە، بزنانە، سەرانە، ئەم جۆرە باجانە ئێستـا نەماون و لەناو زمانەکەشدا لەبیرچۆتەوە، مەگەر بۆ یەکێک شارەزاو لەو سەردەمە ژیابێت.

**ناوی جـۆری ئاژەڵ کـڕین و فـرۆشتن:** داشت (بۆ بەخێـوکـردن و سـوود لێ وەرگرتن)دا بەستـە، مەڕو بزنی قسر (واتە نەزاو) ئەم لایەنە گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە تا وشەی جێگریان لە زمانەکەدا رەنگی دابێتەوە.

أ- وشەکانی جوتیاری و کشتوکاڵی: لەم بوارەشدا ژمارەیەکی زۆرە وشە لە زمانی کوردیدا رەنگی داوەتەوە، هەندێکیـان لە ناو زمانەکە خۆیەوەو هەندێکی تری لە زمانانی بێگانەوە وەرگیراون، بۆ کۆنەکانیان پێویستە تۆماربکرێت.

ئەگینا پاشمـاوەیەک لەبیردەچنەوە، وشەکان بەپێی سەردەمی ژیانی کۆن و تازەییان پۆل دەکەین چونکە زۆربەیان نەماون وهی تازەو نوێ هاتۆتە شوێنیان.

**ناوی کـەرەسـەو ئامـێـرو ئامـرازی جـوتکردن:** هەوجـارو کـەرەسـەکـانی وەک (گاسن، دەسەدووم، خەپە، مژان، نیرە، چەمبەرە، خوێنە)، لابیتە مەکینەی سێ گـاسن هەر سـەردەمی ژیانی ناوەڕاستـەوە لەجیـاتی (هەوجـار) هاتۆتە کـایەوە. ئامـێـرە تازەکـانی جـووت کـردن، وەک: تراکـتـۆر (ترێکتـەر) کـەرەسـەکـانی لە

(خرماشه بۆدی، چامرلغ، گێر، سوکان، کۆیل، ملف، کاسکێت، رادێتەر، قایشی رادێتەر، دیلکۆ، ئامێری تۆودەر، ماڵە(١٣) پێکهاتوون. ئەم وشانە لەرێی گۆڕانی باری ئابوورییەوە، لە زمانی بێگانەوە ئینگلیزییەوە لە ناو زمانی کوردیدا رەنگیان داوەتەوەو وشەکانی دەوڵەمەند بووە.

**وشەکانی پەیوەند بەرووبەری زەوی کشتوکاڵییەوە:** ئەو رووبەرە زەویەی کە تۆ و دەکرێت و کشتوکاڵی لێ بەناو دەهێنرێت، دەکرێتە چەند پارچەکەیەوە، لەکاتی جووت کردن و دێراو برینەوەدا، بۆ مەبەستی ئاسان بوون و هەڵسوڕانی ئیشەکەو جۆربەجۆر کردنی بەرهەم و چاندنی شتی جیاواز، لە یەکتر بۆ گەنم و جۆ، پاقلە، نیسک... وە یا بۆ تەماتەو خەیارو بامیەو باینجان.. هتد. ئەمە دەبێتە هۆی رەنگدانەوەی وشەیەکی زۆر لە زمان، وەک:

لات، لات وبان، سەدە، نیو سەدە، نیولات، سەدەوبان، دێراو، گۆل، خەت.

**کەرەسەو ئامرازی درەوکردن (دروونە):** داس، داسولکە، قەێناغ، هەستان، ئەمانە کۆنن و پاش ماوەیەک لە بیر دەچنەوە.

ئامێری سەردەمی ژیانی ناوەڕاست بۆ دروونە، وەک: شەپشەپە(١٤) (بەهۆی ئێسترو ولاخەوە بەکاردێت.

**ئامێری تازە درەوکردن:** بەهۆی گۆڕانی باری ئابووری و پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنۆلۆژیاوە ئامێرێ تازە بابەت هاتۆتە مەیدانی کارەوە لەلایەن ئەوروپاوە، ئەمەش لە زمانی کوردیدا چ وەکو بەکارهێنان و، چ وەکو وشەیەک لە ژیان و زمانی کوردیدا رەنگی داوەتەوە، وەک: کومبایین (دەراسە)، کەرەسەکانی.

**وشەکانی جۆری زەوی کشتوکاڵی:** بەیار، وەرد، شۆو، زاخێر، نەرمان، دێم، بەراو، دێمەکار، رەقان، چەقین، ئەم وشانە لەگۆڕاندا جێگریان لە زماندا بۆ پەیدا نەبووە، چونکە سروشتین و پەیوەندن بەجۆری خاک و زەوییەوە.

**جۆری زەوی کشتوکاڵی لەڕووی خاوەندارێتییەوە:** زەوی مڵک (خاوەنی تایبەتی هەیە) زەوی وەقف (بۆ کاری ئاینی و کۆمەڵایەتی و خێری سەربە ئەوقافە)، (زەوی ئەمیریٚ واتە هی میری و دەوڵەتە) زەوی خەوتوو (الاراضی المتروکه)(١٥) بۆ ئەمە (بڕوانە: التطور الاقتصادی فی اوربا والعالم، ل٢٩٧).

**جۆری زەوی تۆ وکردن:** وشکە وەرد، تەڕەکاڵ، بەیار، پەرێز، خێتۆک.

**وشەکانی کەرەسەی گیشەکردن:** شەغرەو کەرەسەکانی وەک (شاگردۆغلان، چەڵە، چەمبەر، خەپە، شیش مەڵۆ، کرمە، چاکڵ، ئەم کەرەسانە لە زماندا هەموو کۆن بوون و ماکینەی کۆمباین کە ئامێرێکی درەوکردنە لە ژیانی تازەدا شوێنی دەیان ئامێرو ئامرازو کەرەسەی کۆنی لە بواری درووندا گرتۆتەوە وەک: داس، شەغرە، تەنانەت بەهۆی شوفێرەکەیەوە شوێنی سەپان و پاڵە پرۆسەی درەوکردنی گرتۆتەوە،

**وشەکانی کەرەسەی خەرمان کوتان:** چان لە مژان و نیرەو خەبە پێکهاتووەو خۆشی لەگیای سورناتکە دروست کراوەو، بەشولی دارتوو بەستراوەتەوە گێرەو خەرمانی بەهۆی گوێدرێژو وڵاخەوە پیٚ دەکرێت، کۆنترین کەرەسەیە دوای (پاگێرە)، کە ئەمیش تەنها بریتییە لە رستکردنی چەند (گوێدرێژێک)، جەنجەڕ: (بەهۆی وڵاخەوەو گەورەکەی بەهۆی تراکتۆرەوە خەرمانی پیٚ ئەکوترێ، ئامێرێکی سەردەمی ناوەڕاستە، دوای گۆڕانی ژیان و لە عەرەبییەوە وشەکەی هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، شەنە (شەنەی دار، شەنەی ئاسن)تازەترینی ئامێری خەرمان و درەوکردن کۆمباین: (دەڕاسە)یە ئیشی چەند ئامێرێک و چەند ئیشێکی وەک: درەوکردن، کێشانەو، گێرەوکوتان، شەنەبا) لە یەک کاتدا رادەپەڕێنێت (بۆیە لە شوێنی تریش لە سەرەوە باسمان کردووە لە ئامێری درەودا) ناوەکەش شوێنی ناوی چەندین ئامێری وەک: داس، شەغرە، جەنجەر،

شەنەی گرتۆتەوە).

**وشەکانی بواری (درەوکردن):** تەبارە (رووبەرو شێوەی دەغڵ ودان پێش دروست کردن)، قایە (هەمان شتە وەک تەبارە، بەڵام بەوشکی و کاتی درەوی هاتووە)، بەر، سواڵە، نواڵە، پەرێز، کە لە باوش، (گەلاوێژ) (بۆ گەنم)، تایە (بۆ جۆ یا گیشە) مەلۆ، شارا، وشک، باقە، دەسک. هەروەها وشەکانی بواری پرۆسەی خەرمان کوتانیش وەک: کۆزەر، کۆزەرو بەربا، قرچە شکێن، وردە کوت، پەرەناو، بنمل، پاخۆ، شەنەبا، تارم، جێز، جۆخێن، خەرمان هەڵگرتن، گێرە. ئەم وشانەی سەرەوە، بەهەر دوو بەشەکەیەوە، ئەگەرچی ئابووری و سەر بە ئابووری نین، وەک کەرەسەو ئامێرو ئامرازو کەرەسەو کەلوپەلی ژیانی ئابووری، بەڵام لەبەرئەوەی لە سنووری ئەو ژیانەدان و بە تۆمارنەکردنیان لەبیردەچنەوە. بۆیە بەپێویست زانرا تۆماریان بکەین وشەو ناوی تازەی جێگریان لە ژیانی تازە دانێین.

**ناوی شوێنی دانەوێڵە هەڵگرتن:** عەمبار، چاڵ، چاڵە گەنم، چاڵە جۆ، بۆ کاتی مەترسی و ناخۆشی)، کەندوو، هۆڵ، ئەم شت و شوێنانە بۆ هەڵگرتن و پاراستنی دانەوێڵەن و هەندێکیان وەک ناوی شوێنی کا هەڵگرتن: کادان، لۆدە.

**ناوی پیشەو ئیشکەرانی کشتوکاڵی و (فەلاحەتی):** جوتیار، سەپان وەرزێر، پاڵە، سەرپاڵە، تێلەکێش(مەلۆنێر)، کۆڵکێش، توتنەوان باخەوان، ئاودێر، رەزەوان.

شەغرەکێش (هەر سەپان یا کەسێکی تر ئەیکات)، گێرەکەر، فەلاح(١٦) وشەیەکی وەرگیراوە لە زمانی عەرەبییەوە.

**جۆرەکانی راپەڕاندنی ئیش و کاری کشتوکاڵی:** جێبەجێکردنی ئیش و کاری کشتوکاڵی لەناو کوردەواریدا بەکرێ سەپانی یا بەیارمەتیدانی زبارە، هەرەوەزی

له لایەن لادێوە ئەنجام دەدرێت، ئەمەش جۆرە کانێتی وەک بە: جوتیار، سەپانی وەرزێری، کرێ پالەیی، زبارە، هەرەوەزی.

هۆو ئامێرو جۆرو شێوازی ئاودان: هۆکانی ئاودان وەک: باران و، کانی و جوگاو کارێز، بیر، ئەستێل، بنەوان.

ناوی ئامێرەکانی ئاودان(١٧)، وەک ناعور، شێوەی کۆنە، مەکینەی گازی شەش قوەت، مەکینەی بەنزین، شێوەی ژیانی ناوەند، بۆ ئاودان.

بیری ئیرتوازی: تازەترین ئامێری کارەبایی ئاودانەو، لە زمانی کوردی رەنگی داوەتەوە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە، ئاوبارەی بۆ بەکاردێت بۆ فرێدانی ئاوە بۆ بەرزایی. جۆرو شێوازی ئاودان: وەک، گۆل، خەت، دێراو، مەرەزە، ئەمانە ناوی شێوەی زەوییەکەن، کە بەو شێوانە دەکرێن و ئاو دەدرێن. شێوازی ئاودان رێگای تازەو نوێی نییە بۆ ئاودان، مەگەر خانووی نایلۆنی (بیوت زجاجیە) ئەمەش لە کوردستاندا پەیرەو ناکرێت بەهۆی ساردییەوە، بۆیە وشەو ناوی تازەمان نییە.

کەرەسەو ئامرازەکانی: لە ئاودان و ئیش و کاری کشتوکالیدا ئەم وشانە بەکاردێن و بۆ هەندێک کەرەسە، وەک: باج، بیل، خاکەناس، بالتە (قازمە).

**ئامێرو ئامرازە کۆنە هارین و کۆتان:** دەستار، جونی، ئاسیاو (ئاشی ئاو) مێکوت، ئەمانە ناوی کەرەسە کۆنەکانی هارینن، کە لە زمانەکەوە سەریان هەلداوە.

هی قۆناغی ناوەراست: ئاشی ئاگر (ئاسیاو)

هی قۆناغی تازە: ئاسیاوی کارەبایێ (مطحنە، طاحون) تارادەیەک لە زمانی کوردی قسە کردندا وەک وەشەیەکی وەرگیراو لە زمانی عەرەبییەوە لە کوردیدا بەکاردێت لەلایەن خەلکی دانیشتوانی شارەوە.

ناوی وشەکانی کرێی کشتوکالی و جوتیاری: لە زمانی کوردیدا چەند

وشەیەک لەسەردمی ئەو ژیانەوە، واتە دەست پێکردنی ژیانی کشتوکاڵی رەنگی داوەتەوە، لە دوای گۆڕانی قۆناغ و باری ئابووری بەرەو ژیانی تازە، تەنها لە رووی ماوەی سەندنی کرێکانەوە، گۆڕانی بەسەردا هاتووە، لە وەرزییەوە بۆ رۆژانەو مانگانە، وەک: شکارتە (هی جوتیار هی شوانیش هەیە)، سەپانی (دەیەک) شەرتە شوانی (وەرزییە) کرێ پاڵەیی (رۆژانەیە)، ئیجار، (لە جیاتی بەکرێدانی زەوییە).

لە ژیانی تازەدا، بەهۆی کارکردنی ئامێری تازەی وەک. تراکتۆرو دەراسەوە لە جووت کردن و درەو کردندا، کرێ سەندن بەسەعاتە. پاڵەیی و سەپانی و جووتیاری بەهۆی ئامێرو مەکینەی تازەو خێرایی ژیانەوە، ناوو وشەکانی لە زمانی کوردیدا ئێستا بەکار نایەن و، لە بیر دەچنەوە؛ وشەکانی: کرێی دەراسە، کرێی تراکتۆر، کرێی کاکوت، شوێنی کۆنەکانی لە زمانەکەدا گرتۆتەوە.

ناوی باجی کشتوکاڵی: لە کۆنەوە، تاسەردەمی ژیانی ئێستاش لە لایەن دەسەلاتدارو دەوڵەتەوە، بۆ زەوی و زارو بەرهەمی کشتوکاڵی دانراوەو لە جوتیارو فەلاح سەنراوە، هەندێکیان لە سەدەی (١٩ز)ەوە تائێستاش هەرماوە وەکو: ملکانەی زەوی، دەیەک (العشر) باجی داهات (ضریبە الدخل)، سێ یەک چواریەک لە بەرووبومی کشتوکاڵی(١٨).

لە ژیانی ئێستاشدا وشەی (ئیجار) عەرەبییە، بۆ گرتنی زەوی کشتوکاڵ و بەناوهێنانی، وەرگیراوەو لە کوردیدا بەکاردێت.

## وشەکانی بواری بازرگانی:

کردەی بازرگانی لە ناو کۆمەڵی کوردەواری خێڵەکی و سەردەمی دواکەوتووی کشتوکاڵیدا، بریتی بوو لە شێوەی ئاڵ و گۆڕکردنی (سلع المقایضە) بەرووبووم و بەرهەم بەجۆرێکی تری بەرهەم، کە بەپارەو دراو ئەنجام نەدەدراو، لەبەر نەبوون

و کەمی پارەو بوونی ئەو جۆرە بەرهەمانەی، کە ژیانی ئەوسای خەڵکی لەسەر راوەستابوو. ئەم دیاردەی کرین و فرۆشتنەو سەوداو مامەڵەکردنە، بە زۆری لە لادێدا دەکرا، پاش گۆرانی ژیان و بەهۆی پەیدابوونی هۆی تازەی بەرهەم هێنان و گۆرانی چۆنیەتی شێوازو پەیوەندی بەرهەم هێنانەوە بەرهەم زیادی کرد، خەڵکی لە ژیانی راوو شکارەوە(١٩) وازی هێنا، بۆ ژیانی چاندن و بەرهەم هێنانی دانەوێڵەو زیادکردنی، لەم رووەوە پێویستی ژیان پەرەی سەندوو، ئامرازی تازەی کارکردن کە بە بناغەی ژیانی نوێ دادەنرێت و، باری ئابووری گۆرا، پرۆسەی کرین و فرۆشتنی بەرهەم لە بازاردا هاتە کایەوەو شاریش پەیدابوو، لەگەڵیدا بازرگانی ئاڵوگۆر کردنی شت و مەک لە سەرەتاوە پەیدا بوو، دوای پەیدابوونی دەسەڵات و دەوڵەت، بەشێوە تازەو داهێنانی یاساوە سکە لێدراو پارەو دراو، بووە هۆی کرین و فرۆشتن وردە وردە دیاردەی (ئاڵوگۆرکردنی)ی شت و مەک کەم دەبۆوە، پێویستی یەکانی ژیان تا دەهات زیادی دەکردو لە هەڵکشانیشدا بوو، زۆر شتی تازە لە شێوازی ژیانی تازەدا هاتەکایەوە، بەجۆرێک ئەم ژیانە تازەیە، لە زماندا رەنگی دایەوە، وشەکانی زمان دەوڵەمەندو فەرهەنگەکەی لە زیادیدا بوو، بەدەیان وشەی نوێ، چ لەناو خودی زمانەکەو پاش گۆرانی ژیان و پێشکەوتنی بەهۆی گۆرانی باری ئابووری تازەوە، کە ئەمیش بەهۆی پەیدابوونی هۆیە تازەکانی گواستنەوەی وەک کەشتی، پاپۆر، ئۆتۆمبیل، فرۆکەی بارهەڵگر، شەمەندەفەری خێرا، بازرگانی بەتەواوی پەرەی سەندو گۆراو برەوی ژیان خۆشتربوو، شتی تازە و پێویستی ژیانی نوێ جۆر بەجۆر بوو، بازرگانی لە ناوەوە گەیشتە دەرەوە، لەگەڵ وڵاتاندا پەرەی سەندو، ئەم دیاردە تازەیە، لە زماندا بەتەواوی رەنگی دایەوە، ژمارەی وشەکانی فەرهەنگی زمان، لە زیادبوون و دەوڵەمەندبووندا بوو، پروپاگەندەو ئاگاداری و راگەیاندنی بازرگانی، لەگۆڤارو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆندا، بۆ خزمەتی

بازرگـانی دەکـرا، ئەمـە زمـانی بەتەواوی بەوشـەی تازەو نویّ و وەرگـیـراو دەوڵەمـەند بوو، لەم رووەوە گـرنگتـرین هۆیەک، بۆ گـۆڕانی زمـان و دەوڵەمەندبوونی، دەگەڕێتەوە بۆ ژیانی کۆمەڵ، و کـاروباری ژیانی بەکۆمەڵ، وەک وشەکانی بازرگانی، نموونە:

## وشەکانی کڕین و فرۆشتنی کۆن:

سەودا، مامەڵە، میوە فرۆشتن، بازاڕ لە وشەی(باج- باژ)باژێرەوە (وشەی باج باز پەیدابوو)، خـۆراک، دانەوێڵـە، مـیـوە، بەگـەنم، (بەجـۆ، بەنۆک، بەنیسک) تریّ فرۆش، تەماتە فرۆش، جەوت فرۆش... هتد.

## وشەکانی پیشەو ئیش و کاری کڕین و فرۆشتنی سەردەمی ناوەڕاست:

بەقـاڵ، دێوەرە، کـاروانچی، تووتن فـرۆش، جـامبـاز، خـانچی، توتنچی، جەڵەب کڕ، کوتاڵ فـرۆش، گەنم فـرۆش، دوکـاندار، خوری کڕ، حەماڵ (کـۆڵ هەڵگر) ئەم وشـەیە بەهۆی زمـانی عـەرەبییـەوە هاتۆتە ناو زمـانی کـوردی و وەرگیراوە، لەسەردەمی زۆر بوونی کڕین و فرۆشتندا پەیدابووە)، هەندێک لەم وشـەو ناوانە، بۆتە نازناوو شـۆرەت بۆ خـاوەن و بنەمـاڵەکـانیـان، وەک: نوری بازرگـان، سـالە حەمـاڵ، عـومەر خـانچی، مـوسا کـوتاڵ فـرۆش، حەمـەدەمین توتنچی... هتد.

## وشەو ناوە تازەکانی پیشەو ئیش و کاری بازرگانی:

لەسـەردەمی بازرگـانی تازەدا هەمـوو بوارێکی ژیـانی تازەدا، بەهۆی گـۆڕانی باری ئابوورییەوە، پیشـەو ئیش و کـار دابەش دەبێت و، پسـپۆڕی و شـارەزایی

پەیدا دەبێت، هەر کەس ئیش و کاروپیشەی خۆی دەکات. ئەمەش یەکێکە لە دیاردە تازەکانی ژیانی شارستانیەت و، بازاڕی تازەدا وەک: بازرگانی کوتاڵ، بازرگانی جل و بەرگ، بازرگانی خواردەمەنی، بازرگانی شت و مەکی ناوماڵ، چەرچی، ئاردفرۆش، کوتاڵ فرۆش، قەپانچی، پێڵاو فرۆش، خوێ فرۆش، خوری کڕ، وشە وەرگیراوەکانی ئەم بوارە بە زۆری لە عەرەبییەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، وەک: حەماڵ، جەڵەب کڕ، جوملە فرۆش، قەبانچی، سەیدەلی، سەیدەلانی، اسواق، ئەسواق مەرکەزی، جەرەزات، مرطبات، بایع، معرض، صالون، مجزرە، دەلاڵ، تاجر، تجار (توجار)، جملە، موفرەد، روزمە(باقە)، شەددە، کارتۆن، قەسابخانە، مەیدان هەندێک وشە لە زمانی ئینگلیزییەوە وەرگیراوەو لە زمانی کوردی بەکاردەهێنرێت لە بواری کڕین و فرۆشتن و شوێنەکانیدا، وەک: سوبەر مارکت، کافتریا، ئورزدی باک، سێت. ناوی شوێنە بازرگانیەکان بازاڕ، بازاڕگا، خان، کۆشک، دوکان، فرۆشگا، فرۆشگای شۆڕش.

## وشەکانی ئامێرو کەرەسەی کێشانی کۆن:

تەرازووی دەست، تەرازووی میل هی سەردەمی ژیانی ناوەند، دەربارەی کەرەسەی کێشان لە کۆندا هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، وەک: ئەلیدرم، ئیزرەم،ئەمانە تورکمانین، لە زمانی عەرەبییەوەش هۆقە (نیو هۆقە)، باتمان (کوردییە)، نیو باتمان. وشەی تەن (طن) لە بازرگانی تازەدا بەکاردێت، لە ئینگلیزییەوە وەرگیراوە، قەپان (لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە)، تەرازووی ئەلیکترونی تازەیە لە زمانی ئینگلیزییەوە وشەکانی/: گرام، مللی گرام، کیلۆگرام، لە کڕین و فرۆشتنی ژیانی تازەدایە.

گەز، نیوگەز، باڵ، لە زمانی ئینگلیزی بێگانەوە وشەی مەتر، باڵە (بالە). بەکوردی/ تۆپ (نیو تۆپ)، دەستە دەرزەن، باقە (نیو باقە)، فەردە (نیوفەردە) لە بواری بازرگانی تازەدا، وشەکانی، تەنەکە، سندوق، (لە عەرەبییەوە وەرگیراوە) فەردە کارتۆن.

## وشەکانی سەر بەباجی بازرگانی:

لە بازرگانی و کڕین و فرۆشتندا، چ لە ناوەوە یا لەگەڵ وڵاتانی دەرەوە، بۆ هەموو شتێک و لە ناوخۆش بۆ هەندێک شت و مەک لەلایەن دەوڵەتەوەوە (باج) دەسەنرێ و دەخرێتە پارسەنگی پرۆسەی بازرگانییەوە، وەک: باجی گومرگی لە بازرگانیدا دەسەنرێت.

**عموله:** لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوە بۆ کوردی، بۆ هەقی خان و شوێنی کڕین و فرۆشتن، گومرگی توتن، خوێ، ئەم جۆرە باجانە لە زمانی تازەو کۆندا بەکاردەهێنرێن و ماون. ترانسێت: لە زمانی ئینگلیزییەوە هاتۆتە ناو زمانی کوردی بۆ بازرگانی دەرەوەیە، بەرمیل، بۆشکە: لە زمانی عەرەبی و فارسییەوە لە بواری بازرگانیدا هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە بۆ کڕین و فرۆشتنی نەوت و گاز.

**وشەکانی ناوی پارەو دراو:** لە بواری بازرگانیدا پارەو دراو هۆی ئەنجامدانی کڕین و فرۆشتنە بەهۆی گۆڕانی ژیانی ئابوورییەوە هەندێک دراوو پارەی کۆن بەهۆی بەرزبوونەوەی نرخ لە بەکارهێنانیدا نەماون و لەبیر دەچنەوە، هەندێکیان لە زمانی عەرەبییەوە و هەندێکیان لە زمانی ئینگلیزییەوە، هاتوونەتە ناو زمانی کوردی، چ لە شێوەی کۆنەکەی و چ لە تازەکەیدا. بێجگە لە رەنگدانەوەی هەندێک وشەو ناوی پارەی جیهانی کە لە کوردیدا رەنگیان داوەتەوە، وەک: عانە، پێنج فلس، دە فلس، بیست فلس، پەنجایی، روپیە، روبع، دراوی

عەرەبین و تێکەڵ بە وشەی کوردی کراون هەروەها: درهەم، نیو درهەم، دینار، پێنج دیناری، دە دیناری، بیست و پێنج دینار، پەنجا دیناری، پارە کۆنەکانیش کە لە زمانی بێگانەوە وەرگیراون لە کوردیدا بەکارهاتوون، وەک: قرۆش، لیرە، لیرەی رەشادی، لیرەی قوستەنتینی، لیرەی عوسمانلی، ئەم دراوانە لە بازرگانی ئێستا لە زمانی کوردی وەکو وشەیەکی مردوو ماونەتەوەو دینار شوێنیانی لە کڕین و فرۆشتندا گرتۆتەوە.

**دراوی بێگانە و ئەوروپایی:** هەندێک دراوو پارەی جیهانی یا ئەوروپایی بەهۆی بازرگانی نێو دەوڵەتییەوە، هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوە وەرگیراون لە نووسین: دۆلار، فرەنک، پاوەن، رۆبل بەهۆی گۆڕانی ژیان و باری ئابووری تازەوە، چوونە ناو زۆربەی زمانەکانی میللەتانی جیهانەوەو وەک وشەیەکی زمانەکەیان تەنانەت لە زمانی کوردیشدا بەتایبەتی (دۆلاری ئەمریکی) بەکاردێت.

**چۆنیەتی ئەنجامدانی کڕین و فرۆشتن لەکۆندا:** لە سەرەتای پەیدابوونی مامەڵەو سەوداو کڕین و فرۆشتندا، بەهۆی نەبوونی پارەوە، ئەنجامدانی لە سنووری ناوچەیی و ناوخۆییدا پەیدا بووە شێوەی ئاڵ و گۆڕی (سلع المقايضە) بە بەرهەمی تر، بەم شێوانەی خوارەوە لە زمانەکەدا بەوشە رەنگی داوەتەوە، وەک: سەر بەسەر، یەک بەیەک، یەک و نیو، یەک ودوو، یەک و سێ... هتد.

**قۆناغی پیشەسازی:** ئەم قۆناغەش بەهۆی زیادبوونی رادەی بەرهەم و بەرهێنانەوە، لە سنووری پێویستی ماڵ و خێزانەوە، بۆ بوارو سنووری دێهات و، پاشان بۆ سنووری ناوچەو شارەکان بە رادەیەک کە دەبێتە هۆی پەیدابوونی کەرەسەی خاو و سەرمایە، کە بەهۆیانەوە کارگەو پیشەسازی سەری هەڵداوە.

لەسەرتاوە لەناو کوردەواریدا، لە دێهاتەوە بەشێوەی ئیش و کاروپیشەی بچووک لەسەر ئاستی پێویستی خێزان و دێدا، پیشەسازی یا باشتر وایە بڵێین،

پیشـەی دەستی، لە کۆندا دەستی پێکردووە، وردە وردە گەشەی کردووەو لەگەڵ گەشەکردنی و پەرەی سەندنی ژیاندا، پیشـەسازی گـەورە، لەسـەر ئاسـتێکی گەورەو داهاتی پیشەسازی و تەکنۆلۆژیای جیهانی پەیدابوو، ئەم بارە تازەیە، لە زماندا بەشێوەی وشە لە زمانی میللەتانداو لە زمانی کوردیشدا رەنگی دایەوە، فەرهەنگی زمانەکەی بە دەیان وشەی زمانە ئەوروپاییەکان بەتایبەتی لە زمانی ئینگلیـزییـەوە دەوڵەمـەندو فـراوان بوو، وشـەکانی خـرانە ژێر رکێـفی دەنگ و دەسـتـووری زمـانی کـوردییـەوەو، لە زمـانی قـسـەکـردن و زمـانی نووسـینیـشـدا بەکاردێن و رەنگیـان داوەتەوە، وەک: لەم بوارانەدا، بەپێی سەردەم لە کۆنەوە بۆ ژیانی تازە:

## وشەکانی بواری پیشە دەستی کۆنی کوردەواری:

لە بواری ئامـێرو ئامرازو کـەرەسـەی بەرهەم هێنانی کـۆن وەک: پاچ، تەور، تیشک (تەشوو)، چەقۆ، بێڵ، باڵتە(قازمە)، خاکەناس، دەسـتـاڕ، مـێکوت، هەوجاڕ، ئاشی ئاو، لاپیـتە، بێڵەقـان، شـەغرەو کـەرەسـەکانی، داس، داسـولکە، قەیناغ، هەستان، چەکوش.

**پیشـەی جۆلایی تەون و کـاری دەسـتی:** کـلاشی پەرۆ، کـلاشی بەن، رانک و چۆغەی کـر، پەستەک، لباد، لاکێش، فەرەنجی (کـوڵە باڵ)، قاپووت، پوزەوانە، گۆرەوی خوری) لفکە (لیـفکە)، (ئەوانەی پێشەوە لە خوری دروست دەکرێن)، رەشکە، جـەواڵ، تیـر، هەگـبـە، خـەرار، بەرە، بەرمـاڵ، پۆیەشم، (پۆیەشـمێن، تورەکە، مافـور، رایەخ جاجم، رەشماڵ (خێوەت) ئەمـانە لە موو دروست دەکرێن یاتێکەڵن لە خــوریش و لە لایەن جــۆڵاو هەلاج و تەونکەرەوە کــە نموونەی پیشەسازی کوردەوارین دروست دەکرێن.

**پیـشـەی خـەراتی (دۆمی):** هێـڵـەک، بێـژنـگ، سـەرەند، شـەنە، بۆپاک کردنەوەی دانەوێڵەو گەنم و جۆ بەکاردێن.

پیشەسازی هۆیەکانی هاتووچۆی کۆن: بەلەم، کەلەک، (عارەبانە (گالیسکە).

**پیشەسازی ئامرازی سەردەمی ناوەڕاست/:** جەنجەڕ، شەپشەپە (ئامێری دروونەیەو بەهۆی ئێستەرەوە بەکاردەهێنرێن). مەکینەی ئاسنی جووت، گالیسکەی بەرووبووم کێشانەوە.

**ناوی پیشەسازە کۆنەکان:** هەلاج، تەونکەر، جۆلا، کارگەچی،خەڕات، قازانچی، موتابچی، ئاسنگەر، مسگەر، بۆیاغچی، کلێچی، کورە چی، تەنەکە چی، خەمچی، هەروەها وشەکانی سابونچی، نەجاڕ لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراوەتە زمانی کوردی.

پێویستە هیما بۆ ئەوە بکەین کە ئەم وشانەی بواری سەرەوە، دوای گۆڕانی باری ئابووری و، داهاتنی ژیانی تازەو پەیدابوونی داکەوتنی بەرهەمی پیشەسازی تازەی تەکنۆلۆجیا، زۆر ئامێرو پیشەسازی تازە ناوەکانیان هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە یا ناوەکانیان لە زمانی خاوەن و میللەتەکانیانەوە، وەرگیراوە بۆ ناو زمانی کوردی و زۆریش لە بەرهەمە کۆنانە لەگەڵ ناوەکانیان لە بیرچوونەتەوە، یا وردە وردە لەبیردەچنەوە بەهۆی پەیدابوونی ئامێرو کەرەسەی هاوچەرخ و تازە شوێنەکانیان لە زمانەکەو بەکارهێناندا دەگرنەوەو هەندێکیشیان وەک خۆیان دەمێنێتەوە، نموونە:

**پیشەسازی تازەی:** ئاشی ئاگر (ئاسیاو)، ئاشی کارەبایی، ئاشی گەرۆک، کارگەی مافور کارگەی رستن و چنین، کارگەی پێلاو، کارگەی لوقم، کارگەی سۆندە، کارگەی شیرەمەنی (ماست)، کارگەی پەلەوەڕ، کارگەی کاشی، کارگەی بلۆک، کارگەی ئەلیمنیۆم (لە ئینگلیزییەوە وەرگیراوە بۆ ناو کوردی)، کارگەی روخام (لە عەرەبییەوە وەرگیراوە)، کارگەی کەللە شەکر، کارگەی چیمەنتۆ (لە عەرەبییەوە وەرگیراوە).

**ناوی هۆیەکانی تازەی گواستنەوە:** فڕۆکە، کەشتی، پاپۆڕ، شەمەندەفەر، تەیارە، سەیارە، سەفینە، غەواسە، قطار، لە زمانی عەرەبییەوە وەرگیراون ناوی پیشەو ئیش کەرانی پیشەسازی لە عەرەبییەوە، وەرگیراون لە زمانی کوردیدا رەنگیان داوەتەوە وەک: مصلح، بەڕاد، کارەباچی، لحیمچی، سەعاتچی، نجار، سوبغچی.

**وشەکانی بەرهەمی پیشەسازی جیهانی:** کە لە ناو زمانی کوردیدا رەنگیان داوەتەوەو، وەکو وشەیەکی کوردی لە نووسین و قسەکردندا بەکار دەهێنرێت و، خراونەتە ژێر دەستووری بەکارهێنانی زمانی کوردییەوەو، زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووە، پێویستە ئەمەش بوترێت، کە وەرگرتنی وشەی بێگانەو ئەورووپایی و ئینگلیزی نابێت بەشێوەیەکی کوێرانە بێت و زۆری لە زمانەکە بکرێت و بەکار بهێنرێن، پێویستە وەرگرتنیان دوای گونجاندنی دەستوورو نەبوونی وشەی خۆماڵی و کوردی بێت، ئەگینا، بەپێچەوانەوە زمانە کە دەخرێتە ژێر لافاوی وشەی بێگانەوەو، پاش ماوەیەک تایبەتی نەتەوەی خۆی لە دەست دەدات و وەرگرتنی ئەم وشانەش بە زمانی خاوەن و میللەتەکەیانەوە ناونراون بەهۆی پێویستییانەوە بەناو زمانانی جیهاندا بلاوبوونەتەوە، بۆیە کاری خراپ ناکاتە سەر زمان. نموونەی وشەکان ئەمانەن:

تراکتۆر، کومباین، پایسکیل، ماتۆر، ترام، تاکسی، لۆری، جێب، پیکاب، لاندرۆڤەر، لاندکرۆزەر، رانج رۆڤەر، ڤۆلگا، تیۆتا، لادە، فیات، ریم، مارسیدس، سوپەر، جامپۆ، فەرگەسۆن، دیزل، رادیۆ، تەلەفزیۆن، ڤیدیۆ، مایکرۆفۆن، گرامافۆن، ئیرکوندێشن، کۆمپیوتەر، بارۆمەتر، میکرۆسکۆب، کامیرا، سینەما، ترانسستۆر، کۆیل، رادێتەر، رادار، مایکرۆ، تەلەفۆن، تەلەگراف، شوفڵ، گرێدەر، بیلدۆزەر، ...هتد.

**لە زمانی عەرەبییەوە:** سەیارە، تەسجیل، سماعە، مبردە، غسالە، مجمدە،

فون کاویل، مکینه، طباخ، سۆبە، کاویە، جهاز، لاسلکی، مصفی، کەوسەرە، مشار، مضخە، کەلابە (قلابع)، کابسە.

ناوی ئیش کەرانی پیشەساز بەئینگلیزی: بەهۆی بوونی هەندێک کۆمپانیای ئینگلیزی ئەمەریکایی وەکو هی نەوت، گاز لە هەندێک شاری کوردستان و کوردنشیندا وشەی پیشەسازو کارگەرانی و پیشەزان لە زمانی ئینگلیزی کەوتۆتە ناو کوردی و بەکاردێن وەک: فۆرمەن، فیتەر، وایەرمەن، ئستاف، ئنجنێر، هەروەها وشەی ئۆف (پشـودان) هاتۆتە ناو زمانی کوردی و لە ئینگلیزییەوە وەرگیراوە.

## وشەکانی بەرهەمی پشەسازی جیهان:

کەلەناو زمانی کوردیدا رەنگیان داوەتەوەو وەکو وشەیەکی کوردی لە نووسین و قسەکردندا بەکار دەهێنرێت و خراونەتە ژێر دەستووری بەکارهێنانی زمانی کوردییەوەو زمانەکەیان دەوڵەمەند کردووەو پێویستە بوترێت، کە وەرگرتنی وشەی بێگانەو ئەوروپایی و ئینگلیزی نابێت بەشێوەیەکی کوێرانە بێت و زۆر لە زمانەکە بکرێت و بەکاربهێنرێت، پێویستە وەرگرتنیان دوای گونجاندنی دەستووری و نەبوونی وشەی خۆماڵی و کوردی بێت، ئەگینا بەپێچەوانەوە زمانەکەمان دەخرێتە ژێر لافاوی وشەی بێگانەوەو پاش ماوەیەک تایبەتێتی نەتەوەیی لەدەست دەدات، وەرگرتنی ئەم وشانەش بەزمانی خاوەن و میللەتەکەیانەوە ناونران و بەهۆی پێویستییانەوە، بەناوی زمانانی جیهاندا.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوە:

بەهۆی ئەم لێکۆڵینەوەیە گەیشتوومەتە ئەم ئامانجانەی خوارەوە:

١- ئاگاداری بوون و ئاگا لێ بوونی وشە کۆنەکانی زمان، بەتایبەتی ئەوانەی لە بواری ژیانی ئێستادا بەسەرچوون و، بەهۆی پێویست نەبوونیانەوە بەکارناهێنرێن و وردە وردە لە بیردەچنەوە بەتۆمارکردنیان دەپارێزرێن.

٢- لێکۆڵینەوە، بەگشتی و لێکۆڵینەوەی زمانەوانی بەتایبەتی ئەوانەی سەر بەزمانی سەردەمی ژیانی کۆن و تازەن فەرهەنگی زمان دەوڵەمەند دەکات.

٣- توانای زمانەکە بەرامبەر گۆڕان و پەرەسەندن مێژوویی و کۆمەڵایەتی لەڕووی تواناو گونجانی ژیانی تازەو سەردەمدا بەرامبەر زانست و زانیاری و چوونە پێشەوەی ژیانی دەردەکەوێت.

٤- تۆمارکردنی ناوی پیشەیی شارەزایان و جۆری پیشەسازی کوردەواری و باری ئابووری سەردەم لە زۆر قۆناغی جیاوازدا.

٥- هۆی گۆڕانی باری ئابووری و ژیانەوە، دەتوانرێ لە سنووری قسە بەکارهێنراوەکانا جۆری ژیانی سەردەم و چۆنیەتی دیارو دەست نیشان بکرێت، واتە بەهۆی وشەوە دەتوانرێ لێکۆڵینەوەی مێژووی زمان بکرێت.

٦- ناوو وشە کۆنەکانی بواری کشتوکاڵی و بازرگانی و پیشەسازی سەردەمی ژیانی کۆن بەپێچەوانەی بەشێکی زۆر ناوو وشە کۆنەکانی تازەی ئەو بوارانە لەناو زمانەکەوە سەریان هەڵداوەو وەرگیراون.

## پەراوێز:

١- بڕوانە: الدكتور علي عبدالواحد وافي/ اللغة والمجتمع، ١٩، ل ١٤٢
٢- د. خليل ابراهيم حماش، اللغة والحضاره، الاقلام عدد (٦)، ٩٧٥، ل ٤٨

٣- دکتۆر وریا عومەر ئەمین،بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، ١٩٨٩، ل ٧٢

٤-زبير بلال اسماعيل، مێژووی زمانی کوردی، وەرگێڕانی یوسف رؤوف علی، بەغدا، ١٩٨٤، ل٨٩، ٩٥.

٥- فؤاد حەمە خورشيد، اللغة الكردية، التوزيع الجغرافي للهجاتها، بەغدا، ١٩٧٣، ل٤٦.

٦- د. علي عبدالواحد وافي، اللغة والمجتمع، القاهرة، ١٩٥١، ل٩.م

٧- التطور الاقتصادي في اوربا والعالم، ترجمة د. محمد عبدالواحد العزيز عجمية بيروت ١٩٨٣، ل٢٩١.

٨- د. جەمال ڕەشید، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، بەغدا، ١٩٨٨، ل٤٢.

٩- د. علي عبدالواحد وافي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٣.

١٠- بڕوانە: ا/ التطور الاقتصادي في اوربا والعالم، ل١٨٧.

ب/ د. ابراهيم السامرائي، العربية تواجه العصر، موسوعة صغيرة، بەغدا، ١٠٥، ل٤٢.

١١- عبدالعزيز بن عبد الله، تطور الفكر واللغة، دار لسان العرب، لبنان، ل٩٧.

١٢- التطور الاقتصادي في اوربا والعالم، ٢٩٧.

١٣- د. مهندس مرعي، موسوعة المعاجم التكنلوجية التخصصية- الهندسة الزراعية ل٢٤.

١٤- د. مهندس حسن مرعي، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣١٦.

١٥- التطور الاقتصادي في اوربا والعالم، ل٢٩٧.

١٦- د. مهندس حسن مرعي، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤، ٢٥، ٣١، ٢٧٠، ٢٨١، ٣١٦.

١٧-التطور الاقتصادي في اوربا والعالم، ل ٢٩١.

١٨- د. جەمال رەشید، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٨.

سەرچاوەکان بە کوردی:

١- د. ئەو رەحمان حاجی مارف، بنچینەی دانانی فەرهەنگی کوردی- عەرەبی، پەروەردەو زانست، ژمارە (٦) سالّی (٣)، بەغدا ١٩٧٣، ل٥٧- ٨٤.

٢- ئەنوەر طاهر بکر، گرنگی زمان لە ژیاندا، پەروەردەو زانست، ژمارە ٩، سالّی/٤ بەغدا ١٩٧٥، ل٩- ١٠.

٣- د. جەمال رەشید، لێکۆڵینەوەی زمانەوانی دەربارەی مێژووی وڵاتی کوردەواری، بەغدا ١٩٨٨.

٤- د. خلیل ابراهیم حماش، اللغە والحضارە، الاقلام، عدد (٦)، ٩٧٥، ل٤٨.

٥- زبیر بلال اسماعیل، مێژووی زمانی کوردی، وەرگێڕانی کوردی، یوسف رؤوف علی، بەغدا، ١٩٨٤.

٦- غازی فاتح وەیس، روناکبیری لە کتێبی زمانی نەتەوایەتی کوردی،

رۆشنبیری نوێ، ژماره ۱۱۱، بەغدا ۱۹۸٦، ل٢٠٥- ٢١٨.

٧- محمدی ملا کریم و کەمال جلال غریب، هەڵبژاردنی زاراوەی کوردی، پەروەردەو زانست ژماره ٦، بەغدا، ۱۹۷۳، ل٢٩- ٥٦.

٨- د. نەسرین فەخری، پەرەسەندنی مێژوویی واتای وشەو دەوری لە دەوڵەمەند کردنی زماندا، رۆشنبیری نوێ، ژماره ۱۲٦، بەغدا ۱۹۹۰.

٩- د. نەسرین فەخری، رێبازی بە کوردی کردنی زاراوە، رۆشنبیری نوێ، ژماره ۱۱٤، بەغدا ۱۹۸۷، ل۱۲۳- ۱۳٦.

۱۰- د. وریا عمر امین، بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، رۆشنبیری نوێ، ژماره ۱۲۱، بەغدا ۱۹۸۹، ل۷۲- ۷٦.

سەرچاوە بەعەرەبی:

١١- د. ابراهيم السامرائي، التطور اللغوي التاريخي، بيروت ١٩٨١.

١٢- د. ابراهيم السامرائي، العربية بين امهها وحاضرها، دار الحرية للطباعة بغداد ١٩٧٨.

١٣- د. ابراهيم السامرائي، العربية تواجه العصر، الموسوعة الصغيرة، دار الجاحظ بغداد، ١٩٨٢.

١٤- التطور الاقتصادي في اوربا والعالم محمد عبدالله عجمي، دار النهضة العربية بيروت ١٩٨٣.

١٥- د. جمعة سيد يوسف، سيكولوجية اللغة المرض العقلي، سلسلة كتب شهرية، الكويت ١٩٩٠.

١٦- طه باقر، من تراثنا اللغوي القديم، سمي في العربية بالدخيل، مطبعة المجمع العراقي بغداد/ ١٩٨٠.

١٧- عبد العزيز بن عبدالله، تطور الفكر واللغة، دار لسان العرب، لبنان.

١٨- الدكتور علي عبدالواحد وافي، اللغة والمجتمع، دار احياء الكتب الرسمية حصرط ٢١.

١٩- فواد حمه خورشيد، اللغة الكردية، التوزيع الجغرافي للهجاتها، مطبعة الوسام، بغداد، ١٩٨٣.

٢٠- كتاب المورد، دراسات في اللغة، الطبعة الاولى بغداد ١٩٨٦.

٢١- د. مهندس حسن مرعي، المعاجم التكنلوجية التخصصية، الهندسة الزراعية.

٢٢-د. محمد احمد ابو الفرح، مقدمة لدراسة فن اللغة، دار النهضة العربية بيروت، ١٩٦٦.

٢٣- هيو برام ولش، الطفل والمجتمع ترجمة محمد باقر نويخ، دار الحرية للطباعة، كلية التربية جامعة بغداد، ١٩٩٠.

# کاریگەری بزووتنەوەی کوردو فراوانبوونی فەرهەنگی وشەی زمانی کوردی

زمـان وەکـو دیاردەیەکی کـۆمـەڵایەتی، هۆیەکـە بۆ تێگەیشتن، بۆ دەربڕینی هەست و نەست و بیروباوەڕ، واتە زمان دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندی، ئەم پەیوەندییەش، بەدەوری خۆیدا، کۆمەڵ پێکدەهێنێت، واتە کۆمەڵی مرۆڤایەتی بەبێ زمان دروست نابێت، مرۆڤیش بەبێ زمان نابێت و ژیانیش بێ زمان هیچ دەبێت و لە ئاستێکی راوەستاو دەبێت، مـرۆڤ وزەو توانای بیـرکـردنەوەی نامـێنێت( ۱ ) ، ئەگـەریش یەکێک لە کـۆمـەڵ دوور بخـرێتـەوە بۆچۆڵی، لەناو ئاوەدانیدا نەژیت وەکو ئاژەڵ هەڵس وکەوت دەکات.

بەمە دەردەکەوێت، زمان دیاردەو هۆیەکی گرنگی ژیانی مرۆڤەو، بەشێکە لە شارستانییەت و شارستانییەت بەبێ زمان نابێت و پێش ناکەوێت، زمانیش بەبێ شـارسـتـانییـەت هیچ گـەشـەو گۆڕان ناگرێتە خۆی، بۆیە بەهۆی گـۆڕانی لایەنەکانی ژیانەوە، دەگۆڕێت و فەرهەنگی وشەکانی، بەم پێیە فراوان دەبێت، ئەم لایەنانەی کـە دەبنە هۆی فـراوانبـوونی وشـەی زمـان زۆرن، وەک: هۆی کۆمەڵایەتی و شارستانێتیی نەتەوەو لایەنە جۆراوجۆرەکانی ئەم شارستانیەتە، هۆی کـاریگەری ئەدەبیـات و پێـشکەوتنی رۆشنبیـری، کـارتێکردنی زمـانێک بەسەر زمانێکی ترەوە، هۆی زمانەوانی، هۆی ئابووری ( ۲ ) ، هۆی رامیاری.

ئەم هۆیانە، دەبنە هۆی گـەشـەکـردن و پێـشکەوتنی زمـان، بێگومـان

پێویستییەکانی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵ، لەگەڵ پێشکەوتن و گۆڕانی کۆمەڵدا، دەگۆڕێت و زیاد دەکات و پێویستی تازەی ژیانی کۆمەڵ لەگەشەو گۆڕانیدا دێتە کایەوە، ئەو پێویستییانە، پێویستییان بەزمانی دەربڕین هەیە، واتە زمانێک دەبێت لەگەڵ ئەو گۆڕان و پێشکەوتنەدا بگونجێت. واتە زمانی زیندوو ڕەسەن، دەبێت زمانی سەردەم بێت و، بتوانێت، پێویستییەکانی سەردەم، لە داهات و داهێنانی تازەی تەکنۆلۆژیاو زانستی جۆربەجۆر دەربڕێت و زمانی زانست و کۆمەڵ بێت.

لێرەوە ژیانی مرۆڤ لەو گۆڕانەدا، هەندێک پێویستی و شتی کۆن، کەمتر بەکار دەهێنێت و، وردە وردە، پێویستی پێیان نامێنێت وشەو ناوەکانیانیش کەمتر لە زمانی ژیانی ڕۆژانەدا بەکاردەهێنرێت، لێرەوە پێویستی تازەی ژیانی کۆمەڵ وشەو ناوی تازەو نوێیاو، دەهێنێتە کایەوەو ئەم وشەو زاراوە نوێیانە دێنە ناو فەرهەنگی زمانەکەیەوە، وشەکانی زیاتر دەکەن و فەرهەنگی وشەکانی فراوانتر دەبێت، ئەم وشەو زاراوانە سەر بەو لایەنانەن، کە لەسەرەوە، هێمامان بۆ کرد، کە دەبنە هۆی فراوانبوون و زیادبوونی وشەی زمان.

یەکێک لەو لایەنانەی سەرەوە، لایەنی رامیارییە کە دەبێتە هۆی فراوانبوونی فەرهەنگی زمان، ئێمە لێرەدا، لەم لێکۆڵینەوەیە لەناو ئەم هۆیەدا هۆیەک دەبینین کە ئاوێتەی، ئەم لایەنەی رامیاری بووەو بۆ کۆمەڵگای کوردەواری، لەشێوەی بزووتنەوەی خەباتی کوردایەتی و شۆڕشەکەیدا، خۆی نواندووەو، کاریگەری بەسەر زمانی کوردەوارییەوە دیارە.

ئێمە لێرەدا، باسی لێوە دەکەین، چونکە لایەنی شۆڕشی کورد کاریگەریی جیاجیا بەسەر زمانەکەیەوە جێهێشتووەو، پێوەی دیارە لەبەرئەوەی شۆڕشیش لەناو کۆمەڵ و میللەتدا پێویستی خۆی هەیە، ئەم پێویستییەش زمانی دەربڕینی خۆی دەبێت، فەرهەنگی وشەو زاراوەی سەربەخۆی دەهێنێتە کایەوەو لە زمانی

کۆمەڵەکەدا، رەنگ دەداتەوە، ئەم رەنگدانەوە لایەنی جۆربەجۆری، شۆڕشەکەی لەناو زمانی کوردەواریدا گرتۆتەوە. واتە شۆڕش و خەباتی کوردایەتی کە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە، کە سەرەتاکەی لە پەیدابوونی هەستی نەتەوایەتییەوە سەری هەڵداوە، ئەم پەیدابوون و سەرهەڵدانە، بەرە بەرە، لەشێوەی خەباتی رامیاری لە لایەک و، بەشێوەی بزووتنەوەی خەباتی چەکداری، لەلایەکی ترەوە، دەست پێکردووە، لەناو زمانەکەدا وشەو زاراوەو دەربڕینی تایبەت بەخۆی هاتۆتە کایەوە زمانەکەی دەوڵەمەند و فراوانتر کردووە.

بۆ نموونە شۆڕش و راپەڕینی شێخ عوبێدوڵلای نەهری، شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمرو شۆڕشی خۆیبوون (ئاگری داغ) بەسەرۆکایەتی ژەنەراڵ ئیحسان نوری پاشا، دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران و کۆماری کوردستان، شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦١، شۆڕشی نوێی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٧٦ەوە(٤) تاکو ئێستا بەدەیان و سەدان وشەو زاراوەی سەر بەژیان و، لایەنی ئەوشۆڕشانە هاتوونەتە ناو زمانی کوردییەوەو فەرهەنگەکەیان فراوان کردووە، لە بارەی لایەنی رامیاری، سەربازی و پێشمەرگایەتی، راگەیاندن و ئەدەبیاتی شۆڕش، دارایی و ئابووری... هتد

ئەم وشانە بەرێگای جۆربەجۆری زمانەوانی هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و، بەشێوەی پەیوەندی هەرەمی لەسەرەوە بۆ خوارەوە (سەرکردایەتی بۆ ناو میللەت) لەناو زمانەکەو خەڵکدا جێگیربووەو بڵاوبۆتەوە، وشەکانیش لە پەیدابوونیاندا سەربەم رێگایانەن:

١- رێگای دارشتن (الاشتقاق).

٢- رێگای لێکدان (الترکیب).

٣- رێگای داتاشین (النحت).

٤- رێگای وەرگێران (الترجمە).

٥- ڕێگای وەرگرتن (الاقتباس)

لەناو ئەم ڕێگایانەدا، بۆ وەرگرتنی وشەی لایەنی رامیاری و خەباتی چەکداری، بەپێی خاسیەتی زمانی کوردی، ڕێگای لێکدان و دارشتن، دەوری هەبووەو، لە زمانی بێگانەوەش ڕێگای وەرگرتن (الاقتباس) دەوری کاریگەری هەبووە، لە هاتنە کایەی وشەی سەر بەژیانی شۆڕش و رامیاری، ئەم وشانەش سەر بەلایەنی رامیاری، سەربازی، فەلسەفی و نەتەوایەتی، راگەیاندن و تارادەیەکیش لایەنی دارایی و ئەدەبیاتی گرتۆتەوە، مەبەستمان لە وشەی ئەدەبیاتی شۆڕشگێڕییە، ئەمجا بەپێی دیاریکردنی ئەم لایەنانەو، بەپێی پێویست ئاوڕ لە نموونەی وشەکانی سەر بەشۆڕشی کوردەواری دەدەینەوەو، لە شوێنی خۆیاندا، دەیانخەینەڕوو.

ئەم وشانەش، بەزۆری، بەپێی پەیوەندییەکی هەرەمی، لەسەرکردایەتی شۆڕشەکەوە، هاتۆتە خوارەوە، کۆمەڵی کوردەواری و، دەزگا جیاجیاکانی شۆڕشەکە بەکاریان هێناوەو، پاش ماوەیەک لە زمانەکەماندا، چەسپاون و بوونەتە وشەیەکی سەر بەزمان و فەرهەنگی وشەکانی و نموونەی وشە بێگانەکانیش، کەوتوونەتە ژێر رکێفی ئاواز دەربڕینی دەنگسازی، کوردییەوە وەکو دیموکراتی، کادیر، کۆماندۆ، دکتاتۆر، دکتاتۆرییەت، پەرلەمان، پەرلەمانتار، سکرتێر، مەکتەبی سیاسی، فاشیزم، فاشییەت، ئۆتۆنۆمی، فیدرالی، عمیل، عنصری، جینۆساید... هتد.

لێرەوە نموونەی بۆ ڕێگاکانی پەیدابوون و فراوانبوونی وشەی کوردی دەهێنینەوە:

ڕێگای دارشتن (٥): ڕێگایەکە لە وشەو کەرەسەیەکی سەربەخۆی زمانی کوردییەوە، بەیارمەتی پێشگرو پاشگری زمانی کوردی دەتوانرێت دابڕێژرێت، یا دەیان وشەی سەر بەلایەنی شۆڕشی کوردەواری پەیدا بووەو هاتۆتە ناو زمانی

کوردییەوە، وەک ئەم یاسایە.

وشە/ کەرەسەو مۆرفیمی سەربەخۆ + پاشگر = وشەی دارێژراو.

(رەگی چاوگ) نوێن = ەر ـــ نوێنەر، کارامە، کۆمیتە، ناوچە، دەستە، بارەگا.

پێشگر + وشە/ کەرەسەی سەربەخۆ = وشەی دارێژراو لێ + هاتوو ـــ لێهاتوو. راپەڕین، رامالین، بێتەل..

ئەمجار نموونەکانی وشەی ئەم رێگایە وەک: کوردایەتی، کۆمیتە، بەرە، خێلەکی، فرۆکە، نۆکەر، دەرەکی، سەرەکی، چۆنیەتی، چەندایەتی.

رێگای لێکدان: (الطریقە الترکیبیە) بەهۆی لێکدانی دوو مۆرفیمی یا دوو وشەی سەربەخۆوە، دەتوانرێ بەهۆی ئامرازی ناوگر یا بێ هۆی لێکدان، دەیان وشەی سەر بەبزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەیی و شۆڕشی گەلی کوردەوە، هاتۆتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، بەپێی ئەم دەستوورە.

١- وشە/ مۆرفیم + وشە/ مۆرفیمی تر بێ هۆ = وشەی لێکدراو.

وشەی لێکدراوی بێ هۆ

شۆڕش + گێڕ (رەگی چاوگە) = شۆڕشگێڕ، بنکە، دەست + وەشێن = دەست وەشێن.

رێ + باز = رێباز. زەحمەتکێش. فرە لایەن، زرێپۆش، سەرپەل، سەرلق، ئەندام پۆل، پەیامنێر، ئاگربەست، سەرباز.

٢- وشەی لێکدراو، بەهۆی ئامرازی بەستنی ناوگرەوە:

وشە / مۆرفیم + ئامرازی بەستنی (ناوگر) + وشە/ مۆرفیم = زەبر + و + زەنگ = زەبروزەنگ.

دەس + بە + سەر = دەسبەسەر، دەربەدەر.

رێگای وەرگێڕان، بەهۆی واتاو مەبەستی وشەی بێگانەوە، لە حالەتی

نەبوونی وشەی خۆماڵی و رەسەنی کوردی، بەم رێگایە وشەی زۆر هاتۆتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە، وەک:

وشە / مۆرفیم + وشە / مۆرفیم = وشەی وەرگێڕدراو

شەڕ + ی + سارد = شەڕی سارد

بەر + ە + شەڕ = بەرەی شەڕ، دژە ئاسمانی

ژووری عەمەلیات، هێرشی سەربازی، ئەنجوومەنی نیشتمانی.. هتد

رێگای داتاشین لە دوو وشەی سەربەخۆ، یا زیاتر بەکرتانی هەندێک دەنگ و برگەی وشەوە، دەتوانرێت ژمارەیەک وشە دروست بکرێت، یا ژمارەیەک وشە هاتۆتە ناو زمانی کوردییەوە، کە سەر بەم رێگایەیە بەهۆی لێکدانەوەوە، وەک: کرێگرتە، پێشمەرگە، سەرکردایەتی، پارتیزانی، کۆچڕەو، داستانی تۆڵە...

رێگای وەرگرتن: ئەم رێگایە، لەوەرگرتنی وشەدا، زۆر فراوان و باوە، چونکە ئەو وشانەی، کە هاتوونەتە ناو زمانی کوردی و، بەهۆی پێویستی شۆڕشی کوردەوە، هاتوونەتە ناوەوە، لە زمانی بێگانەو ناوی زانستەکان و ناوی زمانی ولاتەکەوە، وەرگرتووەو، لە ئەنجامی نەبوونیدا دێنە ناو فەرهەنگی زمانەوە لەسەردەمی شۆڕشی کوردا بەدەیان وشە لەم بارەیەوە پەیدابوون، ناوی زانستەکانی و ناوی خاوەنیان هەڵگرتووە، کەسەر بەزمانی خاوەن زانستەکەو زاراوەکەن، وەک:

پارتی، دیموکراتی، لیبرالی، بەتالیۆن، مارکسیەت، دایلەکتیک، سۆشیالیزم، سۆشیالیستی، جەدەلیەت، جینۆساید، ناپاڵم، لینینی، بۆرجوازی پەرلەمان، فراکسیون، مۆبایل تەلەکس، کیلۆ هێرتس، کەناڵ، ئەنتەرنێت، مێگەوات، رەدیس، هەلی کۆپتەر، کلاشینکۆف، سەمینۆف، گرینۆف، ئیڤا، سەمتی، مدرعە، بەرمائی، کۆسمۆپۆلیتی، فیوداڵی، رجعی، تقدمی....تد.

بێجگە لەم رێگایانە سەرەوە، بەرێگای خواستن و خوازەشەوە (الاستعارە

والمجـاز) هەر لەناو زمـانی کـوردی خـۆیەوە، زۆر وشـەو زاراوەی کـوردی نویّ بۆ مـەبەست و بەکـارهێنانی تازە، لەناو شـۆڕشـەکـەو خـەڵکدا، بۆ ئەو سـەردەمـە تازەیە، بەکــارهاتـن و بڵاوبـوونـەوەو خــەڵکی پێی راهاتـن، وەک: (لەشکر) لەبنەڕەتدا بۆ ژمـارەیەکی زۆری خـەڵکە، وەکـو لەشکری بووک گـواسـتنەوە، بوو بەلەشکری سـەربازی و بۆ هێـزو سـوپای کـورد بەکـارهات. هەروەها وشـەکـانی، دەسـتــە، لق، پۆل، کـەرت، پەل، مـەڵبـەند، هێــز، بنکە، بارەگـا، هێـرش، سـەرلەشکر، رێکخـراو، ناوچە، شـانە، سـەرشـانە، پاراستن، کـۆبـوونەوە، رابەر سیـاسی (لەنێـوان کـردنی نێـوان دووکـەسـەوە، دەوترێت فـلان کەس رابەڕیانەو رابەرایەتیمان دەکا). زەبرو زەنگ (فـاشی)، کرێ گرتە لەئیشکەرەوە بۆ عـمیل سـیـخوڕ، نۆکەر، رزگـاری، لەخـەلاسـبـوون و نەجـاتبـوونەوە بۆ رزگـارکـردن واتە تحریر.. وشەی گەلی کوردستان لە هەشتاکانەوە بڵاوبۆوە، بەکاریگەری دروشم و شۆڕشی کوردستانەوە... هتد.

هەروەکـو وتمان، ئەم وشـانە لەلایەن رۆشنبـیـرانی سـەرکـردەی شـۆڕشـەکـەوە بەکاردەهاتن و، وردە وردە بەرێگای دەزگاو رێکخراوە جیاجیاکانی رێکخستنی رامـیـاری و سـەربازی و کـادیرەکـانی شـۆڕش و دەزگـای راگـەیاندنیـەوە، بەناو خەڵکدا بڵاوبوونەوەو لە زمانەکەدا بەکارهاتن وئاسایی بوون.

مــەســەلەی زمــان و بـایەخی زمــانـی نەتەوەیی، لای هەمــوو مــیللەت و شۆڕشێک، سەرنجی شۆڕشگێڕانی کارامەو کەسانی سیـاسی و سـەرکردەکانی راکشـاوەو، جێگـای بایەخ پێدانیان بووەو(٦)، لای سەرکـردایەتییە یەک لەدوا یەکـەکـانی شـۆڕشی نـەتەوەیی کـوردیش، هەر لە سـەرەتای پەیدابوونی هەسـتی نەتەوایەتی و دەسـتـپـێکردنی شـۆڕشـە رەواکـەیەوە، زمـانی کـوردی جـێگای بایەخـپـێـدان بووە، یەکـێک بووە، لـە بەرنامـەی شـۆڕشـەکـە، بەنـدێکی سـەرەکی مافەکانی کورد بووە، لە دوژمنانی داگیرکەر داواکراوە بایەخی پێبدرێت و، وەکو

زمانی میللەتی کورد، لە ناوچەکەی خۆیدا لەرەسمیاتدا بەکاربهێنرێت(٧) لێرەوە دەردەکەوێت کە شۆرشی نەتەوەیی، هەردەم دەیەوێت، کۆمەڵگای پڕ گیروگرفتی میللەتەکەی و، ناخۆشییەکانی بگۆڕێت و دیاردە ناهەموارو نالەبارەکانی ژیانی نەتەوە، لەڕەگ و ریشەوە بگۆڕێت، کۆمەڵێکی نوێ و ئاسوودە سەر لەنوێ بنیات بنێن، چونکە شۆڕش لوتکەی دەربڕین و داوای رەوای میللەت و مرۆڤایەتییە(٨) کە دەیەوێت ژیانە کۆنەکەی بنبڕ بکات و کۆتایی بەدیاردە ناهەموارو، ناخۆش و، دواکەوتووەکانی بهێنێت، یەکێک لەم داوا رەوایانەش بایەخ پێدانی زمانی نەتەوەییەو خوێندن بەزمانی کوردی، داواکاری هەمیشەیی شۆڕش بووە، مافی بەرگری کردن و زمانی رەسمی بەکوردی بێت و، زمانەکە لەوشەی غەوارەو بێگانە پاک بکرێتەوە(٩).

زمانی کوردیش، بەر بایەخپێدانی رۆشنبیرانی کوردو شۆڕشەکەی کەوتووەو، بەپێی دەرفەت و بوار خزمەتی کراوەو زمانی راگەیاندن و ئەدەبیات و شۆڕشەکە بووە. زمانی کوردیش توانیویتی، وەکو زمانێکی رەسەن و سیمای شارستانێتیی کورد دەربڕی زمانحاڵی سەردەم و پێویستییەکانی ژیان بێت و، لەگەڵ رەوتی پێشکەوتن و دنیای تەکنۆلۆژیادا بڕوات و زمانی کۆمەڵی کوردەواری و شۆڕشەکەی بێت، لە گەیاندنی زانست و زانیاری و پێویستییەکانی شۆڕش و رۆشنبیری، بۆیە دەتوانرێت زمانی کوردی بەزمانێکی رەسەن و زیندوو، بەزمانی سەردەم دابنرێت، کاریگەری شۆڕشی میللەتەکەی پێوە دیارە لە بواری وشەو دەربڕینی سەر بەژیان و قۆناغی شۆڕشەکەدا، چونکە توانیویتی زمانی کۆمەڵی کوردەواری بێت و لەگەڵ رەوتی گۆڕانەکانی کۆمەڵدا بێت.

داواکاری شۆڕشەکانی کورد، هەردەم مافی بەکارهێنانی زمانی کوردی، لە فەرمانگەو قوتابخانەکانی کوردستاندا ویستووەو، هەوڵی پێشخستنی

زمانەکەیان داوە. لەسەردەمی شێخ مەحموودی نەمردا بۆ یەکەمجار خوێندن لە قوتابخانەی ژێر دەسەلاتی ناوچەی حوکمدارێکەی بەکوردی دەست پێکراو لەم رووەوە بناغەیەک بۆ بەرەو چەسپاندنی زمانی یەکگرتووی کوردی دانراو، وردە وردە لەگەڵ گۆڕانی باری ژیانی سیاسی کوردستاندا، بەرەو گونجاوترو چاکتر، شێوەی کرمانجیی خواروو تائێستاش لەو سەردەمەوە کە ماوەی سێ چارەکە سەدەیە وەکو زمانێکی ئەدەبی لەبرەودایەو، زمانی خوێندن و نووسینە، لە راپەڕینی ساڵی ١٩٩١ەوەش، زمانی ناوەندی (مرکز) دەسەلاتی حوکومەتی هەرێم و دەزگا جیاجیاکانێتی، و چەندین کەناڵی تەلەفزیۆنی و رادیۆی جیاجیا بەکوردی پەخش دەکرێت و، بەدەیان گۆڤارو رۆژنامەو بلاوکراوەی حیزبی و رێکخراوی جەماوەری پێ بلاودەبێتەوە، وشەو زاراوەی ئەم سەردەمە نوێیەی، دوای راپەڕینی بەهاری ١٩٩١ی تێکەوتووەو زۆر وشەی کوردی تریش، بۆتە زاراوەی ناو دەزگا جیاجیاکانی ئەم سەردەمە وەکو فیدراڵی، فاکس، بۆرسە، ئەنتەرنێت، فراکسیۆن، پەرلەمان، پەرلەمانتار، دۆلار، یەن، فرانک، سنوورداش، ئاودیو، دەزگای شەهید، ئاوارە، (بەواتای تازەی سیاسی)، عەولەمە(جیهانگیری) عەسکەرتاری،.. هتد.

لەکاتی شۆڕشی چەکداری و شاخدا، بەرێگای رادیۆی شۆڕشی کوردو کادیرانییەوە، کە وەکو رابەرێکی هەمیشەیی، هەواڵی شۆڕش و چالاکییەکانی، بە وشەو دەربڕینی کاریگەرو شۆڕشگێڕانە، دەگەیاندە ناو جەماوەری کورد، لەلادێ کاناو بەهۆی رادیۆوەش لە شاردا. لەمەوە، زۆر وشەو زاراوەو دەربڕینی ئەدەبی دەکەوتنە سەر زاری خەڵک و لە زمانەکەدا جێگیر دەبوون، خەڵکی لەکاتی خوتبەو هەواڵی چالاکیدا، دەبزواند(٩) وەکو: بووکی سەربەستی، لانکەی شێران، شەهیدانی سوور قەلاتی گەل، هورەی پۆلایین و لەبن نەهاتوو، گەلی ستەمدیدە، ئەمجارەش بەفرگری گرت، هەڵۆی بەرزەفڕ، دوژمن بەزێن،

هەڵۆ گیانبازەکانی شاخ، هەڵۆی گەرمیان، شێرە کوڕانی کوێستان، ورەی پۆلایین و لەبن نەهاتوو، هەڕوون بەهەڕوون، کەم ژیان و کەڵ ژیان، ئامێزی گەڵ، سەروەری و نەمری، کوڕانی شارو شاخ، بێهوودە دۆڕاو، دوژمنی بێ ورەو دۆڕاو، تۆپە تەیارە شکێنەکان، بووکی سەرکەوتن، دوژمن بەزێن، ئەلقە لەگوێ، سەربازی نەناسراو. هەڵۆی سوور، خۆ فرۆش... هتد.

ئەدەبی شۆڕشگێڕیش، وەکو خاسیەتێکی ئەدەبی بەرگری و تێکۆشان، دەیان وشەو دەربڕینی هەست بزوێن بەتایبەتی لەکات و سەردەمی وریابوونەوەی میللەت وراپەڕین وشۆڕشدا چونەتە ناو زمانەوەو، دەوری کاریگەرو راستەوخۆیان هەیە، لە فراوانبوون و زیادکردنی وشەی نوێی سەربەو سەردەمە، ئەمە لە شیعری کوردیدا بەئاسانی دەبینرێت، وەکو: دیواری کۆنکریت، دەرگای پۆلا، رێگای ئاسن، قەڵغانی گولله، ماری نەوسن، ئازادیخوا، شورەی پۆلاو بەرد، بووکی تازەی یەک شەوە، بووکی ئازادی، پەندی زەمانە، هەڵسن لەخەو، دایکی وەتەن، دڵی میللەت، سەرکەش، پەندی زەمانە، دەمی راپەڕین، سستی و پەستی، پیاوی بێگانە، وێرانە ماڵ، رووت و رەجاڵ، خۆفرۆشان، هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان، ئازایی و چالاکی و هەندێک پیشەو نازناوی پێشمەرگایەتی لە شۆڕشدا دەبنە هۆی هاتنە کایەی هەندێک وشەو گرێی سەر بەخاسیەتی ئازایی و دەبنە ناوو شۆرەت و بلاودەبنەوە(١٠)، بۆ نموونە: پۆلا بیکەی سی، رەحمان دۆشکە، مەلا کۆپتەر، عەلی برنەو، ئاراس بێتەل، پیرۆت تۆپچی...هتد.

دوای ئەم بوارە جیاجیایانەی کە دەبنە هۆی زیادبوون و فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی، بەزۆری لایەنی رامیاری لە شۆڕشی کوردا، لە بواری کاریگەری فەلسەفەی شۆڕشگێڕی و بیری نەتەوایەتی و ئایدیۆلۆژیاو رێبازی شۆڕشدا، بەدەیان وشەی بێگانەو خۆماڵی دێتە ناو زمانەوەو فەرهەنگی زمانی کوردیش

لەم بوارو بارەدا وشـەی زۆری وەرگـرتووەو بەکـارهێناوە، چی لەسـەردەمی شۆڕشەکەداو، چی لە دوای ئەو ماوەیەداو لە زمانی کوردیدا چەسپاوە، وەکو:

أ- وشەی بێگانە:

وشەی سیاسی و بواری رێکخستن و ئایدیۆلۆژیا، وەکو: مارکسیەت، ماوی، جیفارستی، فرە حیزبی، قومی، تقدمی، پێشکەوتوخواز، لینینتیەت، حەتمیەت، دایلەکتیک، پرانسیب، پرۆسە، کۆسمۆپۆلیتی مادی، میسالی، میسالیەت، ئۆتۆنۆمی، حوکمی زاتی، فاشیەت، فاشیزم، دیکتاتۆر، دیکتاتۆریەت، تاکتیک، ستراتیژ، ئینهزامی، رادیکالیی، ثوری، ئیشتراکی، سۆشیالیستی، دیموکراسی، کۆلۆنیال، جینۆسایدـ.. کۆمۆنیست، شیوعی، کۆنفدرالی، دیموکراتخوازان، سەندیکا، ئەرستۆکراتی، پەرلەمان، دیبلۆماس، سکرتێر... هتد.

ب- وشەی خۆماڵی (سیاسی و ئایدیۆلۆژیاو رێکخستن): کوردایەتی، سەرکردایەتی، کۆمیتەی ناوەندی، مەڵبەند، مافی مرۆڤ، مافپەروەر، رێکخستن، لق، ناوچە، رێکخراو، شانە، پۆل، رابەر سیاسی، رابەر، لیژنە، مەکتەبی سیاسی، رزگاریخوازی نیشتمانپەروەر، سیاسەتمەدار، بەرخۆدان، سەرهەڵدان، سەرخۆبوون، بزاڤ، سەرشانە، بەرە، رەگەزپەرست، کوردپەروەر، مافی مرۆڤ، پاراستن، رێباز، زەبرو زەنگ، وڵاتپارێز.... هەڤاڵ، هەڤاڵی سەرکردە، هاورێ، ئەنجوومەن، ئەنجوومەنی باڵا، ئەنجوومەنی گوندەکان، ئەنجومەنی شار.

وشە سەربازییەکان: مەکتەبی عەسکەری، پێشمەرگە، پارتیزان، هێز، لەشکر، سەرلەشکر، فەرماندەی سوپا، دەست وەشێن، تانک، دەبابە، لق، پەل، دەستە، سەرلق، سەرپەل، سەردەستە، فەرماندەی هێز، مەڵبەند، بەتالیۆن،

هەرێم، کۆماندۆ، مەفرەزە، رەبایە، هێرش، بنکە، هجوم، یاریدەدەر، چالاکی، گەریلا، دزە (تسلل)، کلاشینکۆف، سەمینۆف، ئارپیجی، بیکەیسی، سەمتی، فرۆکە، زیل، هەنتەر، مێک، سۆخۆی، گەمارۆ، بۆسە، کەمین، رەبایە، فەوج، لیوا، وحدە، معسکر، فیلق، فیرقە، کەتیبە، پاشەکشە، کۆپتەر، برێن، برنەو، تۆپخانە، جبەخانە، کشانەوە، سەرهەڵدان، بزاف، راپەرین، شۆرش، انسحاب، پاشەکشە، تۆپ، هاوەن، داگیرکەر، هێز چەکدار، راماڵین، بێسیم، بێتەل، مۆرس، جفرە، جیهاز، دەزگای عەسکەری، هۆکی تۆکی، زرێپۆش... هتد. سەرتیپ، کەرتی تیپ، بەرگری، مین، ئاگربەست، بەرەی شەڕ، شەڕکەر، دیل، دەسبەسەر، ناپاڵم، ساروخ، گرینۆف، نۆبەدار.

وشەکانی دەزگای راگەیاندن و پەیوەندی کردن: پروپاگەندە، فاکس، مۆبایل کەناڵ، رەدیس، ئینتەرنێت، بانگەواز، ئاگاداری، پەیامنێر، ریپۆرتاژ، گۆڤار، رۆژنامە، چاوپێکەوتن، شەپۆڵ، مێگەوات، مێگەهێرتس، رەدیس، شەپۆڵی کورت، کەناڵ.. هتد.

وشەکانی بواری رێکخستن: کۆبوونەوە، نهێنی، نهێنی پاراستن، پێشنیاز(پێشنیار)، تەنگ و چەڵەمە(گیروگرفت)، کۆنگرە، کۆنفرانس.

وشەکانی بواری دارایی: ئازوقە، یارمەتی، باج، سەرباج، گومرگ، داهات، داهاتی ساڵانە، دەرماڵە، بازگەی گومرگی، فرۆشگا، فرۆشگای شۆرش، دارایی، باجی داهات.

بەهۆی شۆرشی کوردەوە، هەندێک وشەی کورتکراو پێی دەوترێت وشەی ئەکرۆنۆمی Acronomi کەلەپیت و برگەی یەکەمی هەر وشەیەک تە بۆ ناونانی رێکخراو یا حیزب بەکاردێت بۆ سووکی کورت دەکرێتەوە، وەکو وشەیەکی واتادار لەناو زماندا بەکاردەهێنرێت، کە خۆی لە بنەرەتدا هێمای ناوە گەورەکەیە، کە لەچەند وشەیەک پێکدێت و وشەیەکی نوێی لێ دادەرێژرێت.

وەکو: پ د ک، ی ن ک، حشع، پاسۆک، حسک، PKK، ناتۆ، سەنتۆ، نیاتۆ، (ناوی بەرەو هاوپەیمانی چەند دەوڵەتێکن کە ئەندامی ئەو ڕێکخراوە یا بەرەیەن)، یونسکۆ، یونیسێف، فاو، (FAW)،کرا (KRA)،... هتد ئەم وشانە بریتییە لەپەیرەوکردنی ئەلف و بێیەکی جیهانی، کورتکراوەکەی (IPA)واتە: (International-Phonetic-Alphabet) پێڕەوێکە، لە داڕێشتنی وشەدا پیتی یا (دەنگی) یەکەمی ریزە وشەیەک وەردەگیرێت و، وشەیەکی نوێی لێ دادەڕێژرێت. یاخود فەلەک (واتە: فەرماندەی لەشکری کوردستان)، س ش ک (سوپای شۆڕشگێری کوردستان)، ل ش ک (لەشکری شۆڕشگێری کوردستان). (UN) (یوئێن).

لە دوای راپەڕینی گەلی کوردی کوردستانی باشوور، لە بەهاری، ١٩٩١ هەندێک وشەی تر هاتنە ناوەوەی زمانی کوردی و چەسپان وەک: کۆچڕەو، فیدراڵی، پەرلەمان، فراکسیۆن، پرۆڤاید کۆمفۆرد، هێڵی دژە فڕین، خەتی ٣٦، هێزی چاکوج، خەتی هاملتۆن، خێرخواز، فریاگوزار (وەکو زاراوەو وشەیەک بۆ ڕێکخراوەکانی نێو دەوڵەتی)ن شیلتەر، لێرەوە دوای پیشاندانی نموونەی وشە جۆربەجۆرەکانی سەردەمی شۆڕشی کورد دەردەکەوێت، کە زمانی کوردی توانیویێتی زمانی کۆمەڵەکەی بێت و لە ئاستی گۆڕانەکان و زمانحاڵی سەردەم بێت، بۆیە دەتوانین بڵێین: زمانێک لەگەڵ رەوتی زەماندا بێت و بتوانێ پێویستییەکانی تازەی ژیان و ئاسۆ فراوانەکەی دەربڕێت، مانای وایە زمانەکە ماوەو نەمردووەو(١٠) لەگەڵ رەوتی کۆمەڵەو گۆڕانەکانیدا هاوشانە.

دوای ئەوەی لایەنە جیاجیاکانی کارتێکردنی شۆڕشی کوردمان کە بریتییە لەکاریگەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد، بەسەر زمانی کوردییەوە، دیارو دەستنیشان کردو نموونەی پێویست و جیاوازمان بۆ هێنایەوە، پێویستە تایبەتێتی زمانی شۆڕش و شۆڕشگێری لەبیر نەکەین و لەم رووەوە، چەند

تایبەتییەک دەخەینەڕوو.

١- زمانێکی بزوێنەر بێت وببێتە هۆی بزواندنی کۆمەلانی خەلکی جیاجیای کوردەواری، بۆ کۆکردنەوەیان لە دەوری شۆڕشەکە، زمانی کوردی سەردەمی شۆڕشەکەی ئاوێتەی ئەم شێوازە بووە.

٢- وشەو دەربڕینەکانی بریتییە لە گیانی بەرگری و بەرخودان و هاندان بەرەو قوربانیدان و وروژاندنی خەلک، بەشێوەیەکی کاریگەر.

٣- بەشێوازێکی وا بێت کە هەستی نەتەوەیی و هۆشیار کردنەوەی تێدا بێت.

٤- شێوازێکی کوردانەی خۆمالی بێت.

٥- پاک و بژار کرابێت لەوشەی بگانەو نامۆو ناکوردی.

٦- لە حالەتی نەبووندا وشەی بێگانەی گونجاو بەکاربهێنرێت و لە دەنگسازی کوردییەوە نزیک بێت و دەربڕینێکی خۆمالی هەبێت.

دوا شت پێویستە بوترێت ئەم لێکۆلینەوەیە، کە بەناونیشانی کاریگەری بزووتنەوەی کوردو فراوانبوونی فەرهەنگی وشەی زمانی کوردییە، یا شۆڕشی کوردو فراوانبوونی وشەی زمانی کوردییە، ئەم لایەنە لەناو یەکێک لەو لایانەنانەوە کاردەکاتە سەرگەشەی زمان و فراوانبوونی وشەکانی دەشێ پێی بوترێت لایەنی سیاسی و شۆڕشگێڕی، چونکە بەگشتی هەموو زمانێک بەهۆی ئەم خالانەی خوارەوەش فەرهەنگی وشەکانی فراوان و زیاد(١١) دەکات:

١- هۆی کۆمەلایەتی لەشارستانێتی نەتەوەدا، وەکو خوورەوشت، دیاردەی فەلسەفی و هۆشمەندی و چالاکیی کۆمەلایەتی.

٢- کارتێکردنی زمانێک بەسەر زمانێکی ترەوە، بەهۆی ئەدەبیات و بیروباوەڕ.

٣- کاریگەری بەرهەمی شاعیران و نووسەرانی بەهێز.

٤- هۆی زمانەوانی.

٥- هۆی ئابووری.

٦- هۆی ئایینی.

٧- هۆی رامیاری و شۆڕش و هەستی نەتەوایەتی (ئەم هۆیە هەندێک جار بۆ میللەتی ژێر دەسەلاتی سیاسی میللەت تر بەپێچەوانەوە دەبێتە هۆی لاوازی زمانی دووەم و قەدەغەکردنی وەکو زمانی کوردی لە باکووری کوردستان کە لە بیستەکانەوە تاکو ئێستا بەفەرمافێکی رەگەزپەرستانە قەدەغەکراوە.

ئەنجامی لێکۆڵینەوە.

١- شۆڕشی نەتەوەیی کاردەکاتە سەر فراوانبوونی و زیادبوونی فەرهەنگی وشەی زمانی نەتەوەکەی.

٢- شۆڕشی نەتەوەیی، زمان لەوشەی بێگانە بژار دەکات و وشەی پەتی و خۆماڵی بەکاردەهێنرێت و لە زیادبووندا دەبێت.

٣- وشەو زاراوەو دەربڕینی تازە، سەر بەشۆڕشەکە، لەناو زمانەکەوە، بەهۆی رێگا جیاجیاکانی دروستبوونی وشەو، بەرێگای وەرگرتنی وشەی بێگانەوە دێنە کایەوەو سەرهەڵدەدەن.

٤- وشەکانی سەر بەشۆڕشەکە بەزۆری لایەنی سیاسی و رێکخستن و سیاسی و سەربازی دەگرێتەوە، لایەنەکانی تر کەمترن.

٥- ئەدەب و شیعری شۆڕشگێڕی و بەرگری لەناو شۆڕشەکەوە، هۆیەکی یارمەتیدەرن بۆ هێنانە کایەی وشەو دەربڕینی تازەو نوێ.

٦- بوونی حیزبی جیاواز بۆتە هۆی پەیدابوونی وشەو زاراوەی جیاواز لەبواری سیاسی و رێکخستن و سەربازیدا وەکو کوردستان.

## پەراوێزو سەرچاوەکان:

١- د. ئەورەحمانی حاجی مارف، چەند کێشەیەکی زمانناسی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژمارە (١١)ن بەغدا، ١٩٨٦، ل٢٥.

٢- رەفیق شوانی، گۆڕانی باری ئابووری و فراوانبوونی وشەی زمانی کوردی، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٢)، ١٩٩٣، ل٦٨-٨٠.

٣- ئەم دیاردەیە لای میللەتی ژێر دەست بەهۆی سیاسەتی رەگەزپەرستی میللەتی دەسەڵاتدارەوە، دەبێتە هۆی لاوازی و قەدەغەکردنی زمانەکەیەوە، بەڵام شۆڕشەکەی هەوڵی پووچەڵ کردنەوەی ئەم سیاسەت دەدات.

٤- رۆژنامەو گۆڤارو ئەدەبیاتی ئەو شۆڕشانە، هەندێکیان بوونە هۆی پەیدابوون و بەکارهێنانی وشەی نوێیاو. چونکە گۆڤارو رۆژنامەی سەربەخۆیان هەبوو، بۆ نموونە وەک: رۆژنامەی کوردستان (ئێران)، هەڵاڵە، نیشتمان، رۆژی کوردستان...هتد.

٥- زمانی کوردی زمانێکی لێکدراوە، چونکە زۆربەی وشەکانی بەهۆی ئەم رێگایەوە پێکدەهێنرێت و رێگای (داڕشتن)یش بەپلەی دووەم دێت.

٦- ابن خلدون ساطع الحصري، في اللغة والادب وعلاقتهما بالقومية، سلسلة التراث القومي، ، مركز دراسات الوحدة العربية، ١٩٨٥، ص٤٢.

٧- بڕوانە داواکارییەکانی شۆڕشی شێخ مەحموودی نەمرو زۆربەی رێکخراوو کۆمەڵە کوردییەکان و شۆڕشەکانی تری کوردو بەیاننامەی (١١) ئاداری ١٩٧٠ی شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١ و رێککەوتنەکەی لەگەڵ دەوڵەتدا.

٨- هادي نعمان الهيتي، الاتصال والتغير الثقافي الموسوعة الصغيرة (٢٣) بغداد ١٩٧٨، ص١٠٧.

٩- ابن خلدون ساطع الحصري، هەمان سەرچاوە ص١٢٧.
١٠- ابن خلدون ساطع الحصري، هەمان سەرچاوە ص١٢٤.
١١- بڕوانە:أ/ د. ابراهيم السامرائي، اللغة والحضارة، بيروت، ١٩٧٧، ص
ب- د. علي عبدالواحد وافي اللغة والمجتمع ١٩٧٢ /ص٩.
١٢- د.عائشة عبدالرحمن (بنت الشاطي) لغتنا والحياة، مصر ١٩٧١، ص٨٠.

**تێبینی:** نموونەکانی نێو ئەم باسە لەسەرچاوەوە وەرم نەگرتووە، خۆم بەهۆی بەهاوچەرخی شۆڕشی کوردەوە، کە لەناو خەڵکدا باوەو هەندێکی لەمەوپێشەوە بەکاردەهات هێناومەتەوە، بەپێی بواری بەکارهێنانەکەی جۆن جۆن (تصنیف)داماناون.

# هۆی پەیدابوونی زارو سەرهەڵدانی زمانی نەتەوەیی

## پوختە

زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لە ئەنجامی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ و زیاد بوونیدا، زمان دەگۆڕێت و سنووری بەکارهێنانی بەربڵاوو فراوان دەبێت و، بەملاو بەملای شوێنەکەیدا پەل دەهاوێت و گەشە دەکات.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، هۆیە تایبەتییەکانی دروست بوونی زارو شێوەزاری زمانی کوردی دەخاتە پێش چاو، وەک هۆی جوگرافی و جیاوازی سروشتی ئاڵۆزی کوردستان و شێوەی ئەدەبی جیا جیاو جیاوازی کۆمەڵایەتی و... هتد، بەڵام باری ئاڵۆزی سیاسی کوردستان، وەکو وڵاتێکی دابەشکراو و لێکدابڕاو، بێگومان هۆیەکانی پەیدابوونی زار لەناو زمانی کوردیدا، زیاتر ئاڵۆزتر دەکات. بەهەمان شێوە لێکۆڵینەوەکە لە هۆی گۆڕانی یەک لە زاراوەکانی زمانی کوردی بۆ زمانی نەتەوەیی (زمانی نووسین - زمانی یەکگرتوو)دەدوێت.

## پێشەکی

زمان دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، لە ئەنجامی گۆڕان و پێشکەوتنی کۆمەڵ و زیادبوونیدا، زمان دەگۆڕێت و سنووری بەکارهێنانی بەربڵاو فراوان دەبێت و بەملاو بەملای شوێنەکەیدا پەل دەهاوێت و گەشە دەکات.

زمان بریتییە لە چالاکی بیری مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا، بیری مرۆڤیش لە یەکتر جیاوازەو زمانیش رەنگدانەوەی بیری مرۆڤە. بۆیە جیاوازی تێدەکەویت(١).

ئەمە سەرەتایەکە، بۆ جیاوازی دەربڕین و قسەکردن، لەمەوە زار پەیدا دەبێت، زاریش بریتییە لە شێوەی جیاوازی قسەکردن، لە مرۆڤێکەوە بۆ مرڤێکی تر، لە سەرەتاوە بەجیاوازی دەربڕین و گۆکردنی دەنگەکان و وشەکان دەست پێدەکات و لەگەڵ بڵاوبوونەوەو فراوانبوونی سنووری بەکارهێنانی زمانەکە، گەشە دەستێنێت و لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر، جیاوازی دەربڕینی دەنگێک وەکو وشەی (ماڵ) لە سلێمانی و کەرکووک لە زاری سۆرانی دەبێتە (مار) و لە بادیناندا (مال) دەنوێنی. یا وشەی (چێشت - شیو - ئاش) لە سلێمانی و سۆران و کەرکووکدا، ئەمە گەورە دەبێتەوەو ناوچەیەکی جیاوازی قسەکردن دەگرێتەوەو دەبێتە زار لەناو زماندا. پێی دەوترێت (زاری ناوچەی - Dialects Locaux)(٢).

ئەمجا بەربڵاوی و فراوانبوونی ناوچەی زمان، دەبێتە هۆی پەیدابوونی زار، بەڵام بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ رێگا بۆ هۆی تر خۆشدەکات، کە راستەوخۆ دەبنە هۆی پەیدابوونی زار لەناو زماندا کە ئەمانەن:

١- هۆی کۆمەڵایەتی رامیاری(٣): پەیوەندە بەسەربەخۆیی ئەو ناوچانە لەیەکتر، کە زمانەکەی تێدا بڵاوبۆتەوە لاوازبوونی دەسەڵاتی ناوەندەکە کە پێکیانیوە بەستبوو، بەڵام فراوانبوونی دەوڵەتەکەو زۆربوونی ناوچەکانی و جیاوازی گەلەکانی ژێر دەسەڵاتەکەی، دەبێتە هۆی لاوازبوونی دەسەڵاتی مەڵبەندی دەوڵەتەکە بەسەر ناوچەکانی تریەوە، ئەم هۆیە، دەبێتە هۆی پارچەبوون و دابڕینی ناوچەکانی وڵاتەکە، لەیەکتری و دروستبوونی دەوڵەتی بچووک و سەربەخۆ لە یەکتر، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا دەبێتە جیابوونەوەی یەکێتی بیرو زمان لە یەکترو لەهەر ناوچەیەکی جیاوازی کارگێری، رێگا بۆ

پەیدابوونی زار خۆشدەکات.

٢- هۆی کۆمەلایەتی دەروونی ئەدەبی، بەهۆی دروستبوونی ناوچەی جیاوازەوە، کۆمەڵی بچووک لەناو کۆمەڵە گەورەکەدا پێکدێت، کە دانیشتوانی جیاوازی ئەو کۆمەڵە، دەبێتە هۆی جیابوونەوەی سیستەمی کۆمەلایەتی و داب و نەریت و خووڕەوشت و رادەی جیاوازی رۆشنبیری و بیرکردنەوەی جیاواز لەناو ئەو کۆمەڵەوە دێتە کایەوە، ئەم جیاوازییانە لە دەربڕین و ئاخاوتندا رەنگە داتەوەو زار لەناو زمانەکەدا پەیدا دەکات.

ئەگەر لە بارەی زمانی کوردییەوە بەفراوانی سەیری(٤) ئەم هۆیە بکەین و ولات و کۆمەڵی گەورەی کوردستان بەنموونە بهێنینەوە، ئەوا بەهۆی دابڕینی کوردستانەوە بۆ چوار بەش، سیستەمی جیاوازی کۆمەلایەتی، لەهەر پارچەیەکیدا دروستبووە، کە بۆتە هۆی دەربڕینی ئەدەبی جیاوازو گەشەکردنی زاری سەرەکی، وەک: کرمانجی سەروو، کرمانجی ناوەڕاست، هەورامی، لوڕی، کەهەر شێوەیەکی ئەدەب و رۆشنبیری تایبەت بەخۆی هەیەو، لە زمانی کوردیدا بەشێوەی زاری جیاواز رەنگی داوەتەوە.

٣- هۆی جوگرافی کە لە جیاوازی سروشتی ناو ولاتدا، دەردەکەوێت و لەڕووی جیاوازی، کەش و ئاوو هەواو ژینگەو شێوەو شوێنی ولاتەکە خۆی دەنوێنی و، دەبێتە هۆی جیاکردنەوەی، هەر ناوچەیەک لەیەکتر، لە چیاو رووبارو دەریاو دەشت و گردۆلکاوی، کە جیاوازی دەخاتە ناو سروشتی ولاتەوە، ئەنجامەکەی جیاوازی و جیابوونەوە لەزماندا، دروست دەکات. لە کوردستاندا ئەم دیاردەیە تا رادەیەک دەوری بینیوە، ئەگەرچی رووباری کەمی تێدایە، بۆ نموونە ناوچەی جوگرافی نێوان هەردوو زێی گەورەو زێی بچووک کە شوێنی دەسەلات و پێکهێنانی میرنشینی (سۆران) بووە، زاری سۆرانی لە زمانی کوردی، شێوەی کرمانجی خواروو دروست کردووە.

٤- هۆی میللی کە لەناو دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکاندا دەردەکەوێت، وەک جیاوازی نێوان خەڵکەکە، لەڕووی تیرەو تایەفەو هۆزەوە، کە هەریەکی سەربەجۆرە تیرەیەکە جیاوازی نێوان خەڵکی ناوچەکە دەبێتە هۆی پەیدابوونی زار لەناو زماندا، لەم ڕووەوە دەتوانین ناوچەکانی پارێزگای کەرکووک بەنموونە بهێنینەوە کە چەندین تیرو هۆزی جیاوازی وەک: کاکەیی، شوان، زەنگنە، جاف، بەرزنجی تێدایەو سەر بەناوچەی جیاوازی پارێزگەکان، شێوەی ئاخاوتنی جیاوازیان هەیە، ئەم جیاوازییە، لە زاردا لە جیاوازی تیرەو هۆزو تایفەکانیانەوە پەیدابووە، کە هەر لە هەموویان لەناو زاری کەرکووک و گەرمیاندان زاری ناوچەییان پێک هێناوەو نووسەرەکانیان بەشێوەی کرمانجی خواروو دەنووسن(٥) و هەریەک لەم شێوەزارانە سەر بەناوچەیەکی بچووکی کارگێڕیشن لەناو سنووری پارێزگەکەدا(٦). لە بنەڕەتدا ئەم هۆزانە لە ئەنجامی کۆچکردنەوە هاتۆتە شوێنی ئێستایان.

٥- هۆی لەشی فزیۆلۆجی کە لەناو دانیشتوانی ناوچە جیاوازەکاندا، دەبێتە هۆی پێکهاتنی جیا، لە چۆنیەتی دروستبوونی ئەندامانی ئاخافتنی مرۆڤدا، کە ئەمە خۆی لە خۆیدا دەربڕینی جیاوازی قسەکردن پێکدەهێنێت و دەبێتە هۆی پەیدابوونی زاری جیاواز لە یەکتر(٧).

٦- تایبەتێتی کەسی و جیاوازی قسەکردن: تایبەتێتی و کەسایەتی مرۆڤ وادەکات، کە هەڵس وکەوتی مرۆڤێک جیاواز بێت لە هەڵس وکەوتی مرۆڤێکی تر، ئەم تایبەتییە لە قسەکردنیشدا دەردەکەوێت، ئەمە لە ژیانی ڕۆژانە بۆمان دەرکەوتووە، کە دەنگ و شێوازو قسەکردنی کەسێک، لە دەنگ و دەربڕین و شێوازو ئاخاوتنی کەسێکی تر جیاوازەو ئەم جیاوازییە لەکەسەوە، کەسێکی تر دەگرێتەوەو، پاشان خێزان و دێیەک و چەند دێ و ناوچە دەگرێتەوەو، شێوەزارێک پێکدەهێنێت. ئەم جیاوازییە لەگەڵ ناوچەیەکی تری زمانەکەدا، کە



**نەخشەی زاراوەکانی زمانی کوری**

پێوانە ( ٤٧٥٠٠٠٠ )

ئەویش زارێکی تری جیاوازی لێیە، نابێتە هۆی دوو زمان، چونکە خەڵکی هەردوو ناوچەکە، لە یەکتر دەگەن. بەپێچەوانەوە ئەگەر تێنەگەن لە یەکتر بەدرێژایی رۆژگار ئەو دوو زارە دەبنە دوو زمانی جیاواز، بەتایبەتی ئەگەر هۆیەکانی سەرەوە، هەموویان لەناوەندی زمانەکەدا هەبن.

٧- هۆی ئابووری دەورێکی گرنگ دەبینێت لە دەوڵەمەندکردنی زمان و گەشەکردنی زاردا، بەهۆی جیاوازی چالاکی و ئیش و کارو پیشەی جیاجیای خەڵک لەناو کۆمەڵدا، وەکو ئەوەی هەر جۆرە چین و توێژو تاقم و کۆمەڵە خەڵکێکی هاوکارو هاوپیشە، زارێکی تایبەتییان بۆ دروست دەبێت، کە هەر پیشەیەکی وشەو زاراوەو دەربڕینی تایبەت بەخۆی هەیەو زاری بچووک پەیدا دەکەن. وەک قسەکردنی شوان و جووتیار جیاوازە لەهی بازرگان و رۆشنبیران و کرێکاری شار. لەناو زمانی میللەت و وڵاتەکەدا، ئەگەر رادەی جیاوازی و زارەکە زۆر بێت ئەوە دیالێکت (Dialect) زاری گەورەی سەر بەهەرێمێک دروست دەبێت. ئەم هۆیانەی سەرەوە، هەر هەموویان، دەوری کاریگەر، لە دروست بوونی زارو شێوەزار لەناو زماندا دەبینن، زیاتر لەیەک دوو هۆیان لەناو وڵاتێکدا ئەو دەورە دەبینن، زۆربەی هۆیەکانی سەرەوە لەناو زمانی کوردیدا دەوری پەیدابوونی زارییان بینیوە وەک هۆی جوگرافی و جیاوازی سروشتی ئاڵۆزی کوردستان و شێوەی ئەدەبی جیا جیاو جیاوازی کۆمەڵایەتی و... هتد. بەڵام باری ئاڵۆزی سیاسی کوردستان وەکو وڵاتێکی دابەشکراوو لێکدابڕاو، بێگومان هۆیەکانی پەیدابوونی زار، لەناو زمانی کوردیدا زیاتر ئاڵۆزتر دەکات و هۆی تایبەت بەخۆی هەن، بێجگە لە هۆیە گشتیەکانی پەیدابوونی زار لەناو زمانی میللەتاندا، هۆی تر هەن وەک ئەمانەی خوارەوە، کە تایبەتی بەسەرهەڵدانی زار لەناو زمانی کوردیدا، بەهۆی نەبوونی دەوڵەتی کوردییەوەو نەبوونی قەوارەی سیاسی لە هەموو کوردستاندا(٨).

# هۆی پەیدابوون و گەشەکردنی

## زار لە زمانی کوردیدا

١- هۆی جوگرافی لە سەختی و ئاڵۆزی سروشتی کوردستان، کە وڵاتێکی شاخاوی چڕوپڕەو، نەبوونی ڕێگا و بانی چاک و زۆر، کە هەموو یا زۆربەی ناوچەکانی بەیەکتر ببەستێتەوە. بێجگە لە بەفرو بارانی زۆرو ڕێگا گیرانی ناوچەکانی کوردستان، بەوەی وەرزی زستان، نزیکەی شەش مانگێک دەخایەنێت، هاتووچۆ دەبڕێت و بەمە ناوچەی جیاوازی قسەکردن دروست دەبێت، بێجگە لەوەی کە لەناو ئەم دیاردەیەی ئاڵۆزی سروشتی کوردستانەدا،کە لە زۆر شوێنی تیرەو هۆزو خێڵی جیاواز جیاواز هەن و ئاخافتنیان لەیەکتر جیاوازە، چونکە هاتووچۆیان لەگەڵ تیرەو خێڵەکانی تردا زۆر کەمە، ئەمانە هۆی ڕاستەوخۆن بۆ پەیدابوونی زارو شێوەزار لەناو زمانی کوردی دایکدا. بۆ نموونە دێهاتی ناوچە شاخاوی وسەرسنوورییەکان، هاتووچۆیان زۆر کەم بووە لەگەڵ ناوچەو شارەکانی دەوری خۆیان، وەک دێهاتی شاخی قەندیل کە دابڕاون لە ناوچەکانی تر بەتایبەتی لەکون و وەرزی زستان و مانگی ڕێبەنداندا. ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە لەکوردستان بەزستانانی بەفراوی ڕێگا بەستراوە. باشترین نموونە زاری گۆرانییە/ هەورامییە کە لەزارە کوردییەکان زۆرتر دوور کەوتۆتەوە، چونکە هەورامان ناوچەیەکی شاخاوی و بەفراویترە بێجگە لە هۆی ئایینی.

٢- لەبەر ئەوەی زمان چالاکی مرۆڤە، چالاکییەکانی مرۆڤیش جیاوازن، بۆیە زمانیش وەکو رەنگدانەوەی بیری مرۆڤ جیاوازە لەیەکترو بەهۆی بەکارهێنانی جیاوازەوە، جیاوازی تێدەکەوێت، ئەم جیاوازییە یارمەتیدەرە بۆ سەرهەڵدانی زارە جیاوازەکانی زمان و ئاخافتنی جیاوازی مرۆڤ(٩). بۆ نموونە چالاکی ئەدەبی، سیاسی، زانستی......هتد.

٣- دەسەڵاتی ناوچەگەری و پەیدابوونی میرنشینە کوردییەکان، لە دوای نەمانی دەسەڵاتی دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلامەوە، چەند میرنشینی کوردی لەناو ناوچەو هەرێمە جیاوازەکانی کوردستان، لەلایەن میرو پاشاو دەسەڵاتداری کوردەوە، پێکهاتن و مەڵبەندی ئەم میرنشینانە، بۆوە هۆی گەشەسەندنی زاری ناوچەی میرنشینەکان. هۆیەکی تر، بۆ مانەوەی ئەو زارانە، کە لەناوچەکەی خۆی نەچێتە دەرەوە، بەردەوام نەبوونی میرنشینەکان و بیرنەکردنەوەی میرەکان لەپێکەوە لکاندنی ناوچەکانی تر بەسنووری خۆیانەوە، یا بەیەکگرتنیان لەگەڵ میرنشینەکانی تردا، تا رێگا خۆشکەربن بۆ پێکهاتنی دەوڵەت و سیاسەتێکی کوردیی بەردەوام، کە تیایدا زاری مەڵبەندەکە بەرەو زمانی نەتەوەیی هەنگاو بنێت، یا ئاکامیان روخاندن بوو بەهۆی بەرەنگاری و سیاسەتی دەوروبەری دەوڵەتی ئێران و عوسمانلییەوە، وەکو میرنشینی بۆتان، سۆران، لورستان، ئەردەلان، بابان، هەریەک لەو میرنشینانە بووە هۆی گەشەکردنی زارو بۆنیان بەزمانی ئەدەبی و پاشان بەهۆی رۆخانییانەوە کپبوونەتەوە وەکو زاری لوڕی لە لوڕستان لەسەدەی دەیەم و یانزەیەمی زایینی و کرمانجی سەروو لەنێوان سەدەی ١٥-١٧ز،و کرمانجی ناوەڕاست لەسەدەی نۆزدەهەمداو گۆران/ هەورامانی لەسەدەی چواردەهەمەوە پاشان تا سەدەی نۆزدەی زایین، هەریەک لەم زارانە دەوری زمانی ئەدەبی کوردییان بینیوە و ئەنجامەکەی بریتییە لە مانەوەی دوو زاری کرمانجی ناوەڕاست سەروو.

٤- بەکارهێنانی دوو زاری جیاواز، لە بواری رۆشنبیری و راگەیاندنی کوردیدا، وەکو ئێستگەو رادیۆو زمانی گۆڤارو رۆژنامەکان کە بە دوو زار دەردەچوون، بە تایبەتی لە باشووری کوردستاندا، کە بە دوو زار دەردەچوون و بڵاودەبوونەوە، ئەمە هۆیەکە تائێستاش بەردەوامەو، لە خزمەتی گەشەکردن و دوورکەوتنەوەی هەردوو زارە کوردییەکەدان و بەردەوامییەکەی دەبێتە هۆی جیابوونەوەو لێکدابڕانی ئەو دوو زاری زمانی کوردی، پاشان دابڕانی میللەتەکە لەیەکتر، ئەم دیاردەیە لە زمانی فەرەنسی و عەرەبیدا لەلایەن رۆشنبیرانەوە رەتکراوەتەوە بەتایبەتی لە سەدەی شانزەی سەردەمی وریابوونەوەدا (عصر النهضە) فەرەنسییەکان وازیان لەزاری ناوچەیی هێناو زمانی ئەدەبیان بەکارهێنا، هەروەها عەرەبەکان لە میسر لەسەردەمی ئەحمەد عورابیدا بانگەوازی نووسینیان بە شێوە زمانی ئەدەبی عەرەبی کردو، جاری ئەوەیاندا بەزمان گشتی (اللغة العامية) رۆژنامە بڵاو نەبێتەوە تا میللەت و زمان تووشی دابڕان نەبن(٩).

٥- هۆی دەمارگیری و هەرێمگیری و دوودڵی کورد خۆی رێگا خۆشکەر بووە، بۆ دوورکەوتنەوەو دابڕانی زارەکان لەیەکتر (١٠)، بەهۆی نەبوون یا بەردەوام نەبوونی رژێمێکی سیاسی کوردی و نەبوونی دەوڵەتی کوردییەوە، لە هەموو کوردستانی دابەشکراودا، ئەمە هۆیەکی راستەوخۆیە، بۆ گەشەکردنی زار لە زمانی کوردیداو لەگەڵ دوورکەوتنەوەی شێوەکانی لەیەکتر.

٦- هۆی دابڕانی پەیوەندی ئابووری و بازرگانی لە ئەنجامی دابەشکردنی کوردستاندا، یا نەبوونی یەکێتی ئابووری، وەک دابڕانی ناوچەی بادینان لە سۆران و هێشتنەوەی بادینان وەکو ناوچەیەکی کشتوکاڵی لە خزمەتی شاری موسڵ، بۆ سەرفکردنی کەلوپەلی پیشەسازی شاری موسڵ لەلایەن خەڵکی بادینانەوە، واتە دوورخستنەوەی بادینان لە پیشەسازی، ئەمە لەلایەک، لە

لایەکی ترەوە نەبوونی ڕێگایەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان ئەم دوو ناوچەیە (سۆران و بادینان)، تا چالاکی بازرگانی و هاتووچۆ لە نێوانیان خۆشبکات و زارەکانیان لەیەکتر نزیک بکاتەوەو زیاتر بەیەکتریانەوە ببەستێت، یا لەگەڵ هەر ناوچەیەکی تردا. بێجگە لەمەش نەبوونی دەریاو ڕووباری گەورە لە کوردستاندا، تا ببێتە هۆی پەیوەندی کردن و ببێتە مەڵبەندی کڕین و فرۆشتن و، زارەکەشی ببێتە زمانی بازرگانی و پەیوەندی تەشەنە بسەنێت، بەڵگەش بۆ ئەمە لە دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ەوە پەیوەندی نێوان سۆران و بادینان دەستی پێکردووە، برەوی بەخۆیەوە بینیوە خەڵکی هاتووچۆکەریش، ئێستا زیاتر لەجاران بەهۆی ئەم پەیوەندیەوەو هاتووچۆی نێوانیانەوە لەیەکتر دەگەن. بەهۆی ئەم دابڕانی ئابووریە، لەنێوان هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بێجگە لە هەوڵی بەردەوامی میری لەم ڕووەوە تا پتر لە یەکتریان دابڕێت وەک هەوڵی دامەزراندنی بەربەستی بەخمە بەمەبەستی دابڕانی سۆران و بادینان، بۆیە دەبینین کوردستان لەڕووی سیاسی و ئابووری و بازرگانی و ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتییەوە لەیەکتر دابڕاوەو، یەکێتی ئابووری لەنێوان هەموو بەشەکانیدا نابینرێت تا بیان بەستێتەوە بەیەکتر. ئا ئەم بارودۆخە، هۆی ڕاستەوخۆیە بۆپەیدابوونی زارو گەشەسەندنی لە زمانی کوردیدا.

٧- کارتێکردنی ڕۆشنبیریی نەتەوە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان، وەک هی (عارەب، تورک، فارس) بەسەر ڕۆشنبیری کوردییەوە، کە هۆیێکە بۆ پەیدابوونی کاریگەری ڕۆشنبیری میللەتی جیاجیا. بەسەر زمانەکەیەوە، ئەمە دەبێتە هۆی بوونی وشەو زاراوی جیا لەناویدا، کە ئەمە لە خزمەتی گەشەکردنی زاردایەو زیاتر گەشە بەزار دەدات، لەهەر بەشێکی کوردستاندا. بۆ نموونە (زاراوەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست) لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا بۆتە (خاوەر مەیانە) و لە باکووری وڵاتیشدا بۆتە (ڕۆژهەڵاتی ناڤین) هەروەها (موجتەمەع -

کۆمەڵ) لە بەشەکانی تری ولاتدا بۆتە (جامعە) و (جڤاک)، ئەمەو دەیان نموونەی تر. ئەمە بێجگە لەکارتێکردنی کەلتوورو داب و نەریتی میللەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، بەسەر کۆمەڵگای کوردەوە، وای لێهاتووە، لەهەر پارچەیەکی ولاتەکە رۆشنبیری ئەو میللەتانە بەسەر رۆشنبیری کوردیدا زاڵ بێت و بەرادەیەک کوردەکانی ئەم پارچانە، لەیەکتری جیا دەکرێنەوە، چ لە بواری ئاخافتن و چ لە بواری جل و بەرگ پۆشیندا، ئەم جیاوازییە بەسەر زمانی کوردی ئەم هەرێم و بەشانەوە بەئاسانی رەنگی داوەتەوەو لە خزمەتی دوورخستنەوەی زارە کوردیەکان و دابرانیانە لەیەکتر، تەنانەت لە سنوورەکاندا بەشێوەی (دیواری بەرلین) دوو خێزان لە دوو دێدا لەیەکتر دابراون.

٨- داگیرکەرانی کوردستان، هەریەکەی لە سنووری دەوڵەتەکەی خۆیدا، کە بەشێکی کوردستانی بەرکەوتووە، بەپێی بەرنامەی دارێژراو هەوڵی جێبەجێکردنی ئەوان کە کورد پێش نەکەوێت و، هەوڵی دابرانی میللەتەکەن، لە هەموو روویەکی ژیانەوە، یەکێک لەو کارانەیان کردنەوەی رادیۆی کوردی بوو، بەزارو شێوەزاری جیا جیای زمانی کوردی وەک رادیۆی مەریوان بەهەورامانی و لە مەهاباد بەموکریانی هەروەها لەسنەو شوێنەکانی تر، یا دەرکردنی دوو رۆژنامەی (ئاسۆ)و (برزاف) لە عێراقدا بەدوو شێوە تا زیاتر زارە کوردییەکان گەشە بسەنێت و، زمانی نەتەوەیی دوور بکەوێتەوەو پەیدا نەبێت، ئەمە سیاسەتی داگیرکەرانی کوردستان و، شای گۆڕبەگۆڕ بوو، کە زمانی کوردی بە لقێکی زمانی فارسی دادەنا.

٩- یەک نەخستن و یەک نەبوونی زاراوە کوردییەکان، لە بواری جیاجیای رۆشنبیری و زانست و زانیاریدا، لەم رووەوە چەند زاراوەی جیاجیا بۆ یەک مەبەست دانراوە، ئەمەش هۆیەکە بۆ گەشەکردنی زارو دوورخستنەوەیان لە یەکتر، بەتایبەتی ئەگەر دوو زار لە مەیدانی رۆشنبیریدا هەبێت، ئەگەرچی

یەکێکیان برەوی لەوی تر زیاترە لە مەیدانی دانان و رۆشنبیریدا.

١٠- بەکارهێنانی رێنووسی جۆربەجۆر لە نووسینی کوردیدا، وەک: ئەلف و بێی عارەبی و لاتینی تورکی و پیتی (سریلیک)ی روسی، ئەمە لە ئەنجامی دابەشکردنی کوردستانەوە سەری هەڵداوەو، بۆتە دوورخستنەوەی رۆشنبیرانی بەشەکانی کوردستان لە یەکتر و، شارەزانەبوونیان لە خوێندنەوەی ئەلف و بای یەکتری و، ئاگادارنەبوونیان لە بەرهەمی یەکتری و جارێکی تر ئەمە ئاستەنگێکی گەورە لە پەیدابوونی زمانی نەتەوەیی، بۆ گشت پارچەکانی کوردستان دروست دەکات و دەبێتە هۆی ئالۆزکردنی پەیوەندی نێوان زارە ئەدەبییەکانی زمانی کوردی.

ئەم هۆیانەی سەرەوە، بریتی بوون لە سەرهەڵدان و مانەوەی پەیدابوونی زارو گەشەکردن و دوور خستنەوەیان لەیەکتر بۆ هەموو زمانێک بەگشتی و، بۆ زمانی کوردی و پەیدابوونی زارەکانی و دابڕانیان لەیەکتری بەتایبەتی، خرانەڕوو.

ئەم هۆیانەی کە تایبەت بوون بەزارەکانی زمانی کوردی، لە ئەنجامی کارەساتە یەک لە دوای یەکەکانی کوردستانەوە، زیاتر سەریان هەڵداوە(١١) وەک روخاندنی دەوڵەتی کوردی میدی و هێرشی مەغۆلییەکان لە وێرانکردنی کوردستان. پاشان وڵاتی کوردستان، دوو جار دابەشکراوە لەلایەن دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستانەوە، یەکەمیان، لە ئەنجامی شەڕی چاڵدێرانەوە لەساڵی ١٥١٤ی ز کە لەنێوان دەوڵەتی سەفەوی ئێران و دەوڵەتی عوسمانلی، لە رۆژئاوای ئێران واتە لە کوردستان روویدا. کە ئەنجامەکەی بەهۆی پەیمانی زەهاوەوە لەساڵی ١٦٣٩ی ز کوردستان کرایە دوو بەشەوە، بەشێکی بۆ ئێران و بەشەکەی تری بۆ عوسمانییەکان، جارێکی تر بەشەکەی ژێر دەسەڵاتی عوسمانییەکان لە ئەنجامی شەڕی یەکەمی جیهاندا بەپێی رێکەوتننامەی (سایکس بیکۆ - ١٩١٦)و رێکەوتننامەی (سان ریمۆ - ١٩٢٠) کوردستانی

ژێر دەسەڵاتی عوسمانلی کرا بەسێ بەشەوە لەنێوان تورکیاو سوریاو عێراقدا. ئەم دابەشکردنەی کوردستان پتر دەردی کوردی لە هەموو رووبەکەوە ناخۆش و ئاڵۆزتر کرد، کۆمەڵی کوردو داب و نەریت و زمانی کوردی و رۆشنبیری نەتەوەکەی لە یەکتر دابڕی و، زیاتر زاری بەشەکانی کوردستانی لە یەکتر دابڕی و دوورخستنەوەو هیوای زمانی نەتەوەیی دوورکەوتەوە، کە تاکو ئێستا کورد پێوەی دەناڵێنێ و زمانی نەتەوەیی بۆ سەرانسەری کوردستان نابینرێت. وای لێهاتووە کە کوردی پارچەکانی کوردستان بەزەحمەت لە یەکتر بگەن و یان هەر نا، بەرەسمیش زمانی کوردی لە تورکیا بەتەواوی قەدەغە کراو، زمانی کوردی گۆڕان و پەرەسەندنی لە جیاتی بەرەو یەکبوون و رێکبوونەوە هەنگاو بنێت(١٢) و بەرەو جیابوونەوە و لێکدابڕان و پارچە پارچە بووە کوردیش لە تورکیادا بەتورکی شاخاوی و مرۆڤی پلەدوو دانراوە.

لێرەوە پێویستە ئاورێک لە شوێنی زارو پەیدابوونیانەوە بدەینەوە کە زارو شێوەزاری تیادا پەیدا بووە.

زارەکانی زمان، دەکەونە ناوچەی جیا جیاوە، جاری وا هەیە لە ناوچەیەکی کارگێڕی و جوگرافیدا زیاتر لە زارێک تا دووان و سیان بەدی دەکرێن و لە یەکتر جیاوازن، وەکو شێوەزارەکانی سنووری پارێزگای کەرکووک، لە زاری کاکەیی، زەنگەنە، شوانی کێشک، شێخانی، گەرمیانی. یان کوردی زازایی لە ناوچەی دەرسیمدا جیاوازە لە زارەکانی کرمانجی سەروو.

جاری وا هەیە، لە سنووری کارگێڕی ناوچەیەکدا (ناحیە)، دوو زار بەکاردێن وەکو: زاری شوانی کیشک، لەناو جەرگەی زارە گشتێکەی شواندایەو لە چەندە دێیەک بەکار دەهێنرێت یا پاشماوەی زاری سۆرانی وساڵەیی، لە ناوچەی سەر بەشارۆچکەی (پردێ) لەسەرووی رۆژئاوای شاری کەرکووک بەکار دەهێنرێت، زاری (دەربەندی) نزیک لە زاری کرمانشانی و لەکی کە لە باکووری لورستانە،

تەنها لە سێ دێی سەر بەناوچەی تەق تەقی تێکەڵ لە شێوەزاری شێخ بزێنی و زاری کۆیە لە پارێزگای هەولێر بەکار دێت(١٣).

ئەم دیاردەی پرش و بڵاوی زارەکانی زمان، لەوانەیە لە ئەنجامی گیروگرفتی کۆمەڵایەتی و ئابووری و دوژمنایەتی خێڵەکییەوە، لە ناوچەی بنەڕەتی نیشتەجێی خۆیانەوە، پەرەوازە بووبن، جاری واش هەیە دیاردەی کۆچکردن، یا بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و ژیانی کۆچەری و رەوەندایەتییەوە، یا لە ترسی دوژمن و داگیرکەران و ئاوارەییەوە، لە ناوچەی زاری تیرەو خێڵی ترەوە ئارامیان گرتووەو، نیشتەجێ بوونە. بۆ نموونە شێوەزاری (شوانی کیشک) پاشماوەی هۆزی گەورەی شوانکارەی ناوچەی لوڕستانن کەلەسەدەی پێنجەمی کۆچییەوە ئاوارەی دەستی دەوڵەتی سەفەوی بوونە(١٤).

ئەم دیاردەیەی سەرەوە، لە پەیدابوونی زارو پاشان سەرهەڵدانی شێوەزار، لەوەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، کە زمان وەکو دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، بەپێی سەردەم، لە گۆڕان و گەشەکردنی کۆمەڵدا دەگۆڕێت و زاری لێدەبێتەوە و هەریەکەی لەو زارانە جیاوازە لەویتر و، لەناو ئەو زارانەوەش زاری گشتی و ناوچەیی (مەبەست لە قسەی رۆژانەی خەڵک - اللهجة العامية المحلية) سەر هەڵدەدات، ئەوە دوای ئەوە گۆڕان بەسەریدا دێت(١٥)، گۆڕانەکەش، واتە گۆڕانی زمان بۆ زار، بەزۆری نابێتە هۆی گۆڕانی بنیات و پێکهاتنی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی - Morpholog) رستەسازی (Syntax) واتە رێزمانی زمان ناگۆڕێت، تەنها جیاوازییەکی کەم نەبێت لە سیستەمی پێکهاتنی رستەوە گۆڕانی بنیات و رێزمانی داڕشتن و، کۆو دیاردەی رەگەزو (نێرو مێ) وەسپ و (وصف) بچووک کردنەوەو نەسەب دەگرێتەوە(١٦)، بۆیە هەر هەوڵێکی تاکە کەسی بدرێت، بۆ دەرچوون لە سیستەمی زمانەوانی لە کۆمەڵگایەکی بەهێز، بۆ گۆڕانی زمانەکە بدرێت، بەرگرییەکی توندوتیژی لە دژ دەکرێت و بەری

لێدەگیرێت و هەر لە سەرەتاوە بەسەریدا سەردەکەون، کە بەناوی داهێنان و هۆیەکانی گۆڕانەوە بکرێت(١٧)، بەڵام ئەم دیاردەیە لە دابڕان و دوورکەوتنەوەی دوو زاری نووسین لە زمانێکدا لە ئایندەدا گۆڕانیان تێدا روودەدات جیا دەبنەوە.

دوای ئەوەی باسی زارو پەیدابوونی زارو شێوەزارمان لەناو زمان بەگشتی و لەناو زمانی کوردیدا بەتایبەتی کرد، روو دەکەینە ئەوەی، بزانین لەناو ئەو زارانەوە، بەتایبەتی ئەوانەی کە لە زمانێکدا، دەوری زمانی ئەدەبی یان بینیوە، کامیان بەرەو زمانی نەتەوەیی و زمانی رەسمی (زمانی نووسینی - زمانی دەوڵەتی) هەنگاو دەنێن و لە پاشەڕۆژدا دەبنە زمانی نەتەوەیی.

لە سەرەتاوە ناکۆکی و کێشەی نێوان دوو زاری زمانێک باسدەکەین، نموونەیان بۆ دەهێنینەوە ئەمجا نموونەی زارە ئەدەبییەکانی زمانی کوردی و چۆنیەتیان دەهێنینەوە. دەبێ ئەوە بوترێت لەکاتێکدا بیر لە زمانی نەتەوەیی دەکرێتەوە، کە وڵات لە ژێر چنگی دەسەڵاتی دوژمن تازە رزگاری بووبێت، یا لە کاتێکدا رۆشنبیران و سیاسەتمەدارانی نەتەوە، بیر لەم بابەتە گرنگ و پێویستە دەکەنەوە، کە شۆڕشی نەتەوەیی میللەت، بەرەو رزگاری هەنگاو دەنێت و ئاسۆی رزگاری نزیک بۆتەوەو زمانی دەسەڵاتدار لە هەرێم و وڵاتەکەدا پاشەکشەی کردووە، وەکو زمانی دەسەڵاتدار. چونکە لە قۆناغی وادا نەبێت مەحاڵە دوژمنی داگیرکەر بهێڵێت کاری وا ئەنجام بدرێت و ئەو بایەخی بە زاڵبوونی زمانی خۆی داوەو، هەموو هەوڵێکی بۆ قەدەغەکردن و قەڵاچۆکردنی رۆشنبیری میللەتەکەیە، وەک بیریاری قەدەغەکردنی زمان و کەلتووری کوردی لە باکووری کوردستان، لەلایەن رژێمی دەسەڵاتداری تورکیاوە، کە بیریارەکەی حەفتا ساڵی خایاندووەو بەردەوامیشە. لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێک وڵات، بواری بەکارهێنانی زمانی دووەم لەلایەن دەوڵەتەوە بۆخوێندن و رۆشنبیری دراوە، وەکو لە عێراقدا بۆ

زمـانی کوردی (١٨) ئەمەش لە پێناوی جێبەجێکردنی مەرام و سیاسەتی
نەخشە بۆ کێشراوەو، کاریگەری شۆڕشەیەک لە دوای یەکەکانی ئەم بەشەی
کوردستانەوە هاتووە هەروەکو باسمان کرد، بارودۆخی نالەباری کورد، کە
بەدرێژایی مێژوو، خاوەن خۆی و وڵاتەکەی نەبووە، توشی دەیان کارەساتی
ناخۆش و ماڵوێرانی بووە، لە مەغۆڵ و تورک و ڕژێمی پەهلەوی، سەفەوی و
پاشایەتی و شۆڤینی عەرەبەوە تاکو ئێستا یەکێک لە کارەساتەکانی کە بۆ ئێرە
گرنگە، دابڕانی زمانەکەیەتی و یەکتر و لە ئەنجامی ئەم دابەشکردنەی وڵات و
خاکی نەتەوەکەی، هەرجارەی لەسەردەمێکدا، بەهۆی بارودۆخی لە باری هەرێم
و ناوچەیەکییەوە، زارێکی زمانەکەی لە کەش و هەوای، لە باری میرنشینە
کوردییەکانیدا، دەوری زمانی ئەدەبی بینوەو گەشەی سەندووە، شاعیرێک یا
چەندین شاعیر بەشێوە لوڕو هەورامی و بۆتانی و کرمانجی ناوەڕاست شیعریان
پێ نووسیوە، وەکو بابەتایەری هەمەدانی (٩٣٥-١٠١٠)، مەلا پەرێشان
(سەدەی ١٤ز)، عەلی حەریری و فەقێ تەیران و مەلای جزیزی (١٥-١٧ز) و
خانی (١٦٥٠-١٧٠٦) و نالی و عەلی بەردەشانی و سالم و کوردی (سەدەی
١٩ز) تا ئێستا. پاشان بەرامبەر بارودۆخی نالەباری ناوچەکەیان، بەهۆی
رووخاندنی میرنشینەکانیانەوە لە زمانی حاڵی ئەدەب کەوتوون، ئێستاش
شێوەی ناوەڕاست لەو سەردەمەوە تاکو ئێستا، بەهۆی هەستی ناسکی
نەتەوایەتی عەلی بەردەشانی و نالییەوە بەرامبەر زمانی نەتەوەیی کوردیان
ڕێبازی شیعرو نووسین بەزاری کرمانجی ناوەڕاست، بەردەوام و لە گەشەکردنایەو
لەساڵی ١٩٢٧ بەدواوە کرمانجی سەرووش هاتۆتە کۆڕی شیعرو ئەدەبیاتەوە،
بەڵام نەک بەهەمان بەردەوامی و گەشەسەندن و بەهەمان قەبارەوە (حجم).

## سەرهەڵدانی زمانی نەتەوەیی لەکێشەی نێوان زاردا کام زار دەبێتە زمانی نەتەوەیی؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ناو جەرگی مێژوو. نموونەی زمانی جۆربەجۆر بهێنینەوە،و هۆیەکانی سەرکەوتنی زارێک بەرەو زمانی نەتەوەیی بخەینەڕوو، باری ئاینی وەکو هۆیەک لە بڵاوکردنەوەی بیرو باوەڕی ئاییندا دەوری بینیوە. کۆنترین ئایین، ئاینی زەردەشتی یە، بەکۆنترین زاری کوردی کە ئاوێستایە، لە سەدەی حەوتەمی پێش زایندا بڵاوبۆتەوە، پاش ڕووخانی میدییەکانیش، لەسەردەمی ئەردەشێری ساسانیدا (سەدەی سێیەمی زاین)(١٩)، بەفەرمانی ئەو، کتێبی ئاڤێستا بەشێوە زمانی ئاڤێستا نووسراوەتەوە، بەڵام بەهۆی هێرشی یەک لەدوای یەکی گریک و هەخامەنشی وساسانی و عیلامی و بابلی و ئەکەدی و پاشان ئیسلام، ئاسەواری ئاینی زەردەشتی و پیاوانی پیری ئاین (موغ) براوەتەوە. زمانی ئاوێستاش لەکارکەوتووە، ئەگەر بەردەوامی ئاینەکەی و دەسەڵاتەکەی بەردەوام بوایە، دەبوو بەزمانی نەتەوەیی. هەروەها لەم بارەیەوە، زمانی سانسکریتی (واتە زمانی کۆنی هیندی) بەهۆی ئاینەوە زمانی نووسین بووە، لەگەڵ نەمانی ئاینەکەدا، زمانەکەش لەناوچووە، هەروەها زمانی لاتینی کۆن زمانی سەردەمی گریکەکان زمانی زانست و ئاین بووە، تا سەدەکانی ناوەڕاست سەردەمی وریابوونەوە (ڕەینەسانس - Renaissance - عصر النهضە)بەهۆی ئاینەوە لەکاردابووە. بۆیە ئاین بۆ زمانی کوردیش لەسەرەتاوە بەهۆی دەسەڵاتی سیاسەتەوە دەوری بینیوە، بەڵام کپ بۆتەوە بەهۆی نەمانی ئاینەکەوە.

جاری وا هەیە بەهۆی بازرگانی و ڕۆشنبیرییەوە دەوردەبینێ لەوەی زاری زمانێک ببینێت بەزمانی نەتەوەیی، بۆ نموونە زاری قورەیش لەسەردەمی جاهیلیدا لە پێش (ئیسلامەوە بەهۆی کڕین و فرۆشتنەوە لە بازاڕی (عەکاز)و

کۆبوونەوەی خەڵک لەوێداو، پاشان خوێندنەوەی شیعری عەرەبی بەشێوەی (قۆرەیش) لە هەمان بازاڕدا، چاکتر بازاڕی گەرم دەکردو، بەتایبەتی لەوەرزی کڕین و فرۆشتن و پێگەیشتنی بەروبوومدا. ئەمە بێجگە لە هۆی بازرگانی کوڕانی (امیە) و (بەنی هاشم) لەگەڵ وڵاتی شامداو پاشان بڵاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام، لە وڵاتی حیجازەوە زیاتر ئەو زارەی کرد بەزمانی نەتەوەیی کە مەڵبەندەکەی لە قورەیش و حیجازەوە بوو، ئاینەکە بەزمانی عەرەبی و زمانی قورئانی پیرۆز بوو.

یا پاش نەمانی زمانی لاتینی وەکو زمانی ئاینی لەسەدەی شانزەدا، زمانی فەرەنسایی و ئینگلیزی و ئیتالیایی و رۆمانی و ئەسپانی چوونەوە سەر زمانی زگماکی نەتەوەی خۆیان و رێزمان و فەرهەنگیان بەزمانی نەتەوەیی دانا. بۆ نموونە زمانی فەرەنسایی، لە زاری پاریسیەوە کە مەڵبەندی دەسەڵاتی وڵاتی تێدابوو، زاڵبوو بەسەر زاری ناوچەکانی تری پاریسداو کەوتە ژێر دەسەڵاتی (زاری پاریس)ەوە، ئەمەش بەبڕیارێکی رەسمی لەساڵی (١٥٣٩)دا شوێنی لاتینی گرتەوە. یا زاری ساکسۆنی ئەڵمانی لەساڵی (١٥٤٠)دا، دوای بڵاوبوونەوەی بنەماکانی (لۆسەر) جێگەی لاتینی گرتەوە.

یا زاری لەندەن، بەهۆی کاریگەری بەرهەمەکانی شەکسپیرەوە، لە هەمان سەدەدا بۆ بەزمانی نەتەوەیی و، بەهەموو وڵات و دوورگەکانی بەریتانیادا بڵاوبۆوە(٢٠). هەروەها زاری مەدرید و زاری ئۆسکانی ئیتالی، بوون بەزمانی نەتەوەیی ئەسپانی و، زمانی نەتەوەیی ئیتالی، دەتوانم بڵێم، ئەم زمانانەی سەرەوە، لە سەرەتاوە کە لەزمانی لاتینێوە جیابوونەوە، بوون بەزمانی نەتەوەیی، هەستی نەتەوایەتی و کزبوونی دەوری ئاین لە ئەورووپادا، لە نەمانی دەوری رۆما وەک مەڵبەندێکی بڕیاری ئاینی و سیاسی، یەکەم هۆیەک بوو بۆ لەدایکبوونیان لەم رووەوە.

لێرەوە، وەکو لەسەرەتاوە باسی پێناسەی زارو چۆنیەتی گەشە کردنی زمان بەرەو زارو پێشاندانی هۆیەکانمان، لە پەیدابوونی زار بەگشتی کردوو، و بۆ زمانی کوردیش هۆی خۆیمان بۆ پیشاندا، دوای ئەوەی زمانی ئاڤێستا، کە هۆی ئاینی دەوری لە بوونە زمانی ئاین و دەسەڵاتدا بینیوە، لەسەردەمی دامەزراندنی میرنشینە کوردییەکانەوە لەسەدەی شانزەدا، هۆی سیاسی و هەستی نەتەوایەتی، کەم و زۆر دەوری بینیوە لە پەیدابوون و سەرهەڵدانی زارە کوردییەکان لە بوونیان بەزمانی ئەدەبی، وەکو زاری لوڕی زمانی شیعرەکانی بابەتایەری هەمەدانی (٩٣٥-١٠١٠ر٠). بەهۆی میرنشینی لوڕستان و، پاشان هۆی ئاین و مەزەب و کاریگەری پاشماوەی ئاینی زەردەشتی لەکوردستاندا، بەتایبەتی لە ناوچەی هەوراماندا بێجگە لە نزیکی زاری هەورامانی، لە زمانی کۆنی کوردی ئاوێستایی و مانەوەی پاشماوەی ئاینی زەردەشتی لە هەوراماندا(٢١) لە سەدەی (١٤)ی زاینەوە زاری هەورامانی، بوو بەزمانی ئەدەب و، مەلا پەرێشان دیوانی (پەرێشان نامە)ی پێ تۆمارکردووە، لەسەدەی (١٩)ی زاینیدا، لەناوچەکەی خۆی بچێتە دەرەوەو لە ناوچەی کەکووکدا شاعیرێکی وەکو (مەلا جەباری) شیعری پێ بنووسێت و هەڵبکەوێت. پاشان بەهۆی دامەزراندن و گەشەسەندنی میرنشینی بابانەوە، پوختەی زارەکانی کرمانجی ناوەڕاست لەلایەن عەلی بەردەشانی و نالییەوە ببێت بە زمانی ئەدەبی و، پەل بەهەموو ناوچەکانی شوێنی زارەکانی تری وەکو لوڕی، هەورامانی، سۆرانی، گەرمیانی بهاوێت و پاش کپبوونەوەیەکی کەم، جارێکی تر، لەسەرەتای سەدەی بیستەوە، بێتەوە کۆڕی زمانی ئەدەبی و رۆشنبیری و گۆڤار و رۆژنامەی پێ دەربچێت و ببێتە زمانحالی حوکمدارێتی شێخ مەحموودی نەمرو، وردە وردە بوو بەزمانی قوتابخانە و رادیۆو زانکۆ و کۆڕی زانیاری و ناوەندە رۆشنبیرییەکان و تەلفزیۆنی کوردی و خاوەن بەرهەمێکی یەکجار گەورەی رۆشنبیرییەوە لە

قوتابخانەکاندا، زمانی زانستەو، هەزاران کتێب و سەرچاوەی لە بواری جیاجیای زانست و ئەدەب و مێژوو، جوگرافیا، رامیاری، کۆمەڵایەتی پێ دەربچێت و خاوەن فەرهەنگ و رێزمانی پێ دەرچووە.

لەسەدەی نێوان (١٥-١٧)زدا، کرمانجی سەروو، شێوە بۆتانێکەی زمانی ئەدەب بووەو فەقێی تەیران و عەلی حەریری و مەلای جەزیری و خانی مەزن شیعریان پێ وتووە، بەڵام لە ئەنجامی رووخاندنی میرنشینی بۆتانەوە، لەکار کەوت و لەکۆتایی سەدەی (١٩)هەمەوە لە دەرچوونی رۆژنامەی (کوردستان) و لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانییەوە، بەتایبەتی دوای دامەزراندنی کۆمەڵەی (خۆیبون - ١٩٢٧) و. شۆڕشی ئاگری داغ بەسەرۆکایەتی جەنەڕال ئیحسان نوری پاشاو هاوڕێیەکانی، جارێکی تر سەری هەڵداوەتەوەو، بۆتەوە زمانی شیعرو ئەدەب و گۆڤارو رۆژنامەی (ستێر، هاوار، رۆژانو)ی پێدەربچێت، بەڵام لە ئەنجامی روخاندنی، ئەم شۆڕشەو شۆڕشەکانی تریش، بەبڕیاری رەسمی دەوڵەتی رەگەزپەرستی تورک، قەدەغەکراو، تاساڵی (١٩٩١)ی لە ئەنجامی گۆڕانکاری و نەمانی جەنگی ساردو راپەڕینی باشووری کوردستان و کۆچڕەوی ملیۆنی کوردو سەرهەڵدانی چەکداری شۆڕشی نەتەوایەتی کوردی باکوورو، ئاشکرابوونی مەغدووریەتی کوردو، بەرەو پێش چوونی سەرجەم مەسەلەی کورد، لە دنیاو لای نەتەوە یەکگرتووەکان، قەدەغەی قسەکردنی لەسەر هەڵگیراوەو لە ئەستەنبووڵ رۆژنامەی پێ دەردەچێت و بێ ئەوەی بگاتە ناوچە کورد نشینەکانی تری باکووری کوردستان کە نزیکەی بیست ملیۆنێکن.

دوای ئەوەی زارە کوردێکان و، دەورو و سەردەمیان خرانەڕوو، پێویستە ئەوە بوترێت، وەکو تاقی کردنەوەو بەڵگەی راستی، کە لەناو زمانەکانی جیهاندا روویداوە، ئەگەر دوو زار، یا دوو زاری زمانێک لەوڵات و لەناو میللەتێکدا پێکەوە بەکار بهێنرێن و، هەردووکیان زاری رۆشنبیری و ئەدەب و ئەدەبیات بن،

کامیان زاڵ دەبن بەسەر ناکۆکی نێوانیان و دەبنە زمانی نەتەوەیی. لێرەوە ئەم بەڵگانە دەخەینەڕوو.

ئەگەر ئەو دوو زارە، هەردووکیان لەڕووی دەسەڵات و رۆشنبیرییەوە، لەیەک ئاستدابن، هیچیان زاڵ نابن بەسەر ئەویتریاندا، بەڵام ئەگەر دەسەڵات و رادەی رۆشنبیری یەکێکیان زیاتر بێت لەویتریان و، زمانی مەڵبەندی دەسەڵاتی ناوچەکە بێت، بێگومان ئەو یەکیان زاڵ دەبێت بەسەر ئەویترياندا. بێجگە لەوەی، ئەگەر یەکێکیان شوێنی مەڵبەندی دەسەڵاتیشی لێ بێت، بەڵام ئەگەر رادەی زارەکە، لەرووی خزمەتی رۆشنبیری و دەرچوونی گۆڤارو رۆژنامەو کتێب و سەرچاوەو فەرهەنگەوە، لەویتریان کەمتر ببێت، دیسان زاڵ نابێت بەسەریدا. ئەمە بێجگە لەوەی زمانی رۆشنبیری و ئەدەب و نووسینە، زمانی قوتابخانەو زانکۆو گۆڤارو رۆژنامەش بێت و، سەرچاوەی خوێندن و زانست، هەر بەرەو زارەبێت و لە پاڵ ئەوەشدا، زمانی رەسمی دەسەڵاتەکە بێت، ئەوا ئەو زارە بەرەو زمانی نەتەوەیی هەنگاو دەنێت، چونکە خاوەن سامانێکی زۆرە لە نەسراوو، دانراوو فەرهەنگ و رێزمان و سەرچاوەی زانستی جۆربەجۆردا و، لەپاڵ ئەمانەشدا بەردەوامی بەخۆیەوە ببینێت، بەڵام ئەگەر رادەی رۆشنبیری و شارستانێتی و ئەدەبیاتی زمانی یەکێک لە دوو ناوچەیە سەرکەوتوو بێت و لەویتر زیاتر بێت، ئەو زاڵ دەبێت بەسەر ئەو زارەدا ئەگەرچی زاری ناوچە پێشکەوتووەکە دەسەڵاتی سیاسیشی نەبێت (واتە شوێنی دەسەڵات نەبێت). وەک زاری ساکسۆنی لە ئەڵمانیا لە سەدەی (١٦)ز دا وردە وردە، زاڵبوو بەسەر زارەکانی تری ئەڵمانیادا، پێش ئەوەی بەرلین سەرکەوتوو بێت(٢٢)

دواشت، ئەنجام ئەوەیە زاری زمانێک سەردەکەوێت و، دەبێتە زمانی نەتەوەیی، کە ئاستی رۆشنبیری و شارستانی بەهێزترو پێشکەوتووترو زۆرتر بێت، لە زارەکەی تری بەرامبەر، بێجگە لەوەی ئەگەر مەڵبەندی دەسەڵاتی



نەخشەی کوردستان دەربارەی روون کردنەوەی

شوێنی زارەکانی زمانی کورد و هەندێک شاری

ناوچەو هەرێمەکەش لێبێت و بەردەوامی بەکارهێنان و بوونە زمانی ئەدەبیات و دانانی بەخۆیەوە دیبێت، لێرەدا دیالێکتی کرمانجی ناوەڕاست لەسەردەمی شێخ مەحمودەوە تاکو ئێستا زمانی خوێندن و رۆشنبیرییەو لە خزمەتی شارستانییەتی ئەم بەشەی کوردستاندایە تەنانەت لە زانکۆشدا.

## ئەنجام

١- چەنێک شوێنی بەکارهێنانی زمان، رووبەرەکەی فراوان و بەربلاوبێت، ئەوەندە دەبێتە هۆ بۆ پەیدابوونی زار لەناویدا.

٢- دابەشبوونی ولاتێک بۆ چەند ناوچەو هەرێمی جیاواز، لەڕووی کارگێڕی و کۆمەلایەتی و جوگرافی و سروشتییەوە، دەبێتە هۆی پەیدابوونی زار، لەناو زمانی ولاتەکەدا، بەتایبەتی لەولاتێکی خاوەن دەسەلات لاوازدا.

٣- ئیش وکارو پیشەی جیاواز، دەبێتە هۆی پەیدابوونی زارو دەولەمەندی زمانەکە.

٤- زالبوونی میللەتێک بەسەر میللەتی ترەوە، بەتایبەتی لەرووی دەسەلاتی بەڕێوەبردن و رۆشنبیرییەوە وشەی بێگانە لەناو زماندا پەیدا دەکات.

٥- دابڕانی خاک و نیشتمانی ولات و نەتەوەیەک، بۆ ژێر دەسەلاتی ولاتی جیاجیاوە، دەبێتە هۆی دابڕانی زارەکانی زمان لە یەکترو گەشەسەندنی زار.

٦- هۆی دەربڕین و گۆکردنی (تلفظ) جیاواز لە ئاخاوتندا، لە درکاندنی دەنگ و دەربڕیندا، دەبێتە هۆی پەیدابوونی زار وەکو سەرەتایەک بۆ ئەم دیاردەیە لەناو زماندا.

٧- سیستەمی میرنشینە کوردییەکان لە خزمەتی گەشەکردنی زارە سەرەکییەکانی زمانی کوردی بوونە بەرەو زمانی ئەدەبی و هەر یەک لەو زارانە لەسەردەمێکی دیاریکراودا بوونەتە زمانی ئەدەبی.

٨- نەبوونی یەکێتی ئابووری و بازرگانی لەنێوان هەموو ناوچەکانی وڵاتدا لە خزمەتی پەیدابوونی زاردایە، چونکە دابڕانی ئابووری و پچڕانی ناوچەکانی لەیەکتری بەخۆیەوە دەبینێت.

٩- بوونی هۆزو تیرەو تایفەی جیا، لەناو کۆمەڵی میللەتدا، زار لە زماندا پەیدا دەکات.

١٠- نەبوونی دەسەڵات و دەوڵەتی نەتەوەیی لەناو نەتەوەیەکدا زمانەکەی بەرەو گەشەسەندنی زار دەبات.

١١- دەمارگیری و هەرێمگیری و تیرەگەری وەکو داب و نەریتی باوی کۆمەڵی خێڵەکی، دەبێتە هۆی پەیدابوونی زارو دابڕانی زارەکانی زمانێک لەیەکتر.

١٢- نووسین و بڵاوکردنەوەی ئەدەبیات و گۆڤارو رۆژنامەو رادیۆو تەلەفزیۆن و خوێندن بەدوو زاری جیاواز، یا بەچەند زارێک، دەبێتە هۆی گەشەکردنی زاری زمان و لێکدابڕان و پارچەبوونی نیشتمان و میللەت و کۆمەڵی میللەتەکە، لە یەکترو بەردەوامی و گەشەسەندنی وەکو دیاردەیەک دەیانکات بەزمانی جیاوازو میللەتی جیاواز.

١٣- دەسەڵاتی ناوەندی وڵاتی زمانێک، دەتوانێت لە قۆناغی سەرکەوتنی شۆڕشی نەتەوەیی، یا دوای سەرکەوتنەکەی، زارێکی زمانەکە، بەتایبەتی ئەگەر زمانی رۆشنبیری و ناوەندی دەسەڵاتەکە بێت لەم رووەوە لە زارەکانی تر پێشکەوتووتربێت، بە بڕیارێکی رەسمی بیکات بە زمانی نەتەوەیی بەتایبەتی ئەگەر توانای جێبەجێکردنی بڕیارەکەی بێت لە هەموو ناوچەکاندا.

١٤- هۆی ئاینی و دەسەڵاتی سیاسی، زاری زمانێک دەکات بەزمانی نەتەوەیی. ئەگەر ئەو بارودۆخەی بۆ هەڵبکەوێت، وەکو زمانی عارەبی و فەرەنسی ناوچەی پروتستانەکان، کە زاڵبوو بەسەر زاری فەرەنسایی

کاسۆلیکەکان.

١٥- مەحاڵە زمانی نەتەوەیی بەتێکەڵکردنی دوو زار پێکبێت، مەگەر باری مێژوویی ئەمە بکات، چونکە تێکەڵکردنی ئارەزووی مرۆڤ دەگەیەنێت، ئەمەش دەستوور دەگرێتەوە، دەستور گۆڕینی زمانیش مەحاڵە بەئارەزوو نابێت.

١٦- زمانی ئەدەبی کرمانجی ناوەڕاست چەندین زاری گەورەو بچووکی تێدا تواوەتەوە، کە رۆشنبیرانی ئەو زارانەش پێی دەنووسن و رووبەرێکی فراوان دەگرێتەوە کە لە باکووری کەنداوی عارەبی لە لوڕستانەوە تا باشووری شاری ورمێ بەرەو رۆژهەلاتی جادەی موسڵ دەگەڕێتەوە، واتە لەکۆتایی سنووری ناوچەی سۆران- بادینانەوە، ئەم زارانەی لە ئەدەبیاتدا تیادا تواوەتەوە. لوڕی (کرمانجی باشوور)، لوڕی گەورە، لوڕی بچووک، فەیلی باجەلانی، گۆران، هەورامانی، موکریانی، سلێمانی، کەرکووکی و، گەرمیانی، سۆرانی، کاکەیی و زەنگنە، شوانی کێشک...هتد لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە، کە ئەم زارە واتە زمانی ئەدەبی یەکگرتوو لە ناوچە جیاوازەکانی ئەم زارانەدا، چونکە نووسەرەکانیان لەگەڵ ئەوەشدا زمانی ئاخاوتنیان جیاجیایەو جیاوازە لەگەڵ زمانە ئەدەبییەکەدا، بەڵام لەنووسیندا بەپوختەی کرمانجی خواروو/ سلێمانی دەنووسن، بۆ نموونە نووسەرە هەورامییەکان و باجەلانییەکان و کاکەییەکان و لوڕییەکان و موکریانییەکان زمانی ئاخاوتنیان بریتییە لە هەورامی و باجەلانی و کاکەیی و لوڕی و موکریانی، ئەمانە هەموویان لە نووسیندا یەک زمانی ئەدەبی بەکار دەهێنن.

ئەم زمانە ئەدەبییە ماوەی حەفتا ساڵە زمانی نووسین و خوێندن و زانست و رۆشنبیرییەو سەرچاوەیەکی زۆری ئەم بوارانەی بەشێوەی کتێب پێ بڵاوکراوەتەوەو دەوری سەدو حەفتا ساڵیشە بەردەوام زمانی شیعرەو رۆژ بەرۆژیش لە گەشەسەندندایە.

## پەراوێزو سەرچاوەکان:

١- د. محمد احمد ابو الفرج، فقة اللغة، ط ١، بيروت، ١٩٦٦، ص٣٠.

٢- د. علي عبدالواحد وافي، علم اللغة، الفجالة - القاهرة، ١٩٧٢، ص١٧٩.

٣- فؤاد حمه خورشيد، اللغة الكردية: التوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد ١٩٨٣، ص٢٨-٣٨.

٤- بڕوانە شاعیران و نووسەرانی ناوچەی کەرکووک و گەرمیان وەکو شێخ رەزای تاڵەبانی، خالصی ئەسیری، عبدالرحمان بەگی نفوس، شێخ مارفی بەرزنجی.. هتد.

٥- کاکەیی: هۆزێکە سەر بەناوچەی داقوق و دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای کەرکووک، شوان: هۆزێکی (٧٦) دێیەو مەڵبەندەکەی دێی (رێدار)ەو دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی کەرکووک، زارێکی قسەکردنی تێدایە پێی دەوترێت (شوانی کێشک) جیاوازە لە زاری هەمان ناوچەو، نزیکەی چواردە دێ قسەی پێ دەکەن، شێخانی: چەند دێیەکن سەربە ناوچەی قادر کەرەمی باشووری رۆژهەڵاتی کەرکووک.

٦- بڕوانە/ (أ) د. علي عبدالواحد وافي، هەمان سەرچاوە، ص١٧٥-١٧٦، (ب) عبدالرحمن امين زەبيحي، قاموسي زماني كوردى (ء) چاپخانەی کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٧، ل٥٢.

٧- سادق بەهادین، رێزمانا کوردی، بەغدا، ١٩٨٧، ل٤٧.

٨- سەرچاوەی ژمارە (٢)، هەمان لاپەڕە.

٩- د. عزەدین مستەفا رەسوڵ، سەرنجێ لە زمانی ئەدەبی یەکگرتووی

کوردی، بەغدا، ١٩٧١، ل١٥٤.

١٠- سادق بەهادین، هەمان سەرچاوە، ل٤٣.

١١- د. عزەدین مستەفا رەسوڵ، هەمان سەرچاوە،ل١٧.

١٢- ابو خلدون و صاطع الحصري، في اللغة والادب وعلاقتهما بالقومية. بيروت، ١٩٨٥، ص٤٢.

١٣- ئەو سێ دێیە بریتین لە ئۆمەر گومەت، سێگردکان، کانیلەلە، لە باشووری تەقتەقی شاری کۆیسنجقی پارێزگای هەولێر بۆ زیاتر دڵنیابوون بڕوانە ادموندز، کوردو تورک و عەرەب، ترجمة: جرجيس فتح الله، بغداد، ١٩٧١، ص٢٨٩ .

١٤- بڕوانە مەلا جمیل رۆژبەیانی، بەباڵای تەئریخی جافا، رۆشنبیری نوێ، ژ (١٣٧) . ل١٤-١٧، بۆ زیاتر دڵنیابوون بڕوانە پەراوێزی (٤) شوان وەکو زارێک نزیکە لە زاری خانەقینی.

١٥- د. علی عبدالواحد وافی، هەمان سەرچاوە، ل١٧٩ .

١٦- هەمان سەرچاوە، ل١٧٨ .

١٧- هەمان سەرچاوە، ل١٧٩-١٨٠ .

١٨- محمد معروف فتاح، زمانی نەتەوایەتی، گۆڤاری مەتین ژ (٥٣)، ١٩٩٥، ل٢٢-٣١ .

١٩- محمد امین هەورامانی، مێژووی رێبازی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٩٠، ل١٤.

٢٠- محمد معروف فتاح، هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

٢١- د. عیزەدین مستەفا رەسول، هەمان سەرچاوە، ل٢٤ .

٢٢- بڕوانە د.علی عبدالواحد وافی، هەمان سەرچاوە، ل١٨٢ .

# مێژووی زمانی کوردی
# لەکۆنەوە تائەمڕۆ

دەربارەی زمانی کوردی و نەتەوەکەی، بیروڕای سەیر سەیر، بەناحەزییەوە، دژی تۆمارکراوە، ئەم بیروڕایانە لەپێناوی سوککردنی زمانەکەو نەتەوەکەی ئەنجام دراوە، بەمەبەستی سەپاندنی دەسەلات و فەرامۆشکردنی لەهەموو روویەکی ژیانەوە، تا نەتوانێت سەر بڵند بکات و، بەهەموو لایەکدا بەئارەزووی خۆیان دەنگی کپ بکەن و، بیرەتێن و خۆیشی لەبەرچاوی خۆی سووک بکەن، بەڵام ئەمە بۆ هەموو کەسێک، ناچێتە سەر، هەموو شتێک دیزە بەدەرخۆنە بکات، بۆیە کوردیش چ لەلایەن خۆیەوەو چ لەلایەنی زانایانی بەویژدان و راستگۆوە، وەڵامی ئەو تانەو تەشەرو ناڕاستییانەی، بەبەڵگەی راست و دروستی مێژوویی داوەتەوە، کە کورد هەیەو، زمانیشی هەیە، خاوەن رەگەزی رەسەن و زمانی دێرین و نیشتمانی دیار یکراوی خۆیەتی ئێمە لێرەدا، ئەوە دەخەینەڕوو، کە زمانی کوردی زمانێکی رەسەن و زیندووە، خاوەن رابردوویەکی دێرینەو گەشەو گۆڕانی لەگەڵ گۆڕان کۆمەڵی کوردەواریدا کردووەو، سەربەخۆیی نەتەوەیی، لەئەنجامی گۆڕان و پەرەسەندنی بەرەو پێشەوەی خۆیدا پاراستووە.

ئەم رەسەنایەتی و، سەربەخۆیی پاراستنەی ناسنامەی نەتەوەیی داوەتێ.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە هەندێک بیروڕای چەوت و چەوێڵ هەن، کە زمانی کوردییان، بەنارەسەن یا بەزارێکی شیواوی زمانی فارسی یا بەهیندی زانیوە،

بێ ئەوەی لەبەڵگەی مێژوویی و لێکۆڵینەوەی زانستی ئاگادارین، یا هەندێکیان لەرووی مەبەستی سیاسییەوە، بەئەنقەست سوکایەتی بەکوردی دەکەن، تا کورد هەر ژێر دەستەیان بێت.

لێرەوە دەپرسین لەبنچینەدا، شوێنی زایندەی زمانی کوردی کوێ بووە؟ زمانی کوردی سەر بەچ خێزانە زمانێکەو، ئەو زمانانە کامانەن و سەر بەچی کۆمەڵە زمانێکن؟ لەناویاندا زمانی کوردی چۆن پێناسە دەکرێت؟ و پێناسەکەی لەچ روویەکەوە ئەنجام دراوە؟ بەڵگەی نووسراوی ئەم زمانە چییەو بۆچ سەردەمێکی مێژوو دەگەرێتەوە؟ جیاوازی زمانی کوردی و فارسی چییە؟ قۆناغی مێژوویی زمانە ئێرانییەکان و زمانی کوردیش چۆن و بەچەند قۆناغدا تێپەڕیوەو، رێنوسی زمانەکە بەچ جۆرە پیتێک بووە؟ بۆچی تانەو تەشەرو سووکایەتی کردن بەگەل و زمان و کەلەپوورو مێژوو و رەگەزیشی کراوە؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە، روودەکەینە سەرچاوەکان و وەڵامەکانیان لێرەدا، بەبەڵگەی مێژوویی و زمانەوانی لەگەڵ خستنەرووی بیروڕای خۆمان دەخەینەروو، زمانی کوردی لە بنچینەدا، لەگەڵ زمانی هیندو ئەوروپیدا بەزمانی هیندو ئێرانی یا هیندو ئاری ناودەبرێت، چونکە ئەم زمانانە زمانی چەند هۆزێک بوونە، لەشوێنێکدا پێکەوە نیشتەجێ بوونە، پێی دەوترێت «ئاریانا» یا «ئاریان».

ئەم هۆزانە، بەبەشی هیندی و بەبەشی ئێرانییەوە شوێنیان، دوای یەکەم کۆچی ئەو هۆزانە بووە، لەولاتی ئەفغانستانەوە، کەرۆژهەلاتی ئێرانە، بەرەو هیندستان کۆچیان کردووە«١» لەسندوبنجاب ئارامیان گرتووە«٢» بەم هۆزانە دەوترێت هۆزە (هیندیەکان)و، زمانەکەیان بەخێزانی زمانە هیندیەکان ناودەبرێت بەشی رۆژهەلاتی (ساتوم) کۆمەڵە زمانی هیندو ئەوروپایی دەگرێتەوە، لەگەڵ زمانە ئێرانییەکاندا. ئەم خێزانە زمانە هیندییە، لەسەدەکانی زۆرپێش زایینەوە، لەرۆژهەلاتی ئێران یا ئەفغانستانی ئێستاوە، بەرەو باشووری رۆژهەلات،

بوونەتەوە، کە باشووری ئاسیا دەگرێتەوە، شوێنی خێزانە زمانە هیندییەکانە کۆنترین بەڵگەی نووسراوی، ئەم کۆمەڵە، یا خێزانە زمانە کتێبی پیرۆزیی (ڤیدا)ی هیندییەکانە بە(ڕەگ ڤیدا) ناوی دەرکردووەو بەکۆنترین زمانی ئەم بەشە، نووسراوەتەوە، کە زمانی سانسکریتییەو بۆ سەدەی (١٢) پ-ز دەگەڕێتەوە لەگەڵ زمانی (میتانی)و زمانی (حیثی)«٣» واتە ئاڤێستا دوای (ڕەگ ڤیدا)ی سانسکریتی کۆنترین بەڵگەی نووسراوی زمانە ئێرانییەکانە ئەم خێزانە زمانە زمانی (سانسکرینی واتە (هیندی کۆن)، باراکراتی کۆجەراتی، راجاسانی، بەهاری، بەنگالی، ئۆردو، سەنیگالی، سندی..) دەگرێتەوە.

بەشی دووەمی خێزانە زمانی هیندۆ ئاری، یا هیندۆ ئێرانی کە هۆزە (ئێرانییەکان)ن.

هەندێک نووسەر دەڵێن، ئەمانە کۆچیان نەکردووەو، لەشوێنی خۆیان لەوڵاتەکانی ئاسیای ناوەڕاستا ماونەتەوەو لە ئەفغانستان و ئێران، نیشتەجێ بوونە پێیان دەوترێت هۆزەکانی یا خێزانی زمانە (ئێرانییەکان)، کە بریتییە لەزمانی (ئاڤێستا) (کوردی کۆن)، پارسی کۆن (هەخامەنشی) پەهلەوی بەلوجی پەشتوویی، ئەفغانی، سوغدی، تاجیکی، کوردی، فارسی نوێ) کۆنترین بەڵگەی نووسراوی ئەم خێزانە زمانە، کتێبی (ئاڤێستا)ی ئاینی زەردەشتیە، لەسەدەی (٧) پ-ز لەسەردەمی میدییەکاندا، بەزمانی، یا شێوەی زمانی نەتەوەیی زەردەشت، نووسراوەتەوە، کە زمانی (ئاڤێستا)یەو بریتییە لەکۆمەڵە دەقێکی ئاینی، سروودی زەردەشت لە (٢١) سروود پێکهاتووە، لەلایەن زەردەشت خۆیەوە وتراوەو نووسراوەتەوە، گەورەترین بەش (گاتا) لەپێنج بەشی دی پێکهاتووە، بەشێوە پیتێک نووسراوەتەوە، پێی دەوترێ پیتی ئاویستایی و (٦٠) پیتەو لەچەپەوە بۆ ڕاست دەنووسرێت، لەکاتی خۆیدا لەسەرپێستی گادا نووسراوەتەوە، هەندێک نووسەری دی دەڵێن، ئەم کۆمەڵە

هۆزە ئێرانییانە بەرەو ئاسیای بچووک و چیای زاگرۆس چوون، لەئێران و کوردستان بڵاوبوونەتەوە«٥»، ئەمانە دووبەشن، بەشێکیان، بەرەو باکووری رۆژئاوای ئێران بوونەتەوە، لەناوچەی (گۆمی ورمێ) سەقامگیربوونە بە (مادەکان)ناو دەبرێن، واتە باوباپیرانی کوردی ئێستا نەوەی ئەم (ماد)انەن، کەلەسەدەی (٧ پ-ز)ەوە تاکو (٥٥٠ پ-ز)، گەورەترین دەوڵەتیان بەناوی دەوڵەتی میدیا دامەزراندووە توانیویانە دەسەڵاتی خۆیان، بەسەرناوچەیەکدا بڵاوبکەنەوە، وەکو ئێران و بەشی ژوورووی میسۆپۆتامیاو چەند بەشێک لەئاسیای ناوەڕاست تا رووباری (خالص- قزل ارمق)«٦».

راستیەکەی شوێنی دووەم، پانتایی یەکەم دەگرێتەوەو، دەسەڵاتی مادەکانی گەیشتۆتێ، چونکە مادەکان، پایتەختی (نەینەوا)ی ئاشووریەکانیان لەساڵی ٦١٢ پ-ز داگیرکردووە نزیکی سنووری شاری بابل، درێژبۆتەوە، کە هەر دەوروبەری (خالص) دەگرێتەوە، کەواتە بیرورِاکان هەردووکیان تەواوکەری یەکترن، چونکە ئەم هۆزە ئێرانیانە لەئاستی خۆیانەوە بڵاوبوونەتەوە، بێجگە لەوەی سەرووی وڵاتی میسۆپۆتامیا لەکۆنەوەو ئێستاش کوردستان دەگرێتەوە، واتە کوردستانی باشوور دەگرێتەوە ئەمجا پێویستە لێرەدا، ئەوە روونبکەینەوە، هۆزە ئێرانیەکان وەکو وتمان بوونەتە دوو بەشەوە، بەشێکیان کە مادەکانن، واتە کورد بەرەو باکووری رۆژئاوای ئاریانا، یا باشتر بڵێین، لەو شوێنەدا نیشتەجێ بوونە، کە رۆژئاوای ئێرانی ئێستا دەگرێتەوەو پایتەختیان لە (ئەگباتان)ی هەمەدانی ئێستابووە.

بەشەکەی دیکەیان، کە پارسەکانن واتە باوباپیرانی فارسی ئێستا لەرێگای (فرسوماش)ەوە، بەرەو هەرێمی (فارسا)، یا (پەرسوا- فەرسوا)«٧» رۆیشتوون و جێگیربوونە، کە دەکاتە باشووری رۆژئاوای ئێران. لێرەدا ئەوەمان بۆ روونبۆوە، کە خێزانە زمانی ئێرانی یا هۆزەکانی هەریەکەیان، بەرەو لایەکی

ئێران چوونه کوردەکان، یامادی باوو باپیرانیان، کەوتوونەتە باکووری ڕۆژئاوای ئێران و پارسەکان یا فارسی ئێستا لەبەشی باشووری ڕۆژئاوان ئێستا ڕوونبۆوە کە هۆزە کوردو فارسەکان، یا زمانەکەیان، هەریەکێکیان لەیەکتر دابڕاون و سەربەخۆن و سەربەخۆیی خۆیان لەشوێنی کۆنی بنچینەی باوباپیرانیانەوە، پاراستووە، بۆیە لێرەوە، کاتی ئەوە هاتووە، لەناو خێزانە زمانە ئێرانیەکاندا، کەسەر بەکۆمەڵەی زمانە هیندۆ ئاریەکانە، لەڕووی جیاوازی ڕێزمان و شوێنی جوگرافیەوە، زمانی کوردی بەزمانێکی (ئێرانی باکووریی ڕۆژئاوایی نوێ) دابنێین«٨» هێماش بۆ ئەوە بکەین کە وشەو زاراوەی (نوێ) لەم پێناسەدا، مەبەست لەقۆناغی نوێی زمانی کوردییە، چونکە شێوەی کۆنی زمانی کوردی، وەکو زمانێکی باکووری ڕۆژئاوایی خێزانی زمانە ئێرانییەکان بریتییە لەزمانی (ئاڤێستا) یا (ئاوێستا) کە زمانی کتێبە پیرۆزەکەی زەردەشتەو بەواتای (ڕێگای ڕاست- پەناگەو حەشارگە) لێکدراوەتەوە«٩» هەرچی زمانی فارسی ئێستایە لەم ڕووەوە کەلەکۆندا (پارس)ی پێ وتراوە بەزمانێکی ئێرانیی باشووری ڕۆژئاوایی نوێ دادەنرێت و کۆنترین سەرچاوەو، بەڵگەی نووسراوی، ئەم زمانە ئێرانییە فارسییە بریتییە: لەنموونەی نووسراوەکانی نووسینەکانی داریوش هاتووە لەسەر کێلی قەبرو، دیواری قەڵاو، لەسەر ئەشکەوتەکان نووسراوەتەوە مێژووی زمانی فارس، وەکو بەڵگەی نووسراو، (٢٥٠)ساڵ دوای نووسینی ئاڤێستای شێوە زمانی کوردییە، کەواتە زمانی کوردی، لەڕووی نووسین و بەکارهێنانی لەدەزگای دەوڵەتی و دامەزراندنی دەوڵەتەوە، بەدوو سەدەونیو، پێش فارسەکان و زمانی نووسینیان کەوتووە کە دەکاتە سەدە (٧ پ-ز) و، تا ساڵی (٥٥٠ پ-ز) مادەکان لەڕۆژئاوای ئێران، دەسەڵاتدارو فەرمان ڕەوابوونە و، لەمەوە دەردەکەوێت کە شارستانییەتی کورد (٢٥٠) ساڵ پێش فارس کەوتووە. پاشان دەوڵەتی میدیا، لەلایەن (کۆرش)ەوە، ڕوخێنراون

و دواییـان هاتووەو، بوونەتە ژێر دەسـتـەی فـارسـەکـان، کـە خـاوەن دەوڵـەتی (هەخامەنشی) بوونەو لەسەر لاشەی دەوڵەتی میدیاوە دامەزرێنراوە، زانست و زانیاری مـیدییـەکانیـان لەشارستـانییەت و چۆنیـەتی ڕێکخستنی ژیان و کتێبی ئاڤێـسـتاشیـان سـوود لێوەرگرتووەو، لەپاشـاندا سـوتاندوویانە، لەمەوە کوردو شارستـانیـەتە دێرینەکەی و ئاینەکەی کەوتۆتە بەر شاڵاوی نەمان و هێرشەیەک لەدوای یەکـەکـانی، فـارس هەخـامـەنشی و وگـریکی و عـیـلامی و بابلی و لەدوایشدا هاتنی لەشکری ئیسلام و زمـانی عەرەبی هەرچەند دوای ئەمەو، هەر لەم وتارەدا، هێما بۆ ئەوە دەکەین کە لەسەر دەمی دیکەدا، زمـانی ئاڤێـستـاو، کـتێبی ئایینی زەردەشت، پاش ئەم سەردەمـەش فـەرمـانی نووسـینەوەی دراوە، لێـرەوە باسی بەشی سـێـهـەمی ئەو هۆزە کـۆچەریانە دەکـەین کـەوا زمـان و هۆزە ئەوروپاییەکانیان پێکهێناوە یا بەکۆمەڵەی ڕۆژئاوایی (کانتوم)یش دەناسرێن و لەگەڵ خێزان و هۆزی ئێرانی و هیندی، بەوە لەگەڵ یەکتر جیا دەکرێنەوە، کە ئەم دوانەی دواوە بەشی ڕۆژهەڵاتین لێرە بەدواوە، بەخشـتـەیەک نیشـانیـان دەدەین، ئەمجا هۆزی سێهەم ئەوانەن لەبانەکانی ئێرانەوە واتە لای ڕۆژهەڵاتیەوە، بەسەر دەریای دانوبدا ڕۆژئاواو نیمچە دورگەی بەلـکان کۆچیان کردووەو«١٠» میللەت و زمانە ئەوروپاییەکانیان لێوە پەیدا بووە ئەمانەش لەناو خۆیاندا، هەر خێزان و کـۆمەڵـەیەکی لەچەند زمـانێکی دیکەی ئەوروپایی، پێکهـاتووە، وەکو کـۆمـەڵە زمـانی جەرمەنی، لاتینی، سـلاڤی بەلـتیـکی، یۆنانی، کەلتی، ئەلبـانی، ئەمانە پێشـینانی یۆنان و ڕۆمـان و گەلە ئەوروپاییـانەن، کـە بەزمـانەکـانی ئێسـتـای ئەوروپایی قسـە دەکـەن و لەزمـانی دیکە پێکهـاتوونە، لەسـەرەوە، تا ئێـرە سێ جـۆرە هۆزو مـیللەت و زمـانەکـەیان خـرانەڕوو، کـە لەسـەرەتاوە لەڕۆژهەڵاتی ئێـرانەوە، هەندێک دەڵێن ئەم شوێنە ئەفغـانسـتـانی ئێسـتـایە، بەرەو ئێـران و کوردستـان و هیندسـتـان و ئەوروپا چوونە، یا لەهەمـان شوێن نیشـتـەجێ بوونە،

وەک لەسەرەتاوە باسمان کرد، ئەم شوێنە، واتە مەڵبەندی هۆزو گەل و زمانە ئارییەکان، کە هەر سێ جۆرەکەی سەرەوە، بەکۆمەڵەی هیندی و ئێرانی و ئەوروپایی دەگرێتەوەو تیایدا بوونە وەک لەسەرچاوەکاندا هاتووە پێ دەوترێ (ئاریانا) یا (ئاریان)، واتە وڵات و مەڵبەندو شوێنی بنەڕەت و بنچینەی گەلانی هیندو ئاری کۆن، ئەم شوێنە بانەکانی ئێران، لەچیای زاگرۆس لەرۆژئاوا تاکو هیندستان، لەرۆژهەڵاتەوە دەگرێتەوە، بەتایبەتی لەسندو بنجاب ئەم شوێنە، دەکەوێتە رۆژهەڵات و باکووری رۆژهەڵات زەریای قەزوێنەوە، کە بەبانەکانی ئێران ناسراوەو، لەکۆندا وەک لەکتێبی (ڤیدا)ی ئاینی هیندیەکان هاتووە، پێی وتراوە (ئاریانا فیجا) یا (ئاریان ڤاچ) یا (ئاریانا-ئاریان)«١١» کەواتە ئاریانا شوێنە، نەک ناوی پێشینانی گەلانی هیندو ئەوروپایی بگرێتەوە، لەم وشەیە، وەکو زاراوەیەکی جوگرافی، لەسەرچاوە کۆنەکاندا بەرامبەر بەو شوێنە وتراوەو بەکارهاتووە،و کە وردە وردە، بەدرێژایی رۆژگارو گۆران و زەمان (ئاریانا) بۆتە (ئاریان)و، پاشان ناوی شوێنەکە، بەسەر خەڵکەکەیدا براوەو، پێیان وتراوە گەلانی ئاری رەگەز و لەمێژووی نوێشدا، بەبڕیاری رەسمی شای ئێران (هەرێمی فارس)ی کرد بە (ئێران)و ئێرانیش شێوەی گۆڕاوی (ئاریانا)و (ئاریان)ە، ئەوەی لێرەدا گرنگە نابێت واتێبگەین کە خێزانی زمانی ئێرانی یا ئێران تەنها فارس دەگرێتەوە، بەڵکو هەموو گەلی کورد و فارس، بەلووج، پەشتوویی، ئەفغانی، تاجیکی«١٢»، ئەسیتینی«١٣» دەگرێتەوە وەکو خێزانە زمان و رەگەز.

لێرەدا هەروەکو فوئاد حەمە خورشیدیش هێمای بۆ کردووە، بیروڕای (براستد، جیمس هنری) لەبارەی وشەی (ئاری)یەوە وەرگرتووە، کە لەناوی، شوێنی نیشتەجێ بوونی ئەو گەلانەوە هاتووە، کە (ئاریانا)یە، نەک ناوی پێشینانی ئەو گەلانە بێت«١٤»، پێویستە ئەوە روون بکەینەوە، کە هەڵەیە بەو

| کۆمەڵەی زمانە ئارییەکان«١٧» | | |
|---|---|---|
| (١) کۆمەڵەی خێزانی زمانی ئێرانی | (٢)خێزانی زمانی هیندی | (٣) خێزانە زمانی ئەوروپایی |
| ئاڤێستا(کوردی کۆن) باکووری رۆژاوای(ئێران)ی | هیندی | ١- کۆمەڵەی جەرمەنی... |
| پارسی(کۆن-هەخامەنشی باشووری رۆژاوای(فارسی) | سانسکریتی(هیندی کۆن) | |
| بەلوجی | بەهاری | ٢- کۆمەڵەی لاتینی... |
| پەشتویی | راجاسانی | ٣- کۆمەڵەی سلاڤی... |
| کوردی نوێ | کۆجەراتی | ٤- کۆمەڵەی یۆنانی(ئەرمەنی ،، |
| فارسی نوێ | پەنگالی | |
| ئەفغانی | پنجابی | ٥- کۆمەڵەی کەلتی. |
| | ئەلبانی | |
| تاجیکی | سەنیگالی | ٦- کۆمەڵەی بەلتیکی... |
| ئەسیتینی | سندی | ٧- کۆمەڵەی ئەلبانی«١٨»... |
| سوغدی | ئۆردر زمانی ئەدەبی پاکستانییە | |

کۆمەڵە هۆزانەی کە لەبنەڕەتدا، لەبانەکانی ئێران واتە (ئاریانا) بوونەو بوونەتە سێ بەش وەکو: ئێرانی و هیندی و ئەوروپایی، هەرسێکیان، بەکۆمەڵەی (هیندو ئەوروپایی) ناوبەرین، چونکە ئەم زاراوەیە ناوی هەرسێ کۆمەڵ و، خێزانە زمانە ناگرێتەوە، تەنها بەشی هیندی و ئەوروپاییەکە نەبێت، کە تیایدا کۆمەڵەو خێزانی زمانی ئێرانیەکانی تیادا فەرامۆش و ونکراوە، بۆیە راستتر و لەبارترو گونجاوترە بەکۆمەڵەی زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکان بووترێت:

کۆمەڵەی زمانی ئاری، چونکە مەڵبەندی، ئەو هۆزانەی کە خاوەنی ئەم کۆمەڵە زمانەن، لەناوچەی ئاریانا واتە بانەکانی ئێران- نیشتەجێ بوونە، بۆیە ئاریانا مەڵبەندە خێڵەو، هاوبەشە بۆ گەلان و زمانی ئێرانی هیندی، ئەوروپایی. شتێکی دیکەش پێویستە بوترێت، ئەم زاراوەی ئاری- یە، لەبەرئەوەی روومای (روخسار- شێوە) هەرسێ خێزانە زمانەکەی تێدایەو، هیندی و ئاریش دەگرێتەوەو ناوێکی هاوبەشە، بۆ ئەو هۆزو خێزانە، زمانی هیندی، ئێرانی، ئەوروپایی، واچاکە هەڵەی خەڵکی دووبارە نەکەینەوە، ئەم ناوە لەلایەن هیندو ئەوروپاییەکانەوە دانراوەو، ئێمەش قۆستمانەوە، ئەگینا کۆنترین بەڵگەی نووسراوی کۆمەڵە زمانی هیندو ئەوروپایی دوای زمانی سانسکریتی کتێبی (رەگ ڤیدا) بەشێوەی ئاڤێستا نووسراوەتەوە کەناوی کتێبەکەی ئاینی

زەردەشتیە شێوەی کۆنی زمانی کوردی میدییەکانەو کوردی ئەمڕۆیە «١٥» و لەناویاندا پەنجەی کۆنی و دێرینی بۆ زمانی کوردی رادەکێشرێت، ئیتر بۆچی ئێمەی کورد، خۆمان بەخەلکەوە هەلواسین، لەکاتێکدا خۆمان خاوەن سەرەتای شارستانیەت و نووسین و دامەزراندنی دەولەت و فێربوونی چاندن و کشتوکال بین«١٦». ئەم زاراوەیە لەلایەن ئەوروپاییەکانەوە، بەهۆی سیمای هاوبەشی شارستانییەتی ئەم گەلانەوە ناونراوە، بۆیە زاراوە (ئاری) یەکە فراوانترە. دوای ئەوەی شوێن و رەگەزو خێزانە زمانیی و زاراوەی گونجاوو لەبار، بەلگەی نووسراوی زمانی کوردی و مێژووی دێرینی (ئاریانا) خرایەڕوو، پێویستە نەخشەیەکی ئەم کۆمەلە زمانە بخەینەڕوو:

**تێبینی:**

هەریەک لەکۆمەلەی خێزانە زمانی ئەوروپاییەکان، لەچەند زمانێکی دی پێکهاتووە، ئێمە لێرەدا تەنها خێزانە زمانەکانی ئەو بەشەمان خستنەڕوو، بەپێویستمان نەزانی هەمووی دیاری بکەین.

دوای ئەم روونکردنەوەیە پێویستە قۆناغە مێژوویەکانی زمانە ئێرانی و هی زمانی کوردیش، بەجیاو لەسەردەمە جیاجیاکانیدا بخەینەڕوو، تا روون بێتەوە، کە زمانی کوردی خاوەن گەشەو گۆڕان و سەربەخۆیی خۆیەتی، ئەم گەشەو گۆڕانەی زمانی کوردی، لەئەنجامی گۆڕانی کۆمەلی کوردەوارییەوە، پەیدابووە، هەر گۆڕانەی لەقۆناغێکەوە بۆ سەرەتای قۆناغێکی دیکە، لەئەنجامی رووداوی مێژووییەوە هاتۆتە کایەوەو سیمای ئەو گۆڕان و قۆناغانەش، بەڕووخساری زمانەکەوە دیارەو، گۆڕانیش نیشانەی زیندوویی زمانە، ئەم گۆڕان و پێشکەوتنەی زمانی کوردی لەئەنجامی پشکنین و لێکۆلینەوەی مێژووی زمانەکەوە دیارەو بەدەرکەوتووە.

سەرچاوەکان، گۆڕانی قۆناغی مێژووی زمانی کوردی و ڕێنووسەکەی و بەم قۆناغانەی خوارەوە دیارو دەست نیشان دەکەن:

١- قۆناغی زمانی کوردی کۆن: یا دێرین، ئەم قۆناغەی زمانی کوردی، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی میدییەکان و کۆتایی دەوڵەتی هەخامەنشی «١٩» لەسەدەی (٧ پ-ز) تاکو (٥٥٠ - پ-ز)ەو، کۆنترین بەڵگەی نووسراوو، دیاری مێژوویی کتێبی پیرۆزی (ئاڤێستا)ی زەردشتییە، کە بەشێوەی ڕۆژئاوای ئێران واتە بەزمانی ئاڤێستا، شێوەی کۆنی زمانی کوردی نووسراوەتەوە بەجۆرە پیتێک لەچەپەوە بۆ ڕاست نووسراوەتەوە، ژمارەی پیتەکان (٦٠) پیتەو بریتییە لە سروودی (گاتا)ی ئاینی زەردەشتی، کە لەلابەن زەردەشت خۆیەوە وتراوەو، بریتییە لە (٢١) سروودی ئاینی، ئەم قۆناغە بەبیروڕای مێژوونووسان و زمانەوانان، تا کۆتایی دەسەڵاتدارێتی (هەخامەنشی) دەوڵەتی فارس (پارس) کەلە (٥٥٠ پ-ز) دەست پێدەکات و لەکۆتای سەدەی سێی (پ-ز) واتە ساڵی (٣٠٠) تەواو دەبێت. بەردەوامی زمانی کوردی بەشێوەی زمانی ئاینی و ڕەسمی دەوڵەتی، نزیکەی (٢٥٠) ساڵی خایاندووە، کە دەکاتە ماوەی حوکمدارێتی میدیەکان، بەڵام هەر ئەم قۆناغە کۆنەی زمانی کوردی، چۆنیەتی بەردەوامبوونی لەسەردەمی هەخامەنشییەکاندا، شێوەی دیکەی بەخۆوە گرتووە، یەکسەر و ڕاستەوخۆ بە نەمانی میدییەکان زمانەکە لەکار نەکەوتووە، بەڵکو وەکو زمانێکی ئاینی لەسەردەمی حوکمی فارسی هەخامەنش ماوەتەوە، بەڵام زمانێکی دەوڵەتی ڕەسمی نەبووە، بەڵکو زمانی یا شێوەی خواروی ئێران جێگای گرتۆتەوە، کە زمانی (پارس)یە بەپیتی بسماری نووسراوەتەوە«٢١»، واتە شێوەی کۆنی زمانی فارسی ئەمرۆ زمانی کوردی ئەو برەوەی نەماوەو لەسەرەتاوە کتێبی (ئاڤێستا)ش لەلایەن فارسەکانەوە سووتێنراوە.

٢- قۆناغی زمانی ناوەندی، ئەم قۆناغە لەدەست پێکردنی ئەشکانییەکانەوە یا ئەرشاکییەوە کە بەپەهلەوی ئەشکانی ناوی دەرکردووە، لەساڵی ٣٠٠ پ-ز دەست پێدەکات و ئەم ناوەیان بۆ وشەی (پرتو- پارثیا)«٢٢» دەگەڕێتەوە، وڵاتەکەیان خۆراسانی ئەمڕۆ یا وڵاتی (ئەشکانیەکان) دەگرێتەوە«٢٣» ئەم قۆناغەی زمانە ئێرانییەکان دووبەشە؛ بەشی یەکەمیان پەهلەوی ئەشکانییە لەساڵی ٣٠٠-٢٢٦ پ-ز، کۆنترین بەڵگەی نووسراوی، ئەو ئاوێستایەیە کە لەسەر پێستی ئاسک نووسراوەتەوەو لەچیاکانی هەورامان دۆزراوەتەوەو مێژووەکەی ساڵی (١٢٠ پ-ز)ە، بەڵام وێنەی ئەم ئاوێستا دۆزراوەیە، تاکو ئێستا دەست نەکەوتووە«٢٤» بەشی دووەمی پەهلەوی ساسانییە لەساڵی ٢٢٧ پ-ز ەوە دەست پێدەکات تا هاتنی و پەیدابوونی ئیسلام، لەسەدەی حەوتەمی زاینەوە بەردەوامە، لەم سەردەمەدا بەفەرمانی ئەر دەشێر ئاڤێستا نووسراوەتەوەو«٢٥» کراوە بەئاینی رەسمی دەوڵەت، ئەم ئاوێستایە بەرێنووسی پەهلەوی کە لەنووسینی ئارامییەوە وەرگیراوە نووسراوەتەوە.

ئەوەی لێرەدا پێویستە بوترێت، بەڵگەی گەش و دیاری زمانی کوردی ئەم قۆناغە ئاشکراو دیار نییە، کە زمانی رەسمی و نووسراو بووبێت، تەنها ئاوێستا نەبێت ئەویش بەشێوەی (زەندو پازەند)ە بۆ لێکدانەوەی ئاینی زەردەشتی بووە کە بەزمانی زگماکی زەردەشت خۆی نووسراوەتەوە، بەتایبەتی بەشی (گاتا)ی کە شێوەی کۆنی زمانی کوردی و میدییە.

زمانی کوردی یا شێوەی سەرووی رۆژئاوای ئێران لەم دوو قۆناغەدا، تا بڵێی لێڵ و تاریکە ئەو نەبێت، کە زمانی ئاخاوتن بووە، نەک زمانی نووسین، ئەم قۆناغەی زمانە ئێرانییەکان بەهاتنی ئیسلام، لەسەدەی حەوتەمی زاینی کۆتایی پێدێت و لەسەدەی نۆیەمی زایینی بەدوو سەدە دوای بڵاوبوونەوەی ئیسلام زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکانی دیکەی هاوخێزانی دێنەوە مەیدانی چالاکی

نووسین و ئەدەبیات.

٣- قۆناغی کوردی شێوەزار: ئەم سەردەمە واتە دوای روخانی ساسانییەکان، دوای دوو سەدە لەسستی زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکانەوە دەست پێدەکات کە ماوەی ئەو دوو سەدەیە واتە حەوتەم و هەشتەم تەنها زمانی ئاخاوتن بوونەو وەکو زمانی ئەدەبیات و نووسین بەدرێژایی ئەم ماوەیە دواکەوتوو بوونە، ئەگەرچی زمانی کوردی لەم ماوەیەدا وەکو زمانی ئاخاوتن زمانێکی یەکگرتوو بووە، بۆ قسە پێکەرانی کورد لەم ماوەیەدا رووی کردۆتە زمانی عەرەبی یا زمانی فارسی وەکو زمانی نووسین. دەربارەی ئیسلام و ئارەزووی کوردی، یان لەم رووەوە شکاندووە«٢٦»، لێرەدا زمانی کوردی وەکو زمانی نووسین پاشەکشەی کردووە، بەڵام کوردو ئێرانییەکان لەسەدەی نۆیەمی زاییندا، بەهۆی زیندووبوونەوەی گیانی نەتەوایەتی ناوچەییەوە«٢٧»، وردە وردە گەڕاونەتەوە سەر بەکارهێنانی زمانی نەتەوەیی و ئەدەبیاتیان پێ نووسیوە زمانی فارسی و کوردی جارێکی دیکە برەو دەسەننەوە، (فیردەوسی) لەسەدەی نۆیەمی زایینی داستانە بەناوبانگەکەی (شانامە) دەنووسێتەوەو، لێرەوە زمانی فارسی، بەپێچەوانەی قۆناغی یەکەم و دووەم وەکو زمانی ئەدەبیات لەسەدەی دەیەمدا سەرهەڵدەداتەوە، کۆنترین نووسراوی ئەم سەردەمە، کە تاکو ئێستا هەبێت و دەستکەوتبێت چوارینەکانی (بابەتایەری هەمەدانی)یە کە بەشێوەی لوڕی نووسراوەتەوە، ئەم شێوە لوڕییە لەگەڵ شێوەی هەورامیدا، وای بۆ دەچن کە پەهلەوی ئەشکانییە «٢٨». قۆناغی شێوەزاری زمانی کوردی لەدوای سەدەی نۆیەمی زایینەوە، وەکو زمانی ئەدەبی دەستی پێکردووە بە ئەلف و بێی زمانی عەرەبی و، واز هێنان لەرێنووسی پەهلەوی، کە لەنووسینی ئارامییەوە وەرگیرابوو. بەتایبەتی دوای هەڵوەشانەوەی دەوڵەتی یەکگرتووی ئیسلام، میرنشینی بچووک بچووک لەلایەن کورد خۆیەوە پێکهێنران، لەم سەردەمەدا

شێوە زارە کوردییەکان لەناوچەی میرنشینەکانی خۆیاندا، وەکو زمانی ئەدەبی لەگەڵ سەرهەڵدان و گەشەسەندنی میرنشینەکاندا سەریان هەڵداوەو گەشەیان سەندووەو، زمانی کوردی شێوە زار لەناوچەی جیاجیای کوردستاندا بوونەتە زمانی ئەدەبیات. بۆ نموونە لەناوچەی هەوراماندا هەر لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە زمانی کوردی بەرگری و بەرهەڵستی زمانی عەرەبی ئایینی ئیسلامی کردووە، بێگومان هەر بیرو باوەڕو تەنانەت ئایینیش لەسەرەتاوە خەڵک وەریناگرێت و بەلایەوە ئایینەکەی خۆی پێ باشترە لەئایینە نوێیەکە«۲۹»، بۆیە لەناوچەی هەوراماندا، بەهۆی چڕوپڕی ناوچەکەی و سەختی سروشتە ئاڵۆزەکەیەوە ئاینی ئیسلام و زمانی عەرەبیش لەناو خەڵکدا زوو جێگای نەبۆتەوەو خەڵکەکەی لەسەر رێو و شوێنی ئایینە کۆنەکەی باوباپیریان کە زەردەشتییە رۆیشتوون درەنگتر ئایینە نوێیەکە وەرگیراوە.

بەڵگەی راستیش بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونە ئەوەیە، ئەدەبیاتی ئەم ناوچەیە، جیا لەهەموو ناوچەکانی دی، زیاتر باری ئایینی وشەی کۆنی زمانی کوردی و هی ئاینی زەردەشتی و بەکارهێنانی کێشی خۆماڵی نەتەوەیی، واتە هی گۆرانییە کۆنە فۆلکلۆرییەکان، کە بریتیە لەهۆنراوەی هەشت بڕگەیی و دەبڕگەیی syllable ، لەشیعردا لەناوچەی هەورامان یا لەشێوەزاری گۆرانی بەکارهاتووەو«۳۰». پیرشالیاری زەردەشتی تا ماوەیەک دوای بڵاوبوونەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام خەریکی بڵاوکردنەوەی ئایینە کۆنەکە بوو بۆیە نموونەی دەیان وشەی کۆنی زمانی کوردی لە شێوەی ئەدەبیاتەی گۆران/ هەورامانی وەکو: پیرشالیار، موغ، وشەکانی ئامۆژگاری ئاینی و پەیڕەوی ئاینی کۆن بەدی ئەکرێ بەهەمان شێوە دوای وەرگرتنی ئاینی ئیسلام شیعری تەریقەت و ئاینی لەم زارەدا بردوی هەبووە«۳۱». ئەمجا ئەم قۆناغەی، شێوە زارەی زمانی کوردی، لەناوچەی گەورەی هەر میرنشینێکی کوردیدا، وەکو زمانی ئەدەبی

سەریهەڵداوەو، ئەدەبیاتی کوردی لوڕی هەروامانی، لەنیوەی دووەمی سەدەی چوارده هەم وەکو لای مەلا پەریشان، خاوەن دیوانی (پەریشان نامە) کرمانجی سەروو/ بۆتانی نێوان سەدەی ١٥-١٧ ز، کرمانجی ناوەڕاست/ نالی و سالم و کوردی لەسەدەی ١٩ز، بەڵگەی ئەم راستیەن و لەگەڵ نەمان و روخاندنی هەر میرنشینێکدا زمانە ئەدەبییەکەش وردە وردە لەکارکەوتووە.

ئەم قۆناغە لەدوای سەدەی (١٩)ز ەوە، بەتایبەتی لەسەدەی دەیەمی زایینەوە دەست پێدەکات و، لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا کۆتایی پێدێت و، زمانی کوردی پێدەنێتە قۆناغی زمانی نووسین و رۆژنامەگەرییەوە.

٤- قۆناغی نوێی زمانی کوردی: ئەم قۆناغە، لای هەندێک بەسەرەتای سەدەی بیستەم دادەنرێت، بەڵام راستیەکەی دەبێت دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان لە٢٢/٤/١٨٩٨ج وەکو مێژووی دەستپێکردنی زمانی نووسین بەکوردی و، سەرهەڵدانی رۆژنامەگەری کوردی، وەکو رووداوێکی رۆشنبیری و زمانی و مێژوویی و نەتەوەیی، بۆ مێژووی کوردو بۆ زمانەکەی، وەرچەرخان و سەرەتایەکی گەورەی دەستپێکردنی ژیانێکی نوێیە، بۆ کوردو زمانەکەی و بۆ شارستانیەتی نوێی کورد.

بۆیە دەبێت ئەم رووداوە رۆشنبیرییە تازەو نوێیە سەرەتای قۆناغێکی دیاریکراوبێت، راستە ئەم قۆناغە، یا قۆناغی چوارەمی مێژووی زمانی کوردی، بەقۆناغی بژارەکردنی زمانی کوردی لەوشەی بێگانەو سەرهەڵدانی شێوازی نوێی زمانی نووسینی کوردی ناودەبرێت، بەڵام ئەم تایبەتیەتەی پاکردنەوەی زمانەکە، بەهۆی سەرهەڵدان و بەردەوام بوونی رۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانەوە دەستی پێکردووەو زمانی نووسینی پەیدابووە، وردە وردە لەگەڵ زیادبوون و بەردەوامی رۆژنامەگەری کوردیدا، زمانەکە پوختەبووەو، خۆی لەوشەو دەربڕینی زمانی بێگانە، پاک کردۆتەوەو لەگەڵ رەوتی ژیانی نوێدا، هەنگاوی بەرەو پێشەوە

ناوە.

لێرەدا، بۆ چەسپاندنی ئەم بۆچوونە، سەیری زمانی ڕۆژنامەو گۆڤارە جیاجیاکانی کوردی دەکەین، لەرۆژنامەی کوردستانەوە بگرە، تا ڕۆژنامەی پێشکەوتن و ڕۆژی نوێ، ئومێدی ئیستقلال، بانگی هەق، گۆڤاری گەلاوێژ و تا ئێستاش ئەو قۆناغە زمانە کوردییە پەتییە، لەگۆڕان و داهێنان و چەسپاندن و نوێبوونەوەی شێوازی نووسینی کوردییە. بۆیە کۆتایی سەدەی نۆزدەو سەرەتای سەدەی بیستەم بەقۆناغی چوارەم و نوێبوونەوەی زمانی کوردی دادەنرێت.

لەکۆتاییدا، پێویستە ئەوە بوترێت، زمانی کوردی زمانێکی سەربەخۆیە.

پاشکۆو زاری هیچ زمانێکی دی نییە، بەڵگەی نووسراوی زمانی کوردی لەمێژوودا (٢٥٠) ساڵ لەزمانی فارس کۆنترەو، پەیوەندی زمانی کوردی بەزمانی فارسییەوە وەکو پەیوەندی زمانی فارسی بەکوردییەوە وایە، ئەم پەیوەندییەش پەیوەندی خزمایەتی و خێزانە زمانییە، چونکە ئەم زمانانە، لەکۆنەوە لە شوێنێکدا بوونەو بلاوبوونەتەوە وشەی هاوبەش لەناو هەموو کۆمەڵ و خێزانە زمانێکدا هەیە، بەڵام چۆنیەتی دەربڕینیان لەڕووی دەنگسازییەوە، بۆ دڕکاندنی وشەکان کوردێک لەگەڵ فارسێکدا یا لەگەڵ بەلووجی و هیندی و جەرمانییەکدا جیاواز وشەکان دەردەبڕن.

کەچی لەگەڵ ئەوەشدا وشەو زاراوەی ئەم زمانانە، لەگەڵ یەکتردا بەزۆری جیاوازن و هەر زمانەی وشەو زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە، لێرەوە دەپرسین، ئایا هەموو وشەو زاراوەکانی ئەم زمانانە، یەکن بێگومان نەخێر، پاشان ئیتر چۆن زمانێکی بەڵگە کۆنتر و خاوەن دەوڵەت، زاری زمانێکی ژێر دەسەلات، وەکو سەردەمی میدییەکان کە فەرمانڕەوابوو بەسەر هەموو گەلانی ئێراندا بەکار دەهێنێت«٣٣» لەکاتێکدا خۆی خاوەن زمان بێت. یا پاش ڕوخاندنی میدییەکان، لەسەردەمی هەخامەنشی و بەتایبەتی لەسەردەمی ساسانییەکان،

فەرمان بەنووسینەوەی ئاڤێستا دەدرێت.

لەلایەکی دیکەوە، چۆن زمانێک دەکرێتە پاشکۆی زمانێکی دیکە کەلە کۆمەڵەو خێزانە زمان و رەگەزێکی جیاوازی دیکە بێت و زمانی کوردی بەتورکی شاخاوی دابندرێت، لەکاتێکدا ئەم دوو زمانە هەریەکەی لەخێزانە زمانێکی جیاوازن زمانی کوردی هەروەکو سێ سەدە لەمەوبەرەوە سەلمێنراوە، لەخێزانی زمانی ئێرانییەکانەو سەربەکۆمەڵەی هیندۆ ئاری کۆنە، بەڵام زمانی تورکی لەکۆمەڵە زمانی ئوراڵییە- یا (ئوراڵ- ئەلتیکی)یشی پێدەڵێن، ئەم کۆمەڵە زمانە (ئەلتیک)یە لەزمانی دیکەی وەکو تورکی، مەگۆڵی، تەنۆکوسی و بەشی (ئەلیتک- ئالتایی) ئەم کۆمەڵە زمانەش لەزمانی فنلندی ئەستۆنی، مەجەری دەکرێتەوە، ئیتر ملهوڕان و رەگەز پەرستان، چۆن دەتوانن ئەم راستییە مێژوویی و زانستییە بشارنەوە، بەری رۆژ بەبێژەنگ بگرن، یا خۆیانی لەبەرامبەر گێل بکەن و کوردو زمانەکەی، کە ژمارەی دەگاتە چل ملیۆن ئادەمیزاد بەدەیان و سەدان و هەزاران و زاناو داناو هونەرمەندی تێدایە، نکولی لەبوونی بکەن و هەندێک بەشاخاوی و هەندێکی دیکە بەجنۆکەو کەمایەتی ناوی ببەن، لەکاتێکدا کورد خاوەنی هەموو بنەماکانی نەتەوەیە لەزمان، مێژوو، زەوی، چارەنووسی هاوبەش، ژیانی کۆمەڵایەتی هاوبەش....هتد. هەموو ناوو ناتۆرەو بەڵگەی بێ بنەمایان لەپێناو بەردەوامیی چەوساندنەوەو، پتر حەڵاڵکردنی نیشتمانی کوردە بۆخۆیان.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان:


١- سۆکۆلۆف. زمانی ئاڤێستا، وەرگێڕان و لێدوان و بەراوردکردنی لەگەڵ زمانی کوردی ئەمڕۆدا، محەمەد ئەمین هەروامانی، بەغدا، ١٩٨٨، ل٢٢ .

٢- فؤاد حمه خورشيد، اللغەالكرديه، التوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد، ١٩٨٣، ل١٥ .

٣- زبير بلال اسماعيل، مێژووی زمانی کوردی، وەرگێڕانی، یوسف رەئوف عەلی، بەغدا، ١٩٨٤، ل٦٠.

٤- پاکیزە رەفیق حیلمی، لەکوێوە دەست بکەین بە زمانی کوردی، ژمارە (١)، بەغدا ١٩٧٣، ل٢٠٣ .

٥- بڕوانە سەرچاوەی ژمارە (٢)، ل١٥ .

٦- سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل١٧ .

٧- هەمان سەرچاوە، ل١٨ .

٨- د. کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان، گۆڤاری زانیاری ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩٧١، ل١٦-١٧ .

٩- سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل٥٢ .

١٠- سەرچاوەی ژمارە (٢)، ل١٥ .

١١- بڕوانە: أ/ سەرچاوەی ژمارە (١)، ل١٥ .

ب/ محەمەد ئەمین هەروامانی، مێژووی ڕێبازی زمانی کوردی، بەغدا ١٩٩٠، ل٦٧ .

١٢- د. عبدالرحمن قاسملو، کوردستان و کورد، وەرگێڕانی عبدالله حسن زادە، لە بڵاوکراوەکانی بنکەی پێشەوا، ١٩٧٣، ل٣٩ .

١٣- دريه عوني، عرب واكراد، خصام ام وئام، مصر، دار الهلال، ١٩٩٣ص٢٧ .

١٤- سەرچاوەی ژمارە (٢)، ل١٣ .

١٥- لەم بارەیەوە تۆفیق وهبی لەوتاری «اصل الاكراد و لغتهم»، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی ژمارە (٢-٢)، بەغدا ١٩٧٤، ل٢٤ دەڵێ: «ئێمە بەتەواوی بڕواو قەناعەتمان بەڕاستی ئەو بیرە هەیە کە دەڵێ: زمانی کوردی زنجیرەیەکی ڕاستەوخۆیە لەزنجیرەی زمانە ئارییە کوردییە کۆنەکان و ئاڤێستاییە مادییەکان (واتە- ماد- نووسەر).

١٦- جۆناتان راندل، امة في شقاق، بيروت لبنان، ١٩٩٧ هێمای بۆ ئەمە لەپێشەکی کتێبەکەیدا کردووە.

١٧- بۆ ئەم دابەشکردنە، سوودم لە سەرچاوەی ژمارە (٢)، (٣) هەروەها د. علی عبدالواحد وافی، علم اللغە، ١٩٧٠ وەرگرتووە.

١٨- بۆ کۆمەڵە زمانی زنجیرە (٧،٦)ی خێزانە زمانە ئەوروپاییەکان کە لێرەدا ئەم ژمارەیەی وەرگرتووە، بڕوانە: د. پاکیزە رەفیق حیلمی، زانیاری زمان، دەفتەری کوردەواری، بەرگی (٢) بەغدا، ١٩٧٠، ل١٠٠-١٠٦ .

١٩- محەمەد ئەمین هەورامانی، مێژووی رێبازی زمانی کوردی، ل٢٠ .

٢٠- پاکیزە رەفیق حیلمی، سەرچاوەی ژمارە (٤)، ل ٢٠٣ .

٢١- هەمان سەرچاوە، ل٢٠٩ .

٢٢- هەمان سەرچاوەو لاپەڕە.

٢٣- سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل٦٢ .

٢٤- بڕوانە سەرچاوەی ژمارە (٤)، ل٢١٠ .

٢٥- سەرچاوەی ژمارە (١١ /أ)، ل١٤ .

٢٦- سەرچاوەی ژمارە (١٣)، ل٢٨ .

٢٧- سەرچاوەی ژمارە (٤)، ل٢٠٣ .

٢٨- سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل٦٥ .

٢٩- سەرچاوەی ژمارە (١١ /أ)، ل٤٢ .

٣٠- بەکارهێنانی کێشی شیعری، لەشیعری کوردی قۆناغی کلاسیکیدا بریتی بووە لەبەکارهێنانی کێشی عەروزی عەرەبی کە بریتییە لە (١٦) کێش و (١٥) یان... خەلیلی ئەحمەدی فەراهیدی دایناوەو دوانیان هی ئەخفەجە، بەڵام کوردەکان بەزۆری حەوتیان بەکارهێناوە وەک: هزج، رەمەل، بسیط، .... هتد، هەرچی کێشی شیعری شێوەی گۆران/ هەورامانییە بەکێشی خۆماڵی وتراوە، مەبەست لەئەدەبیاتی کۆنی ئەو بەشەیە.

٣١- بیروڕای دکتۆر عزەدین مستەفا رەسول، لەکتێبی زمان و ئەدەبی کوردی/ ١٩٧٨/٦، ل١٧٣-١٧٥ .

٣٢- مامۆستا محەمەد ئەمین هەورامانی سەرەتای سەدەی بیستەمی بۆ قۆناغی نوێی زمانی کوردی داناوە، باشتربوو دەرچوونی رۆژنامەی کوردستان لە ١٨٩٨ لەبیر نەکردایە کە سەرەتای ئەو قۆناغە نوێییەیە.

٣٣- د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەک لەمێژووی گەلی کورد، بەغدا، ١٩٨٥، ل١٨ .

+ پەندو وتەیەکی کوردەوارییە کە دەڵێ: «بەری رۆژ بەبێژەنگ ناگیرێت» واتە راستی ناشارێتەوەو دێزە بەدەرخۆنە ناکرێت.

+ بڕوانە سەرچاوەی ژمارە (٢)، ل١٣ .

# چاوگ و فرمان
# کامیان سەرچاوەو بنەڕەتن؟

وشـــەکـــانی زمـــان لە رووی پێکهـــاتـن و دروست بوونـەوە، بە هۆی چەند ڕێگایەکـەوە ئەنجام دەدرێت(١) و ئەم لێکۆڵینەوەیە تەرخـانە بۆ دیاری کـردنی سەرچاوەو، بنکەی ئەو دروستبوونە کە لە زمانی کوردیدا وشەکانی بە ڕێگای (لێکدان)و (دارشتن)ەوە دادەڕێژرێن و، ئەو سـەرچاوەیەش لەڕووی دارێشـتنی وشەوە، چاوگ و فرمانەو لە دەمی کۆنەوە دوو ڕاو بۆچوونی لەیەکتر جیاواز، لەم ڕووەوە، لای زمانەوانە عارەبەکانەوە، لە دوو قـوتابخانەی زمانەوانی بەسراوی و کـوفـیـیـەکـانەوە بەوەی ئایە چاوگ و فـرمـان کـامـیـان سـەرچاوەی بنەڕتی وشە دارێشـتنە، سـەری هەڵداوە. بەڵام ئێـمـە ناچینە ناو ئەم باسـەوە، چونکە زمـانی عـارەبی جـیـاوازە لەگـەڵ؛ کـوردیداو لەیەک زمـان نین، عـارەبی وەکـو زمـانـێکی سامی تایبەتێـتی خۆی هەیە کوردیش وەکـو ئاریایی کۆن تایبەتێـتی و ڕێگای خـۆی هەیە، ئەگـەر چیش زمـانی کـوردی لەڕووی پێـکهـاتنی وشـەو زاراوەوە زمـانێکی لێکدراوە، واتە زۆربەی وشـەو زاراوە پێکهـاتووەکـانی، بە ڕێگای لێکدانی دوو وشـەوەیە، کـە گـۆڕانیش تیـایدا روو دەدات یا بێ گـۆڕانە، بەڵام دارشـتنەوەش وشەو زاراوەی لێوەپێکدێت، کە زیادەی وشـەدارێژ Affix بەهۆی رەگی وشەوە وشەی تازەی لێ پێکدەهێنرێت.

وەک: سەوز+ ە ـــــ سەوزە، خـۆر + ە ـــــ خـۆرە، بۆر+ ە ـــــ بۆرە+ رەش+ ایی ـــــ رەشایی، شار+ ی ـــــ شاری، سەرباز+ گە ـــــ سەربازگە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە زمانی کوردی، وشەی دارێژراوی بە رێگای دارشتنەوە لێوە وەردەگـیـرێت، بەڵام سـروشـتـی زمـانـی کـوردی زمـانـێکی لێکدراوە، ئەم باسـەی ئێـمـە، تایبـەتە بەوەی ئایا چاوگ یا فـرمـان، کـامـیـان سـەرچاوەی دارێشـتنی وشـەیەو لێـرەدا ئەم باسـە روون ئەکـەینەوە کـە چاوگ بە هۆی رەگـەکـەیەوە، کـە بنـاغـەی وشـە پێکدەهێنی، سـەرچاوەی دارێشـتنی وشـەی تازەیەو ژمـارەیەک وشـەی وەک فـرمـان خـۆی، ناوی بکەر، ناو بەرکـار، ناوی چـاوگ ناوی شـوێن، ناوی ئامـێـر، ناوی لێکدراو (لە بنـاغـەی چاوگی لێکداراوەوە) هەروەها وشـەی تری لێوە وەردەگیرێت.

ئەم بـاسـە هەوڵێکە، لە کـەم و کـورِی بە دوور نابێت، بەڵام ئەگـەر هەڵەش بێت، یا بە دڵی نووسەرانی تریش نەبێت، ئەوا هەوڵی تری بەرەو لێکۆڵینەوەی تر دێنێـتەکایەوە، ئەگەر راستیش بێت ئەوا باشترو کەلێنێک لە بواری بۆشایی زمـــانی کـــوردی روون دەکـــاتەوە. چومـــسکی تـا ســاڵی ١٩٥٧ لـە هەوڵی بەردەوامـدابوو، بۆ دۆزینەوەی رێگای راسـتی شـیکردنەوەی زمـان. هەواڵەکـانی پێش ئەم مـێژووەی تورِهەڵداو بیـردۆزی رێگای تازەی هێنایەکایەوەو بە دنـیـادا بەڵاوبۆوەو بیردۆزەکانی تری خۆی پووچەڵ کردەوە، ئەم باسە رێگای تر دەکاتەوە، گرنگ ئەوەیە رێگای لێ نەگیرێت بەوەی لەگەڵ بۆچوونی کەسانی تردا جیاوازە، بۆچوونی جـیـاواز نیـشـانەی لیـکۆڵینەوەی زانسـتـیـیـە. پێش ئەوەی بێـینە سـەر باسـەکـە ئاورێک لە بارەی یاسـاو شێـوازی دارشتن و پێکهـاتنی وشـەی زمـانی ئینـگلیـزی دەدەینەوە، چونکە ئـەم زمـانـە، ئەگـەر چی لەگـەڵ زمـانی کـوردیدا هەریەکەی تایبـەتێتی خۆیان هەن، بەڵام جیـاوازی دەسـتووریان لە نێواندا بەدی دەکرێت.

# بیروڕای زمانەوانە ئەوروپاییەکان (ئینگلیزەکان)

**- لە بارەی بنەڕەت و سەرچاوەی داڕێشتنەوە-**

زمانەوانە ئەوروپاییەکان بەتایبەتی ئینگلیزەکان لە بارەی ئایا چاوگ وفرمان کامیان سەرچاوەی داڕێشتن بێت، لەم رووەوە ڕێبازی ئینگلیزەکان، ڕێگایەکی تایبەت بە پێچەوانەی زمانەوانە عارەبەکانیان گرتۆتە بەر، کە ئەویش ڕێگای بەکارهێنانی مورفیمە (Morphem) واتە بە هۆی مۆرفیمەوە ژمارەیەکی زۆر لە وشە دادەڕێژێت و پێک دەهێنرێت، مۆرفیمیش بەلای ئینگلیزەکانەوە، راستێکەیشی هەروایە دوو جۆرە، جۆرێکی مۆرفیمی سەربەخۆی واتادارە Feer Morphem- (وشەی تەواو)و جۆرەکەی تریش مۆرفیمی بەند Bound Morphem- واتە پێشگرو پاشگر. نیشانەی دەچنە سەر مۆرفیمی سەربەخۆ یا ڕەگی وشە، وشەی جۆربەجۆری تازە بە هۆیانەوە واتە بەهۆی یارمەتی پێشگرو Suffex پاشگرەوە Prefex دروست دەبێت، کە لە زمانەکەدا ئەرکی جیاجیای گرنگ، لە رووی ڕێزمان و واتاوە دەبینن؛ ئەم زمانەوانە ئینگلیزانە دوو مۆرفیمی وەک ڕەگ Root و قەد STEAMدەکەنە بنەڕەتی دروست بوونی وشە بەهۆی زیادەوە، یەکەمیان بناغەو ریشەی وشەیە، کە بەشێوەیەکی گشتی پارێزگاری واتای وشەی چاوگەکەی کردووە، ئەگەرچی ڕەگ بەتەواوی واتا نابەخشێت، بەلام پاشگرو پێشگر بەبێ ئەوان هیچ دەورێک لە زماندا نابینن، نموونە: ڕەگی چاوگی (نووسین)- نووس+ ەر ـــــ نووسەر ناوی بکەری دروست کردووە.

یا بەم شێوەیەی خوارەوە، فرمانی لێوە بەیارمەتی پێشگرو راناوی لکاو دروست بووە؛ وەک: نووسین = ڕەگەکەی (نووس)ە بەهۆی نیشانەی بەردەوامی (دە)ەوە بەیارمەتی راناوی لکاو فرمانی رانەبردووی لێ داڕێژراوە (دەنووسم).

بۆ تافی رانەبردوو: قەدی چاوگ و راناوی لکاو، فرمانەکە دروست دەکات؛ بەم شێوەیە:

نووسین+ نووسی + م ــــ نووسیم.

بیروڕای ئێمە لەبارەی زمانەوانە ئینگلیزەکانەوە، ئەگەرچی زمانی کوردیش لە کۆمەڵەی زمانە ئارییەکانە خزمایەتیان هەیە، بەڵام هەر زمانە تایبەتێتی خۆی هەیە لە دەستووری وشە پێکهاتن چ بەڕێگای لێکدان یا دارشتن.

دروستبوونی یا دارێشتنی وشە لە زمانی ئینگلیزیدا بە رێگای مۆرفێمەوە بەم شێوەیەیە، کە (رەگ - Root)و قەد Stem لەوشەدا دیاری کردووەو بە هۆی مۆرفیمی بەندەوە وشەی لێوە دروست دەکەن، بەم شێوەیە:

رەگ + پاشگری بەند ــــ Teach + er ــــ Teacher ئەگەر وشەی Teacher کە بەهۆی پاشگری er ەوە بۆتە قەدی وشە ناویشە یان وەک Teacheo کە ed ەکەی کردوێتی بەقەدی فرمان و بەلادانی (d) ەکە وشەی تری لێوە بە هۆی پاشگرەوە دادەرژێت، یان وەک (, Shawing , Showen Showed) هەر چەندە مۆرفیم لە زمانی کوردیشدا وەک ئینگلیزی دەور دەبینێت لە دارشتندا، بەڵام چاوگ لە زمانی کوردیدا بۆتە سەرچاوەو بنەڕەتی دارێشتن؛ چاوگ مۆرفێمەکانی بەشێوەیەکی وا چوونەتە پاڵ یەکتر لە ناو قاڵبی چاوگەکەدا تواونەتەوە(٨)، ئەمەش بەڵگەیەکە، کە چاوگ لە زمانی کوردیدا وشەیەکی تەواوەیە Words ئەگەرچی زمانی کوردی بە زمانێکی لکاو (ag-glutinative) دادەنرێت و، بۆیە چاوگ وەک وشەیەک لە زمانەکەدا بە وشەیەکی سادەی واتادارو سەربەخۆ دادەنرێت و، بە لادانی (ن)ەکەی و نیشانەکەی، رەگ و قەدەکەی واتا نابەخشن و لە پاشاندا بە هۆی راناوی لکاو و پێشگرو پاشگرەوە، فرمان و وشەی دارێژران لەم وشە تواوانەوە Fastonel کە چاوگن دروست دەبن وەک لە چاوگی: (خواردن) فرمانی (خواردم) و

(دەخۆم)و ناوی بکەری (بخۆر)و ناوی چاوگی (خۆراک)ی لێوە وەردەگرین. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە فرمان لە چاوگەوەیە، نەک چاوگ لە فرمانەوە وەرگیرابێت. ئەمە لە شێوەی جیاواز جیاوازدا روون دەبێتەوە، بۆ نموونە ئەگەر بێتو (ن)ی چاوگەکان لابدەین، بەشێوەیەکی گشتی (قەدی چاوگی تێنەپەڕ بۆ کەسی سێیەم و قەدی چاوگی روودان بەهۆی ئەوەی کە بکەرەکانیان هێزێکی سروشتین و بێ وەرگرتنی راناوی لکاو دەوری خۆیان دەبینن، هەروەها قەدی چاوگە یائیەکان بە هۆی کۆتایی هاتنیان بەدەنگی ی قەدەکان و بەوەی کە کەسی سێیەمی راناوەکان، بە پیتی (ی) کۆتاییان هاتووە، ئەو دیاردەیە دەبێتە هۆی ئەوەی کە قەدەکانیان ببنە فرمان و واتا ببەخشن، ئەگینا بە پێچوانەوە قەدی چاوگ (Steam) بەگشتی واتا بەخش نین و کاتی فرمانەکانیش دیارنین و ناتوانرێت بەبێ راناوی لکاو، وەک وشەیەکی واتادار دابنرێن ئەمە بێجگە لەوەی کە تافیان نییە؛ نموونە:

کوشتن: بەلادانی (ن)ی چاوگەکە، قەدی (کوشت) دەمێنێتەوە کە نەکات و نەواتای دیارو ئاشکرا نییە، واتە پێویستی بە پێوە لکاندنی راناوی لکاو هەیە، کە دەبێتە هۆی دیاری کردنی تاف و واتاکەی وەک: کوشتم، کوشتت، کوشتی، کوشتمان، کوشتتان، کوشتیان...

هەروەها کردن: کرد دەبێتە: کردم، کردن، کردمان، کردتان، کردیان.

بردن: برد بێ تاف و واتایە بە هۆی راناوی لکاوەوە دەوری واتاو دیاری کردنی دیاری دەکرێت وەک: بردم، بردت، بردی- بردمان، بردتان، بردیان.

## بیروڕای زمانەوانە کوردەکان

زمانەوانی کورد تا ئێستا لە بارەی ئایا «چاوگ یان فرمان کامیان بنەڕەت و سەرچاوەی داڕێشتن»ن یا لەم بارەیەوە، بە هەر ناونیشانێک بێت لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی سەربەخۆیان ئەنجام نەداوە، مەگەر لەناو لێکۆڵینەوەو بابەتی تردا نەبێت، ئەویش بە سەرپێیی و لابەلایی و بێ هیچ لێکۆڵینەوەیەکی پراکتیکی ئەنجام داروو بێ نموونە، چاوگیان داناوە بە سەرچاوەی وەرگرتنی فرمان و وشەی تری لەم بابەتەوە بێت. هەندێک یانیش کەبەشێکی کەمن وەک بەشی یەکەم بێ پێشاندانی هیچ بەڵگەیەک فرمانیان بە سەرچاوەی داڕێشتن و چاوگ لێوە وەرگرتنیان داناوە، بەڵام لە ناو کتێبی ڕێزمانە کوردییەکاندا، لە بەشی وشەسازیدا Morphology تەنها لە باسکردنی داڕێشتنی (ناو، ئاوەڵناو، فرمان) بێ روونکردنەوەی پێویست لە چاوگەوە ئەو وشانەیان وەرگرتووە(٩).

بۆیە پێویستە ئەم باسە لە زمانی کوردیدا بە پێی تایبەتێتی زمانەکە لای لێ بکرێتەوەو یەک لایی کردنەوەی پێویستە.

لەبەر نەبوونی لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەم بارەیەوە، بۆیە ناتوانین لە بواری زمانەوانانی کوردا بیروڕای خۆمان دەست نیشان بکەین و هەڵیان بسەنگێنین و یەکسەر دێمە سەر لێکۆڵینەوەکەی خۆم.

## چاوگ یان فرمان کامیان سەرچاوەو بنەڕەتن؟

چاوگ وەک بەشێک لەبەشەکانی ئاخاوتن ناوی کردارێکی گشتی دەبەخشێت و نەبەستراوە بەکەس و کاتەوەو گەردان ناکرێت. لە زمانی کوردیدا چاوگ هەڵدەگرێت ببێت بە بنەڕەتی سەرچاوەی داڕێشتنی هەندێک وشەو فرمان؛ چاوگ و فرمان هەردووکیان تایبەتێتی رووداوو کرداریان تێدایەو، هەرچی

فرمانه تایبەتێتی تری وەک کەس و کاتی تێدایە، کە لە چاوگ دا بەدی ناکرێت، کەواتە شتێکی هاوبەش لە نێوانیاندا بێت کردارو رووداوە، کە وەکو تایبەتێک لەو وشە دارێژراوانەی وەک: ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر، هەروەها ئاوەڵناوو هەندێک ئاوەڵفرمان یشدا هەیە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و دادەرێژرێن، کە تا ئێستا ناکۆکی لە سەرە، بەوەی ئایا چاوگ یان فرمان کامیان سەرچاوەی ئەو دارێشتنەبن؛ یا فرمان خۆیشی وشەیەکە لە چاوگەوە دارێژراوە. لەناو ئەو وشانە، هەموویاندا تایبەتییەکی هاوبەشی وەک کردار (عملیة)و رووداو یان تێدایەو بە نەبوونی کەس و کاتی فرمان تیایاندا؛ ئەوە دەگەیەنێت کە ئەو وشانەی سەرەوە، فرمانیش لە گەڵیاندا لە چاوگەوە دادەرێژرێن و چاوگیش بنەڕەت و سەرچاوەی ئەو دارێشتنەیە، لەبەر ئەم هۆیانەی خوارەوە:

١- چاوگ لە رووی واتاوە لە زماندا واتای شوێن و سەرچاوەی لێوە وەرگرتن دەبەخشێت، یاخود بە واتای (بنەوان)دێت کە واتای سەرچاوەی ئاو دەگەیەنێ.

٢- چاوگ واتایەکی گشتی، رووداوی کردارێکی بێ کاتی تێدایە کە لە وشە دارێژراوەکانیەوە بە هەمان واتا بەدی دەکرێت، بەمە دەرەکەوێت لە وشەی گشتییەوە وشەی تایبەتی وەردەگیرێت.

وەک: نووسەر خاسیەتێکی تایبەتییە لە چاوگی (نووسین)ەوە دارێژراوە سیفەتێکی تایبەتی خاوەنەکەی دەگەیەنێت و(١٠) چاوگەکەشی کردارو رووداوێکی گشتی دەبەخشێت هەروەها (کڕیار، فرۆشیار، فرۆشراو ...).

٣- چاوگ وشەیەکی واتاداری سەربەخۆیە(١١)، ئەگەرچی لە سێ مۆرفێم پێکهاتووە، بەلام بە شێوەیەکی وا چوونەتە پاڵ یەکتر، لەناو قالبی دارێشتنی وشەکەدا بە جۆرێک تواونەتەوە ئەگەر مۆرفیمێکیان بۆ نموونە وەک (ن)ی

چاوگەکە لاببرێت ئەوا واتاکەی تێک دەچێت تەنها لەو چاوگانە نەبێت کە فرمانەکانیان لە چاوگی روودان و (١٢) چاوگە یائیەکانەوە وەردەگیرێن، بە هۆی ئەوەی ئەم جۆرانە بکەرەکانیان دیارنین و لە گەردان کردن و داڕێشتنی فرمانی رابردوودا، بێ بەکارهێنانی راناوی لکاو، قەدی چاوگەکانیان لە حاڵەتی کەسی سێیەمی تاک دان، وەک سووتا، برژا لە (سووتان- برژان)ەوە یا نووسی، کڕی لە (نووسین- کڕین)ەوە واتا دەبەخشن، ئەگینا جۆرەکانی تر نەکات و نە واتایان ئاشکرا نین وەک: (کردن: کرد) بێ راناوی لکاو نەکەس ونەکاتەکەی ئاشکراو دیارنین.

کوشتن: کوشت، خواردن: خوارد، کێلان: کێلا، ڕێشتن: ڕشت، گروون: گروو، بەستان: بەستا) ئەم قەدی چاوگانە بەبێ بکەر (راناوی لکاو) واتاکانیان دیارنین و دەوریان وەکو فرمانێکی واتادارو وشەیەک لە زمانی کوردیدا نین و بێ واتان، تەنانەت ئەگەر وشەیەکی واتاداریشیان لە بەکارهێناندا بخەیتە تەنیشتەوە بەبێ راناوی لکاو بەهەمان شێوەی سەرەوە وەک وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ واتایان نییە.

نموونە: نان خوارد، دارەکە بەستا، ئاهەنگ گێڕا، پیاوەکە کوشت، ئاوڕشت.

ئەم قەدی چاوگانە ئەوە دەسەلمێنن کە فرمان بە تەنها بێ راناوی لکاو ناتوانرێت بە وشەیەکی سەربەخۆ دابنرێن و واتاو کاتەکەیان دیارو ئاشکرا بێت، واتە فرمان وشەیەکی سەربەخۆی یەک ریشەیی یا یەک مۆرفیمی نییەو بۆ دەمی رابردوو دوو مۆرفیمی وەک قەدی چاوگ و راناوی لکاو کە سەر بە بەشێکی ئاخاوتنی وەک راناوی کەسین، لە داڕێشتنی دروست بوونیدا بەشدار دەبێت و، بۆ دەمی رانەبردوو و داخوازیش سێ مۆرفیمی وەک (دە)ی بە بەردەوامی و رەگی چاوگ و راناوی لکاوو، بۆ داخوازیش مۆرفیمی (ب)ی داخوازی و رەگ و راناوی لکاو بەشداری داڕێشتنی دروست بوونیان دەکەن بەم شێوەیە:

چاوگ: نیشانەی بەردەوامی + رەگی چاوگ + راناوی لکاو ـــ فرمانی رانەبردوو.

نووسین: دە + نووس + م ـــ دەنووسم

رۆیشتن: دە + ڕۆ + م ـــ دەڕۆم

بۆ داخوازی:

چاوگ: پێشگری (ب) ئەمری+ رەگی چاوگ+ راناوی لکاو ـــ فرمانی داخوازی.

نووسین: ب + نووس + ە ـــ بنووسە بۆ کەسی دووەمی تاک

ب + نووس + ن ـــ بنووسن بۆ کەسی دووەمی کۆ

بەلادانی هەر مۆرفیمێک، لەوانە وەک نیشانەی رانەبردوویی و داخوازی و راناوی لکاو، رەگەکان (Root) بە تەنها ئەگەرچی رەگ لە زمانە هیندۆ ئەوروپاییەکاندا پارێزەری واتای وشە گشتییەکەیە، هیچ واتایەک نابەخشن. لێرەدا دەردەکەوێت کە فرمان خۆی وشەیەکی دارێژراوەو، لە رووی دروست بووەنەوە، بە یارمەتی مۆرفیمی ترەوە دروست بووە؛ بۆیە وشەیەک کە سەربەخۆ نەبوو لە رووی واتاوە، ئیتر چۆن دەبێت بە بنەڕەت و بناغەو سەرچاوەی دارێشتن و وشە لێوە وەرگرتن کە رەگەکەی لە چاوگەوە بۆ دارێشتنی وەرگیراوەو، پارێزەری واتا گشتییەکە چاوگە نەک هی واتای فرمان، چونکە فرمان واتاکەی بۆ کردارێکی تایبەتییە، کە لە کردارو رووداوە گشتییەکەی چاوگەوە بناغەو رەگ و واتاکەی وەرگیزاوە.

هەرچی چاوگە هەروەکو لە پێشەوە وتمان وشەیەکی سەربەخۆی واتادارەو لە زمانی کوردی و زمانی تریشدا حاڵەت و رووداوو، واتاو کاتێکی گشتی دەبەخشێت وەک: نووسین، خواردن، کردن ...هتد هەموو کردارێکی گشتی دەبەخشن و بەکەم کردنەوەی پیتێک یا (ن)ی چاوگەکەی واتا سەربەخۆکەی

خۆیان لە دەست دەدەن، وەک لە سەرەوە پیشانماندان.

با بێینە سەر قەدی تێنەپەڕی کەسی سێیەمی تاک، کە دوای وەرگرتنیان لە چاوگەکانیانەوە، بەلادانی (ن)ەکەیان فرمانی رابردوو بێ پێوەلکاندنی راناوی کەسی لکاو لەبەر دیارنەبوونی بکەرەکانیانە، کە وەک قەدی چاوگی روودان کە بەهەمان شێوە بکەرەکانیان دیارنین، بۆیە واتا دەبەخشن و کاتەکانیان لە حاڵەتی کەسی سێیەمی تاکی نادیارە، کەچی بۆ کەسەکانی تر پێویستیان بە پێوەلکاندنی راناوی لکاوە، تا بە تەواوی کەسەکانیان وەکو قەدی چاوگەکانی کە لە سەرەوە نموونەمان بۆ هێنانەوە بە هۆی بەکارهێنانی راناوەکانەوە دیاری بکرێن، **نموونە:**

**چاوگی تێنەپەڕ: قەدی چاوگ - (ن)ی چاوگ ـــــ فرمانی رابردوو بۆ کەسی سێیەمی تاک**

ڕۆیشتن: ڕۆیشت - (ن) ـــــ ڕۆیشت

چوون: چوو - (ن) ـــــ چوو

هاتن: هات - (ن) ـــــ هات

بەهەمان شێوە برژا، خنکا، رژا، رووخا، پسا، مرد، سووتا ...

لەبەر ئەوەی بکەرەکانیان هێزێکی سروشتین و لەحاڵەتی کەسی سێیەمدان، بۆیە بێ راناوی لکاو ئەمانەو، ئەو قەدانەی کە وەک (ڕۆیشت، هات، چوو ...) بێ راناوی لکاو، واتاو کاتیان ئاشکراو دیارە، بکەرەکانیان لە دۆخی (حاڵەت) نادیاریدان و نازانرێت کە ، ، کێن؛ بەڵگەش بۆ ئەمە بۆ کەسانی تر بەبێ بەکارهێنانی راناوی لکاو بەکارنایەن و کاتەکەیان دیارنییە، وەک: ڕۆیشتم، ڕۆیشتیت، ڕۆیشتین. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە فرمان نابێتە بنەڕەت و بناغەو سەرچاوەی وشە دارێشتن و فرمان خۆیشی لە چاوگەوە، بەیارمەتی مۆرفیمی ترەوە دروست دەبێت و وشەیەکی سەربەخۆنییەو فرمان لە چاوگەوە وەرگیراوە،

نـــەک چاوگ لە فرمانەوە وەرگیرابێت.

پاش ئەم شـێـوانەی سـەرەوە، قـەدی تێـپـەڕی چاوگـە یائیـیـەکـان بەبێ پێوەلکاندنـی راناوی لکاو دوای لادانی (ن)ی چاوگەکانیان، واتاو کاتیان تێدا بۆ کەسی سێیەمی تاک بە هۆی کۆتایی هاتنیان بە پیتی (ی)ی تێکەڵ بوونیان لەگەڵ راناوی لکاوی (ی) کـەسی سێـیـەمی تاکدا، کەنیشانەی بوونە بکەری فـرمـانی تیـپـەڕە، دیارو ئاشکرایە، واتە لەبەر لە یەکـچـوونی ئەو دوو دەنـگی (ی)یە، کـە لـە بنەڕەتدا یەک دەنـگن، کـە ئێـسـتـا بۆ دوو مـەبەسـتی جـیـاوازی بەکارهاتوون، یەکەمیان پیتێکی چاوگەو دووەمیان راناوی لکاوە، ئەگینا قەدی چاوگ دوای لادانی (ن)ەکەی کە دەبێتە هۆی دروست بوونی فرمان بەبێ راناوی لکاو نابێـتـە فـرمـان و وەک وشـەیەکی واتادار بە تـەنهـا بەکـارنایەت؛ نموونە: چاوگی یائی: قـەدی چاوگ (-) (ن) ـــــ فـرمـانی رابردووی تێـپـەڕ بۆ کـەسی سێیەم

نووسین: نووسی - (ن) ـــــ نووسی

کڕین: کڕی - (ن) ـــــ کڕی، هەروەها قەدی تری یائی وەک:

بڕی، سڕی، پرسی ... ئەم قەدی چاوگانە بۆیە بەبێ راناوی لکاو بەکاردێن و واتاو کـاتیان بۆ رابردوو دیارە چونکە بە (ی) نیشـانەی چاوگ کۆتاییـان هاتووە لەگەڵ (ی) رانـاوی لکاوی کەسی سێیـەمی تاکدا وەک دەنگێک هەمـان شتن. باشترین بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە بۆ کەسەکـانی تر لە گـەردان کـردنیـاندا، قـەدی چاوگەکان بەبێ رانـاوی لکاو گەردان ناکرێن و کەسەکـانیش دیارنین کە چەندەمن وەک: نووسی + م ـــــ نووسیم، نووسیت، نووسیـمان، کڕیم، بڕیـان، سڕیتان ... لێرەدا دەرکەوت کە چاوگ بنەڕەتەو بەتەنهـا وەک وشـەیەکی سـەربەخۆی واتادار بەکـاردێت، بەڵام فـرمـان لە چاوگـەوە رەگ و قـەدەکـەی وەردەگـیـرێت بـە هۆی پێـشـگرو رانـاوی لکـاوەوە دادەڕێژێت و دەبێـتــە وشــەیـەکی داڕێژراوو بوونـی

فرمانێتی دەچەسپێت و دەبێتە وشەو بەکاردەهێنرێت و تافەکەشی دیاری دەکرێت.

٤- چاوگ لە ڕووی شێوەوە بە سادەو دارێژراوو لێکدراوەوە ناوێزەکانی (شاذ) نەبێت کە بە پاشگری (ەوە) کۆتاییان هاتووە ئەگەرچی ئەوانیش پێشی ئەو پاشگرەیان بە (ان) کۆتاییان دێت، هەموویان کۆتاییەکەیان بە(ن)ەو، تەنها چاوگیشە لە زمانی کوردیدا لەناو وشەکانی تردا یەک شێوەیان هەیە؛ وەک: سووتان، بڕین، خواردن، هێنان، کوشتن، چوون، ... بەڵام فرمان شێوازی جۆربەجۆری هەیە بۆ ڕابردوو، ڕانەبردوو، داخوازی هەروەها ڕاناوی لکاوی جۆربەجۆر لە کۆمەڵەی یەکەم و دووەم و تێنەپەڕ لە ڕابردوو وانەبردوودا دەچێتەسەر وەک:

بۆ ڕابردووی تێپەڕ:

بردم　بردمان

بردت　بردتان

بردی　بردیان

بۆ ڕانەبردووی تێپەڕ؛ وەک:

دەنووسم　دەنووسین

دەنووسیت　دەنووسن

بە (ات، یت) دەخوات　دەنووسێت　دەنووسن

بۆ ڕانەبردووی تێپەڕ:

دەچم　دەچین

دەچیت　دەچن

بە (ات، یت) دەچێت　دەڕوات　دەچن

بۆ ڕابردووی تێنەپەڕ:

ڕۆیشتم        ڕۆیشتین

ڕۆیشتیت    ڕۆیشتن

لە کەسی سێیەمدا ڕاناو دەرناکەوێ: ڕۆیشت      ڕۆیشتن

بۆ فرمانی داخوازی: بنووسە - بنووسن

ئەم حاڵەتی جۆربەجۆرەی فرمان لە ڕووی دارێشتن و گەردان کردن و کاتەوە، بەشێوەی جیاواز جیاواز ،ئەوە دەگەیەنێت کە فرمان وشەیەکە لە چاوگەوە بە ڕێگای دارێشتنەوە وەرگیراوەو وشە دارێشتن، واتە دروست کردنی شتێک، لە چەند شتێکی تر لەیەک قاڵبەوە، لێرەدا فرمان لە قاڵبی چاوگەوە وەرگیراوە، کە ڕەگەکەیەتی بە هۆی نیشانەی جۆربەجۆری وەک دە، ب و ڕاناوی لکاو.

٥- چاوگ لە ڕووی پێکهاتن و دارێشتنەوە سی جۆری هەیە، وەک:

سادە: هاتن، کردن، کوشتن، بڕین، چوون.

دارێژاو: ڕاهاتن، ڕاکردن، دابڕین، هەڵچوون، کردنەوە.

لێکدراو: نان کردن، ڕاوکردن، داربڕین، ئاگرکردنەوە.

لێرەدا ڕەسەنایەتی چاوگ، وەک بنەڕەتی دارێشتن بە هۆی چاوگێکی لێکدراوی وەک (ئاگرکردن)ەوە کە بەبێ پاشگری (ەوە) واتاکەی روون نییە بەڵگەیەکە بۆ ئەوەی کە چاوگ یەک حاڵەتی دارێشتن و پێکهاتنی هەیە تەنانەت بە لێکدراویش بەهۆی لێکدانی دوو وشەی وەک (ئاگر + کردن) پێویستی بە چوونەسەری پاشگری (ەوە)ی چاوگە ناوێزەکان (شاذ) هەیەو دەبێتە (ئاگرکردنەوە) کە واتادارە بە هۆی (ەوە)وە، هەرچی فرمانە لە ڕووی دارێشتن و پێکهاتنەوە دوو جۆری هەیە بەبێ سادە، چونکە لە چاوگەوە وەرگیراون و شێوەی سادەییان نییە، کە چاوگەکان هەیانە چونکە سەربەخۆن؛

**نموونە:**

١- فرمانی دارێژراو(١٣): خواردم (قەدی چاوگ +ڕاناوی لکاو)، دەخۆم

(نیشانەی رانەبردوویی + رەگی چاوگ + راناو)، بنووسە (بـ - ی داخوازی+ رەگ + راناوی لکاو).

٢- فرمانی لێکدراو: بۆ جیاکردنەوە چەمکی فرمانی لێکدراوو دیار کردنی پێویستە ئاگاداری وشە سەربەخۆکەی کە دەچێتە پاڵ فرمانە دارێژراوەکەوە بین؛ ئەگەر واتای وشەکە پەیوەند بوو بە فرمانەکەیەوەو، بە تەواوی پارچەکانی تێکرژاوو چووبێتنە پاڵ یەکترەوە، نەک وەک بەرکاری فرمانی راستەوخۆ.

نموونە: راوم کرد، دەستی گرت، هەوڵی دا، یارمەتی دام، دەمی گرت، سەری نایەوە. راودەکەم، دەستی دەگرم، چاوی لێدەپۆشێت، یارمەتی دەدەم، بەهەمان شێوەی فرمانی دارێژراو، فرمانی لێکدراویش کە لە وشەیەکی سەربەخۆ و فرمانێکی دارێژراو یان زیاتر بەهۆی راناوی لکاوەوە، وەک نموونەکانی سەرەوە پێک دەهێنرێن، بەڵام بەبێ راناوی لکاو وەک دارێژراوەکان دروست نابن و هیچ واتایەک دوای لابردنی (ن) چاوگەکانیان نابەخشن و هیچ دەورێک نابینن،

**نموونە:**

دەست گرتن ــــ دەست گر (وەک فرمان)

راوکردن ــــ راوکرد،

هەوڵدان ــــ هەوڵدا

یارمەتی دان (بەرێکەوتی (ی) وشەی یارمەتییەوەیە واتابەخشە).

چاولێپۆشین ــــ چاولێپۆشا،

دەم گرتن ــــ دەم گرت ...

ئەم نموونانە، باشترین بەڵگەیە، کە فرمان لە چاوگەوەیەو، وشەیەکی سەربەخۆی نییەو سەرچاوەی وەرگرتنی وشەی ترو، سەربەخۆیی بنەرەتی چاوگ دەسەلمێنێت و، بۆ وەرگرتنی وشەی تریش، وەک ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر بەهۆی پێشگرو پاشگرەوە دوای لادانی (ن)ەکەی و

وەرگرتنی رەگەکەی بە لێکدراوی، وەک راوکردن + ەر ـــ راوکەر

فرۆشتن: فرۆش + یار ـــ فرۆشیار، فرۆشرار (ناوی بکەرو ناوی بەرکار).

نان کردن: نان کە + ەر ـــ نانکەر (ناوی بکەر) بزوێنێکیان نامێنێ؛

شەکرشکاندن: شەکرشکێن (بە گۆڕینی)ا ـــ یٚ (ناوی ئامێـرە) کوشتن و بڕین ـــ بکوژو ببڕ، کوژراو (ناوی لێکدراو، ناوی بەرکار)

کوشتن: ـــ کوشت + ار ـــ کوشتار (ناوی چاوگە)

فرۆشتن ـــ فرۆش + گا ـــ فرۆشگا (ناوی جێگایە)

بردن: بە + ەرـــ بەر (ئاوەڵفرمانی شوێنییە).

٥- چاوگ هەمووی وەک وشەیەکی سەربەخۆو واتادار بەکاردەهێنرێت، بەڵام فرمان و گوزارە هەموویان بەتەنها بەکار نایەن و پێویستیان بەزیادەو مۆرفیمی تر هەیە.

نموونە: ئاڵا قوتابی (واتای روون نییە) ـــ ئاڵا قوتابییە (واتادارە).

٦- چاوگ بە (ن)ەکەیدا دیارە، کە وشەیەکی گشتی و سەرچاوەی دارێشتنی فرمان و وشەی ترە، چونکە (ن)ەکەی تایبەتە بە وشەی چاوگ و، لە قاڵبی فیزیاوی پێکهاتنیدا تواوەتەوەو، جیاوازە لەگەڵ (ن)ی تردا کە مۆرفیمە لە شوێنی تری وشەدا وەک (ن)ی کۆو یا لەگەڵ وشەی تردا، بەشدری هەبێت و حاڵەتی جۆربەجۆری هەبێت، وەک فرمان و راناوی لکاو، بریتییە لە چەند جۆرێک بۆ رابردوو، رانەبردوو، داخوازی، هەروەها بۆ تێپەڕو تێنەپەڕ، هەیی، ئەمانە دۆخی جیاوازیان هەیە لەو روانەوە.

نموونە: نووسین، کردن، رژان، هاتن، هەڵگرتن، خولاندنەوە، هەموو (ن)ەکان یەک بابەتن، بەڵام کچن. هی کۆیە.

بۆ راناوی لکاو: چووم بکەرە، کوڕەکەم بۆ هەیی یە

خواردمان بۆ رابردووی تێپەڕە، چوویت بۆ رابردووی تێنەپەڕە، دەخۆین بۆ

رانەبردووی تێپەڕ، ڕۆیشت = رابردووی تێپەڕ (دەرناکەوێ)

خواردی = رابردووی تێپەڕ، دەخوات، دەنووسێت بۆ رابردووی تێپەڕ.

٧- هەموو چاوگێک وشەی لێوە دادەڕێژێت و وەردەگیرێت، تەنانەت چاوگی (چوون)، (بوون) کە ناوێزەن (شاذ) بەڵام دەمەکانی فرمانی وەک: (چووم، دەچم، بچۆ، بووم، دەبن، ببە)ی هەیەو کەچی فرمان هەموویان وشەیان لێوە دروست ناکرێت وەک لە فرمانی ناتەواوی بوو، ئەگەر فرمان سەرچاوەی وەرگرتن و داڕێشتنی وشە بێت، دەبێت لە فرمانی (دەچم، چووم، بووم، دەبم) وشەی تری لێوە وەربگیرایە، وەک ناوی بکەر ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر)، چونکە ڕەگی ئەم دوو چاوگە بریتین لە تەنها پیتێکی وەک (چ ، ب) دەبنە هۆی داڕێشتنی فرمان لێیانەوە، بەڵام لە فرمانە کەیانەوە، وشە وەرناگیرێت، چونکە واتای ڕەگ بەندە بەچاوگەوە.

٨- چاوگ وەک وشەیەکی سەربەخۆ، هەموو جۆرەکانی واتا دەبەخشێت، بەڵام فرمان بەبێ یارمەتی پێشگرو پاشگر دروست نابێت و بە فرمانیش دانانرێت. بەڵکو ئەوەی هەیە تەنها ڕەگی چاوگەو بێ واتایە، بە هۆی زیادەوە دەبێتە فرمان ئەو زیادانەش بە شێوەی پێشگرو پاشگرن وەک (نیشانەی جۆری دیاری کردنی فرمان لە (دە، وە، بوو، بـ، راناو) کە بۆ رابردووی بەردەوام، رانەبردوو، رابردووی تەواو، رابردووی دوور، فرمانی داخوازی)؛ واتە بەلادانیان، ڕەگ دەمێنێتەوە، وەک وشەیەکی ناتەواو (مۆرفیمی بەند) لە ناو چاوگدا پارێزراوە، واتە بەمەدادەردەکەوێت کە فرمان لە چاوگەوە، وەرگیراوەو بنەڕەتی داڕێشتن و وەرگرتنی وشەو فرمانیش چاوگە، نەک فرمان؛ چونکە فرمان، خۆی بە تەنها بوونی نییە لە وشەسازیداو بوونەکەی لە ماکی (ڕەگ و ریشە) چاوگەکانەوەیە، چونکە ئەو ڕەگانە لە ناخی چاوگەکانەوەن و، بوونەتە ئێسکی دروست بوونی فرمان، هەر لەبەر ئەمەشە فرمان جۆری سادەی نییە لە رووی پێکهاتنەوە،

چونکە وشەیەکی وەرگیراوو دارێژراوە.

٩- چاوگ، فـرمـان و وشـە دارێژراوەکـانی تری کـە لە رەگی چاوگـەوە، وەردەگیرێن، هەمـوویان رووداوێکی گشـتیـیـان تێدایە، بەڵام فـرمان بێجگە لە رووداو، کاتی تێدایە، لێرەدا رووداو لە نێوانیـاندا هاوبەشەو، تەنـها کات هی فـرمـانەو، چاوگ رووداوە لەلایەن کـەسـێکەوە رادەگـەیەنرێت و روودەدات و، پاشان باس لە بارەیەوە دەکرێت و، فرمانیش بریتییە لە باسکردن لە بارەیەوە، واتە فـرمـان باسی رووداوەکـە، دەکـات و پێش باسکردنەکـە، رووداوەکـە رووی داوە، بۆیە لە رووی بەجێی (منطق) واتاوە، چاوگ پێش فـرمـانـەو سـەرچاوەی رووداوە گشـتیـیەکە لە چاوگدایەو ئەم رووداوە وەک کردەوەیەکی سەربە چاوگ تایبەتێتی گشت وەرگرتووەو، لە فرماندا لە چاوگەوە وەرگیراوە، تایبەت بووە بە هۆی دیاری کردنی کات و کەسەکانییەوە. کردن: رووداوە کردارێکی (عملية) گشتی دەبەخشێت و بێ کاتە.

کـاردەکـەم، کـردم: رووداوێکی تایبـەتەو لەلایەن کـەسـێکەوە کـراوە، بەڵام (کردن) کە چاوگە ئیش و کارێکی گشتییەو هەموو ئیش و کارێک دەگرێتەوە، کـە لەلایەن بکەرەوە بکرێت و لە فـرمـانەکـەدا سـیفـەتی دیاری کـردن و تایبـەتی خۆی وەردەگرێت کە چ کارێک بێت و بکەرەکەشی دیارە؛ هەروەها ئەم نموونانە:

خواردن، رۆیشتن، نووسین ـــــ کردەوەو رووداوی گشتین و بکەرنییە.

خواردم، رۆیشت، نووسیمان ـــــ کردەوەیەکی تایبەتی بکەرە دیارە.

رەگ واتای گـشـتی وشـەکـەی پاراسـتـووە، بەمـەدا دەردەکـەوێت، رەگ هی چاوگـە، چاوگیش واتاکـەی گشـتیـیـە، بەڵام فـرمـان تایبەتە، کەواتە فـرمـان لە چاوگـەوەیە، چونکە واتای فـرمـان تایبـەت ترە لە واتای چاوگ و فـرمـانـیش لە رەگی چاوگەوەیە(١٤).

١٠- بـەڵـگـەی تـر بـۆ بنـەڕەتی و ســــــەرچاوەی چاوگ ئـەوەیە، دەنـگـە

سروشتییەکانی (گرمە، قیژە، هارە، بارە، زریکە، ... ) وەک: پرس، دز، خەو)ی ناوی چاوگی (اسم المصدر Infinitive noun) یەکسەر بە هۆی راناوی لکاوەوە، ناکرێن بە فرمان بە شێوەی: پرسیم، دەدزم، بخەوە، بەڵام ئەم ناوە دەنگە سروشتیانە، کە ناون بە هۆی پاشگری (اندن)ەوە بوونەتە چاوگ و، لە پاشاندا لە چاوگەکانیانەوە بەلادانی (ن)ی چاوگ بە هۆی لکاندنی پێشگرو راناوی لکاوەوە، فرمانیان لێوە دروست دەکرێن، نموونە:

گرمە + اندن ـــ گرماندن: گرماند + ی ـــ گرماندی بۆ رابردوو. گرماندن + گرمێن (بە هۆی ا ـــ ێ (رەگە): دە + گرمێن - ێت ـــ دەگرمێنێت بۆ رانەبردووە، بەڵام ناتوانین بڵێین: گرمی، گرمە، بگرمە، دەگرمە وەک فرمان و جۆرەکانی بۆ هەر ناوێکی چاوگی؛ ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە چاوگ بنەڕەت و سەرچاوەی فرمان دروست کردنە، نەک فرمان خۆی.

چونکە ئەگەر فرمان سەرچاوەبێت ئەوا دبوایە (گرمە، قیژە، ... هتد) یەکسەر راناوی لکاوو پێشگرو پاشگریان وەربگرتایەو واتایان بدایە، وەک: قیژە ـــ بقیژە، دەقیژم گرمە + م ـــ گرمەم، دەگرمە + م ـــ دەگرمەم، بگرمە، گرمەوە.

ئەمجا ئەم نموونانەی سەرەوە، بە هەردوو جۆری راستەکەی و هەڵەیەوە، ئەوە دەسەلمێنێت کە ناوی دەنگە سروشتییەکان دەچنەوە، سەر بنەڕەت و سەرچاوەی خۆیان کە چاوگە، نەک فرمان، چونکە ئەگەر فرمان بنەڕت بووایە، ئەبوایە ئەو (ناوە سروشتیانە) یەکسەرو راستەوخۆ بەبێ (اندن) پێشگرو راناوی وەربگرتایەو واتا بەخشیش بووایە، کەچی بێ واتان و ئەم دیاردەیە ناوە دەنگە سروشتییەکان دەگرێتەوە.

١١- چاوگ هەروەکو لە خاڵەکانی تردا روونمان کردەوە، بە واتای کردەوەیەکی گشتی دێت، کە ئەمە تایبەتییەکە، چاوگ لە ناو نزیک دەکاتەوە، چاوگیش لە رووی ئەرک و (١٥) واتاوە هەر وەک ناو وایەو ناویش لە زمانی کوردی،

دەورێکی چالاک دەبینێت لە رووی دارێشـــتنەوەو، ســەرچاوەی دارێشـــتنی وشەیەکی زۆرە، بە هۆی زیادەوە (affix). ئەمە ئەوە دەچەسپێنێت کە چاوگ لە فرمانەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو فرمان خۆی لە چاوگەوە وەرگیراوە، چاوگ سەرچاوەی دارێشتن و وەرگرتنی وشەی دارێژراوی تری وەک: ناوی بکەر، ناوی بەرکـار، ناوی چاوگ، ناوی ئامــێــر، ناوی جــێگا، هەندێک جــۆری ناوی لێکدراوە(١٦). نموونە:

بۆ ناوی جێگا: فرۆشگا، کێڵگە، جمگە، رووتەن،هەڵدێر.

بۆ ناوی چاوگ: کوشتار، پرسیار، کۆکە، پرسە، بڕشت، خۆراک، کۆشش.

بۆ ناوی ئامێرو ئامراز: پێخەف، شەکرشکێن، کوتەک، هێڵەک.

بۆ ناوی چاوگ: کـوشـتـار، پرسیـار، کۆکە، پرسە، بڕشت، خۆراک، بێژنگ، گیرە.

بۆ ناوی لێکدراو: باران بڕان، باگردێن، راوکردن، نان کردن.

ئەم نموونانەی سەرەوە ئەوە دەدەخات، کە چاوگ وەک ناو وایەو وشەی زۆرو جۆربەجۆری لێوە وەردەگـیرێت و، چۆن ناو لە کوردیدا بە شـێوەیەکی گشـتی سەرچاوەی وشە دارێشـتنە، چاوگیش سەرچاوەی وشە وەرگیراوەکـانی خۆیەتی وەک نموونەکـانی کە لە سـەرەوە پێشـانماندان، نەک فرمـان، چونکە فرمـان خۆی وشـەیەکی دارێژراوەو لە چەند مـۆرفـیـمـێکمـەوە دروست بووە - ئەو نموونانەی سـەرەوە، هەندێکیـان دوو دەوری وەک ناو و ئاوەڵناو دەبینن، واتە لە چاوگەوە ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمانیش بەکەس وەردەگیرێت، ئەمە ئەوەمان بۆ دەردەخات، کە چاوگ ناو وەک یەکن، نموونە: دزین ـــــ دز، مـردن ـــــ مـردار، گـریان ـــــ گرینۆک، پەککەوتن ـــــ پەککەوتە.

وشەکانی ریزی دووەم ئاوەڵناون، ئاوەڵفرمانیش لە چاوگەوە؛ وەک بردن: بە + ەر ـــــ بەر (واتە بەردەم و خوار دەگەیەنێت بۆ شوێن و بەری دار).

دان: ده + ەر ـــ دەر(شوێن بۆ دەرچوون و هاتووچۆ).

لە ناوەوە بە دەیان وشـــەی وەک ناوی دارێژراو، لێکدراو، ئاوەڵناو وەردەگیرێت، چەند نموونەیەک بۆ بەڵگەی سەرچاوەیی وشە دارێشتنی ناو پێشان دەدەین: سەرباز + گا ،سەربازگا، دارەوان، پیاوەتی، دانساز، سەرۆک، برایەتی، جوتیار، کرێکار، دڵدار، سەرین ... هتد لە ناوەوە، ناوی دارێژراون. لە پاش، لەپێش، لەمەولا، سەرانسەر، خوارەوە، دواوە، دوایی، ئاوەڵفرمانن.

**چاوگ لە رووی بوونەوە**

بەپێی پەیوەندی بە لێکۆڵینەوەکەمانەوە، پێویستە جۆرەکانی چاوگ لە رووی بووونەوە؛ دیاری بکەین، چونکە پەیوەندی هەیە بە وەرگرتنی بکەرەوە، لە کاتی وەرگرتنی فرمانی ئەو جۆرە چاوگانەوە، لە رووی بوونیانەوە، بە پێی واتی سیمانتیکییان لە ئەنجامدانی رووداو و، کردنی رووداوی فرمانەکانیان، کە ئەم دوو جۆرەیان هەیە(١٧):

١- چاوگی گوێزانەوە (مصدر انتقالي)

٢- چاوگی رووداو (مصدر مطاوعة)

لە یەکەمیاندا فرمانی گوێزانەوە وەردەگیرێت، کەبکەرەکانیان بە هۆی کەس و راناوە لکاوەکانەوە دیاری دەکرێت و، کات و واتای فرمانەکەش بە هۆیانەوە دروست دەبێت و بەبێ کەس و راناوی لکاو، فرمان نە دروست دەبێت و بێ واتایەو مۆرفیمێکی بەندە، کە لە چاوگەوە، وەرگیراوەو واتاکەشی بەندە بەوەوە؛ ئەم دیاردەیە، تەنها لە کەسی سێیەمی فرمانی تێنەپەڕدا، واتاو کاتەکەی لەبەر پێویست نەبوون و دەرنەکەوتنی راناوە لکاوەکەدا لەزمانی کوردیدا دەرناکەوێت و واتا دەبەخشن و کاتیشی دیارە؛ وەک:

هاتن: هاتم هاتین.

لە رانەبردوودا پێویستیان بە راناوی لکاو هەیە.

بۆ تێنەپەڕ: هاتیت    هاتن    دێم    دێین

هات    هاتن    دێیت    دێن

ئەم دیاردەیە لە چاوگی گوێزانەوەی تێپەڕدا، کاتێک فرمانی لێوە وەردەگیرێت، بەبێ راناوی لکاو فرمان دروست نابێت و، کات و واتای ئاشکرا نییە، بەڵام بە پێوەلکانی راناوی لکاو بە رەگی چاوگەکانیانەوە، فرمانەکانیان دروست دەبێت و واتاو کاتیان تیادا بۆ تافە جیاوازەکانیان دیاری دەکرێت؛

وەک: خواردن: خوارد (بێ راناوی لکاو کات و واتای نییە)، خواردم

بۆ تێپەڕ: خواردت    خواردمان    (بەهۆی راناوەوە واتاو کاتیان دیارە).

خواردی    خواردتان

ئەم دیاردەیە، چاوگە تێپەڕە (یائیەکان) هەروەکو لەمەوبەرەوە لەم باسەدا روونمان کردۆتەوە؛ لەبەر ئەوەی قەدی رابردوویان بە (ی) کۆتایی هاتووە، لەگەڵ راناوی لکاوی (ی) کەسی سێیەمی تاکدا تێکەڵ دەبن واتاو کاتیان هەیە.

وەک: نوسین: نووسی

کڕین: کڕی

بڕین بڕی

بەڵام بۆ کەسەکانی تر پێویستیان بە راناو هەیە تا دیاری بکرێن.

وەک: نووسیم    نووسیمان

نووسیت    نووسیتان

ئەم نموونانەی سەرەوە بۆ رابردووی تێپەڕبوون، بەڵام رانەبردووی تێپەڕ بەبێ راناوی لکاو، بۆ هەموو کەسەکان بەتاک و کۆوە، پێویستیان بە راناوی لکاو هەیە تا بینەفرمان و کەس و کات و واتایان دیاری بکرێن.

وەک: دەنووسم    دەنووسین

دەنووسیت    دەنووسن

دەنووسێت        دەنووسن

نموونەی تر لە چاوگە نا یائییەکان کە بەبێ راناوی لکاو لەدەمی رابردوو، رانەبردوو واتاو کاتیان دیاری ناکرێت و فرمان دروست نابێت، کە ئەمە بەڵگەیەکی بەهێزە کە فرمان وشەیەکی سەربەخۆ نییە، مۆرفیمی وەک پێشگرو پاشگر کات و واتای دیاری دەکات؛ نموونەی فرمان لە چاوگی نایائییەوە:

کێڵان: کێڵا بێ راناوی لکاو واتاو کاتی تێدا نییەو، رووداو دیاری ناکات. بۆ رابردوو (کێلات) کات و واتایان دیارە بە هۆی راناوی لکاوەوە. کێڵام، کێلات، بۆ رانەبردوو کێلان: کێل مۆرفیمی بەندە بێ راناوی لکاوو نیشانەی فرمان.

دەکێڵم، دەکێڵێت بە هۆی (دە)و راناوی لکاوەوە کات و واتایان دیاری کرا.

هێنان: هێنا، هێن

بەستان: بەستا، بەست

کردن: کرد، کە

کوشتن: کوشت، کوژ

جووین: جوو، جوو

مۆرفیمی رابردوو، رانەبردوون بەندو بێ واتان تافیان دیاری نەکراوە، چونکە بێ راناوی لکاون و نیشانەی فرمانیان نییەو لە فرمانی گوێزانەوەی تێپەڕن.

٢- چاوگی روودان: (مطاوعة) ئەو فرمانانەی لەم جۆرە چاوگانەوە وەردەگیرێن لەبەر ئەوەی بکەرەکانیان هێزێکی سروشتین و، لە دەرەوەی ویست و کرداری مرۆڤە روودانیان بۆیە بەلادانی (ن) چاوگەکانیان بەبێ راناوی لکاو کات و واتایان هەیەو لە دۆخی کەسی سێیەمی تاکدایەو، یا بە هۆی ناوی کەسەوە، بۆ رابردوو دیاری دەکرێت، بەڵام رانەبردوو وەک جۆرەکانی تر، بێ راناوی لکاوو نیشانەی فرمان دیاری ناکرێت؛ وەک:

خنکان: خنکا

برژان: برژا - واتاو کاتیان بۆ کەسی سێیەمە.

برژام: برژاین: برژایت.

خنکام: خنکاین: برژان - کات و واتایان بە هۆی راناوەوە بۆ رابردوو دیاری کراوە.

بۆ رانەبردوو: برژان ـــ برژێ

خنکان ـــ خنکێ

مۆرفیمی بەندن بەبێ نیشانەی فرمان و راناوی لکاو.

دەبرژێم دەبرژێین

دەبرژێیت دەبرژێن

دەخنکێم دەخنکێین

بە هۆی راناوی لکاوو نیشانەی (دە)ی رانەبردووەوە واتایان ئاشکرا بووە.

بە گشتی فرمان بەبێ راناوی لکاوو دیاری کردنی نیشانەکەیان، ئەوانە نەبێت کە یائین و فرمانی روودانن (مطاوعة) واتاو کاتیان نییە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە فرمان لە چاوگەوە وەرگیراوە، نەک چاوگ لە فرمانەوە وەرگیرابێت، بۆیە چاوگ بنەڕەتە (اصل).

ئەنجامی لێکۆڵینەوە:

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، کە چاوگ و فرمان کامیان لە کامیانەوەن و، کامیان سەرچاوەی دارێشتنن گەیشتوومەتە ئەم ئەنجامانە:

١- چاوگ لەبەر ئەوەی نموونەی وشە تواوەکانی Fasional زمانی کوردییە و مۆرفیمەکانی لەناو یەکتردا بەشێوەیەکی واچوونەتە پاڵ یەکتر تواونەتەوەو قالبی فیزیاوی دروستبوونی وشەکە بە شێوەیەکی سەربەخۆو سادە دادەنرێت، چونکە بەلادانی (ن)ی چاوگ و نیشانەکەیان، چاوگەکانیان، واتایان نامێنێ و

پاشماوەکەیان بە ڕەگ و قەدەوە، سەربەخۆنین و واتاشیان بەندە بە چاوگەوە.

٢- چاوگ بنەڕەت و سەرچاوەی وەرگرتنی فرمان وشەکانی وەک ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان، ناوی بکەر، ناوی بەرکار، ناوی چاوگ، ناوی جێگا، ناوی ئامێر، ناوی لێکدراوی بە هۆی پێشگرو پاشگرەوە بۆ سەر ڕەگ و قەد.

٣- چاوگ بەسادەو داڕێژراوو لێکدراوییەوە، یەک شێوەو ڕواڵەتیان هەیەو تەنانەت ناوێزەکانیشیان (شاذ) کە بە پاشگری (ەوە) کۆتاییان هاتووە، هەموویان بە نیشانەی (ن) کۆتاییان دێت و ئەم (ن)ە، تەنها تایبەتە بە چاوگەوە، نەک بۆ وشەی ترو بەلادانی وشەکە وەک مۆرفێمێکی بەندو بێ واتا دەمێنێتەوەو، بە هۆی پاشگرو پێشگرەوە وشەی تری لێوە وەردەگیرێت.

٤- چاوگە ناوێزەکانی، کە بە پاشگری (ەوە)ن وەک (خولانەوە، پلیشانەوە ...) هەموویان نشانەکەیان پێش پاشگرەکە، بە (ان) کۆتاییان هاتووە، بەڵام بەبێ (ەوە) بێ واتان و، لە گەردانکردندا ڕاناوە لکاوەکان شوێنی (ان) نیشانەکە دەگرنەوە، ئەمە ئەوە دەچەسپێنێت، کە ڕۆژێک لە ڕۆژان لە کۆندا بەبێ پاشگری (ەوە) واتایان هەبووە، نموونە: خولانەوە، کولانەوە، سووڕانەوە. دەبنە: خولامەوە، کولایەوە، سووڕاینەوە ...

٥- چاوگ لە ڕووی واتاوە لە زماندا بە واتای شوێنی وەرگرتن و سەرچاوە دێ.

٦- چاوگ ڕووداوی بێ کاتە، فرمانی لێ دەربچێت، هەموو وشەکانی کە لە چاوگەوە، وەردەگیرێن هەمان تایبەتی ڕووداوی بێ کاتیان تێدایەو، بەڵام دوای وەرگرتنیان لە چاوگەوە، کاتەکانیان بۆ دەمی ڕابردوو، ڕانەبردوو، داخوازی دیاری کراوە بە هۆی ڕاناوی لکاوو نیشانەی فرمانەوە.

٧- چاوگ وەک ناوێکی گشتی وایەو واتای کردار (عملية - پرۆسە) دەگەیەنێ لەبەر ئەوەی ناو بە گشتی سەرچاوەی داڕێشتنی (اشتقاق) وشەیەکی زۆری

وەک ناوی دارێژراوی ترو ئاوەڵناوو ئاوەڵفرمانە ... لە کوردیدا، چاوگیش واتای ناو دەبەخشێت، بۆیە چاوگ لە فرمانەوە، وەرنەگیراوە، بەڵکو فرمان وشەی تر، لە چاوگەوە، وەرگیراون.

٨- لە رەگی هەموو چاوگەکانەوە، وشەی تر بۆ نموونە وەک فرمان دروست دەبێت تەنانەت لە رەگی چاوگی (چوون، بوون)ەوە، فرمانیان بە هۆی پێشگرو پاشگرەوە لێ وەردەگیرێت، کەچی ئەگەر فرمان بنەڕەت بێت، ئەوا دەبووایە لە رەگی (چـ ، ب)ی فرمانی (دەچم، دەبم)ەوە، وشەی تری بێجگە لە خۆیان وەربگیرایە، بەڵام لە چاوگەکەیانەوە، ئەو دوو فرمانە وەرگیراوە.

## پەراوێز:

١- لێکدان و دارِێشتن، زرەرێژ، وەرگێران، داتاشین. بڕوانە: د. کامیل بەسیر، زاراوە سازی.

٢- بڕوانە الدكتور عبدالعزيز عتيق، المدخل الى علم الصرف، بيروت ١٩٧٤، ل ٥٧- ٦١.

٣- غازی فاتیح وەیس، زمان و ئەدەبی کوردی، زانکۆی سەلاحەددین، ٩٧٩، ل ١٣ ، دەربارەی بیرڕای چومسکی بەلایەوە: لێکۆڵینەوەی زمانەوانی وەچ کردن (تولیدی Junerative) کە فۆرم و واتا بۆ لیکۆڵینەوەی زمان پێویستە.

٤- الدكتور هادي نهر، الصرف الواقي، دراسة وصفية تطبيقية في الصرف وبعض المسائل الصوتيه، بغداد، ١٩٨٩، ل٦٣.

٥- د. عبدالعزیز عتیق، سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨- ٦٠.

٦- رەفیق محەمەد شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، نامەی ماجستێر ٩٨٨، ل ٧٤- ٧٥.

٧- رەفیق محەمەد شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٨.

٨- لەمەودوا روونی دەکەمەوە، دوای بەراورد کردنی بیروڕاکان، دەربارەی وشەی تواوە.

٩- نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل٢٧- ١٣١، ١٤٩- ١٦٢.

١٠- رەفیق محەمەد شوانی، نامەی ماجستێر، ل ٧٩.

١١- هەمان سەرچاوە، ل ١٠٨.

١٢- محەمەد معروف فتاح لە وتاری (کار پۆلێن کردن بە پێی رۆنان) لە رۆشنبیر ژمارە (١٢١)، ل٤٠- ٥٩، یەکەم لێکۆڵینەوەیەکی زانیستییە، دەربارەی دابەش کردنی فرمان لە رووی پێکهاتنەوە، کە فرمان سادەی نییە، دەبوایە، لایەکی لە نامەکەی رەفیق محەمەد بدایەتەوە، چونکە ئەو هێمای بۆ ئەوە کردووە کە فرمانی رانەبردوو وەک (دەڕۆم) دارێژراوە، نەک سادە، کە ئەمە یەکەم بۆچوونە لەم بارەیەوە، بڕوانە نامەکەی ناوبراو ل٧٩. هەروەها محەمەد مەعروف فەتتاح (خوارد، دانا گرت) لە لاپەڕە (٤٦)ی رۆشنبیری نوێدا هێمای بۆ ئەوە کردووە کە ئەم فرمانانە چالاکی دەنوێن، بەڵام راستییەکەی ئەمانە بەبێ راناوی لکاو ناتوانن لە رووی کات و واتاوە، دەوری فرمان ببینن، چونکە بێ واتاو کاتن، هەروەها تێکەڵییەکی لە نێوان جۆری فرمانی دارێژراو وەک (سەرکەوت)، داناوە، کە لە راستیدا ئەم فرمانە ئەگەر راناوی لکاو لە ناوەندییەوە، بێت دەورێکی هەیە وەک دارێژراو سەرم کەوت، ئەگەر لە کۆتاییەوە بێت وەک: سەرکەوتم ئەو کاتە لێکدراوە نەک دارێژراوە.

١٣- نەسرین فەخری (ف یان وە) گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەشی سێیەم، ١٩٧٣، ل٢٠٠.

١٤- کتێبی زمان و ئەدەبی کوردی، پۆلی سێیەمی ناوەندی، لێژنەیەک، ١٩٨٢، ل٤٣- ٤٥.

١٥- رەفیق شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٩- ١٥١.

١٦- هەمان سەرچاوە، ل١٠٧- ١٠٨.

١٧- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغدا ١٩٧٦، ل١٠٠.

سەرچاوە بە کوردی:

١- د. ئەو رەحمانی حاجی مارف، وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٧.

٢- رەفیق محەمەد شوانی، ئەو وشانەی لە چاوگەوە، وەردەگیرێن، نامەی ماجستێر زانکۆی سەلاحەددین، کۆلێجی ئاداب، ١٩٨٨.

٣- محەمەد مەعروف فەتاح، کارپۆلێن کردن بەپێی رۆنان، رۆشنبیری نوێ، ژ ١٢١، بەغدا، ١٩٨٩، ل ٤٠- ٥٩.

٤- د. نەسرین فەخری، پاشگرو پێشگری (ڤە یان وە) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٣.

٥- د. نەسرین فەخری، چاوگی بێ واتا لە زمانی کوردیدا، بەغدا، ١٩٧٣.

٦- نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠.

٧- لێژنەی زمان و زانستەکانی، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کوردی، ١٩٧٦.

سەرچاوە، بە عەرەبی:

٨- د. ابراهيم السامرائي، زمانه وابنيته، بغداد، ١٩٦٦.

٩- القاسم بن محمد سعيد المؤدب، حقائق التصريف، المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٧.

١٠- الدكتور عبدالجبار علوان النايله، الصرف الواضح، جامعة الموصل، ١٩٨٨.

١١- الدكتور عبدالعزيز عتيق، المدخل إلى علم الصرف، بيروت، ١٩٧٤.

١٢- د. نوزاد احمد حسن، المنهج الوصفي في كتاب سيبويه، رسالة الدكتوراه، جامعة بغداد، كلية الاداب، ١٩٩١.

# دەوری «تا»
# لە زمانی کوردیدا

بەشەکانی ئاخاوتنی زمانی کوردی، لەڕووی واتا بەخشینەوە، دەکرێن بە دوو بەشەوە، وەک وشەی تەواوو، وشە ناتەواوەکانی، ئامرازەکان دەگرنەوە، کە بوونی سەربەخۆیان هەیەو بەتەنها واتایان روون و ئاشکرا نییە، بەڵکو لەگەڵ بەشە ئاخاوتنی تر، یا لە رستەسازیدا دەوریان بەتەواوی روون دەبێتەوە. یەکێک لەو بەشە ناتەواوانەی ئاخاوتن ئامرازی پەیوەندی (١) (Prepositon)و ئامرازی لێکدەری رستەی لێکدراوو(٢) ئامرازی بەستنی رستەی ئاڵۆزە (٣) (Conjunction): کە بوونی سەربەخۆیان هەیە لە رواڵەتدا، بەڵام واتایان لەتەک وشەی ترو رستەدا بەدیاردەکەوێت.

یەکێک لەو ئامرازانەی کە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەمانە، مۆرفیمی «تا»یە. ئەم مۆرفیمە (وشەبەند) لە زمانی کوردیدا لەمەو پێشەوە، لەلایەن زمانەوانی ترەوە باسکراوە، بەڵام بەکورتی و بەتەواوی روون نەکراوەتەوەو، دەورە جیاجیاکانی جێگای روون کردنەوەیە.

لێرەدا پێش ئەوەی بیروڕای خۆم، لە لێکۆڵینەوەکەدا بخەمەڕوو، بەپێی تواناو ئەو سەرچاوانەی کە لەبەر دەستماندان، بیروڕای جیاوازی زمانەوانان دەربارەی «تا» لە زمانی کوردیدا، وەک کارێکی زانستی دەخەینەڕوو پاشان

بیرورای خۆمیان لەسەر دەدەم.

«سەعید سدقی» (تا)ی بە «ئەداتی ئینتیها» داوەتە قەڵەم لەم نموونانەیدا: «دەخوێنم هەتا دەمێنم، تا ماوم دەخوێنم، هەتا مردن کردنە» بڕوانە «صرف ونحوی کوردی ل ٦٩،٥٤» راستە «تا» لێرانەدا (کۆتایی) دەگەیەنێت، بەڵام راستەکەی ئەوەیە «تا»ی ئەو نموونانە یەکەم ئامرازی بەستنی رستەی ئاڵۆزەو دووەم فرمانی رستەکانی هەمیشەیی و بەردەوامی کاتیان تێدایە.

«تۆفیق وەهبی» تەنها لە فەرهەنگەکەیدا «تا»ی بە ئامرازی (عەتف) داناوەو لە «دەستوری زمانی کوردی»یەکەیدا باسی نەکردووە: راستییەکەی دەبێتە ئامرازی پەیوەندی و ئامرازی بەستنی رستنی ئاڵۆز، ئەمە بێجگە لەوەی کە مەبەستی جۆربەجۆر دەبەخشێت لە رستەسازیدا.

«د. قەناتێ کوردۆییڤ» ، «هەتا»ی لەناو ئامرازکانی ترا هێناوەتەوە، بە ئامرازێکی گشتی، بۆ شێوەکانی سۆرانی و کرمانجی دادەنێت و، بەلایەوە «تا» ، «رێچکە هەتا وەکو سنووری سەرهەڵدانی رووداو لەڕووی ماوەو کاتدا پیشان دەدات: ئەم گشک هەتا سبێ بن نڤینان‌دا رادزان. ئێمە گشتمان تا سبەینێ لە بن لیفەکەدا ئەوخەوتین - سۆرانی، تا رۆژ خەو لەچاو زۆر کەس نەکەوت.

لێ بوو - بەخوو شەو تا بەیانی بەم سەر و تا ئەو سەری ژوورەکەیا ئەهات و ئەچوو - لێ بووبوو بەخەیسەت شەڤێ هەتا سبێ ژ ڤی سەری ئۆتافێ هەتاوی سەری دهات، دچو - کرمانجی بڕوانە (ک. ک. کوردۆییڤ، رێزمانی کوردی، ل٣٤١» کوردۆییڤ ناوی ئەوەی نەبردووە کە ئامرازی «تا»ی سەر بەچ جۆرە ئامرازێکە، پاشان دەبوایە سەرەتاو کۆتایی کاتی «سنووری سەرهەڵدانی رووداو لەڕووی ماوەو کاتدا..»ی ئامرازی «تا»ی دیاری بکردایە، چونکە نموونەکانی خۆی بەتایبەتی سێیەمیان وایە.

راستی بۆچوونی ئێمە پیشان دەدەن، لەبەرئەوەی ماوەی تافی رووداني

فرمانەکە دیاریکراوە، لەئێوارەوە تا بەیانییە. هەروەها دەبوایە هێمای بۆ ئەوە بکردایە کە ئامرازی «تا»ی رستەکانی پەیوەندییە (Preposition)ە. (مەردۆخ) لە ژێر ناونیشانی «حروف و ادوات»دا لە (ل٢٥)ی فەرهەنگەکەیدا تەنها «تا». «لە»ی بێ دیاری کردنی جۆرەکانیان بە نموونە بۆ ئامراز هێناوەتەوە؛ پێویست بوو لەم رووەوە روونکردنەوەی هەبوایە و ئەوەی دەست نیشان بکردایە کە «تا» چ جۆرە ئامرازێکە.

«نووری عەلی ئەمین» لە «رێزمانی کوردی»یەکەی ساڵی ١٩٦٠یدا لە ژێر دابەشکردنی ئامرازی پەیوەندیدا بۆ سادەو لێکدراوە» «هەتا»ی بە لێکدراو داناوە کەوا نییە، هەروەها «تا»و شێوەکانی تری وەک «هەتا، هەتاکو، هەتاوەکو...»ی بە «حروف الجر»ی عەرەبی دادەنێت لە(ل١٤٦)یشدا دوای پێناسەی ئامرازی پێ بەست (ئەداتی عطف)ناو نموونەکانیدا «تا، هەتا، تاکو، هەتاکو، هەتا وەکو» بۆ هێناوەتەوەو دەڵێ: ئامرازی پێ بەست واژەیەکە بۆ بەستنەوەی دوو واژە یا دوو دەستەواژە، یا دوو رستە بەکار دەهێنرێت».

دەربارەی بیرورای یەکەمی پێویست بوو بیوتایە، «هەتا» ناسادەیە نەک لێکدراو، چونکە لێکدراو هەردوو بەشەکەی واتادارە، بەڵام ناسادە دارێژراویشی بەردەکەوێ، کە لە زیادەو بەشێکی واتادار پێکهاتووە، هەروەها پێویست بوو لە هەردو بۆچوونەوەکانی ئەوەی روون بکردایەتەوە، کە (لە) ئامرازی پەیوەندییەو لە کوێی تریش ئامراز بەستن و گەیەنەرە (اداه عطف)، لە پێناسەکەیدا وا دەردەکەوێت تەواو تێکەڵی کردووە، چونکە بەستانەوەی دوو واژە یا دوو دەستەواژە، وەکو خۆی دەڵێ ئەوە کاری ئامرازی پەیوەندییە کە دوو وشە یا دوو گرێ دەبەستێت بەیەکترەوە، نەک هی ئامرازی بەستن، لە هەمان پێناسەیدا راستی بۆچوونی ئێمە بەدەر دەکەوێت، کە ئامرازی بەستن بۆ بەستنەوەی دوو رستەیە، ئەمە لەو پێناسەیەیدا، (نوری عەلی ئامرازی پەیوەندی

و ئامرازی بەستنی تێکەڵ کردووە. ڕاستییەکەی ئامرازی پەیوەندی بەگشتی و «تا»ش لەگەڵیدا بۆ پەیوەندی نێوان وشەو گرێ و ڕستەی سادەیە، کە وەک نوری عەلی وتی بۆ بەستانەوەی دوو ڕستە هەڵەیە، چونکە ئەمە کاری ئامرازی لێکدەرە، یا هی ئامرازی بەستنە، بۆ بەستانەوەی دوو ڕستە.

ئامرازی «تا - هەتا»، لە جۆری یەکەمدا پەیوەندییەو، لە دووەمدا ئامرازی بەستنە، کە دوور دەکەوێتەوە، لە مەبەستی ئامرازی پەیوەندی و ڕستەی سادە. ڕاستی بۆچوونی ئێمە نموونەکانی ناوبراو خۆیەتی، لە «ل٣٩٣، ٣٩٥»ی کتێبی (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی) دایە. هەروەها بەلای نوری عەلییەوە، «هەتا» لە بڕگەی (هەر) و «تا»وە هاتووەو، دەنگی (ر) سووک بۆتەوەو سواوەو، ڕواڵەتەکانی تری «هەتا»ش، وەک «هەتاکو، هەتاوەکو، هەتاوەکونی...» بڕوانە (ل٣٩٥ی کتێبی «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی - کۆڕی زانیاری). بەلای منەوە ئەمە بۆچوونێکی ڕاستە، بۆ ڕواڵەتەکانی ئامرازی «تا - هەتا» لەڕووی داڕێشتنی مۆرفۆلۆژییەوە.

لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کوردی دەربارەی ئامرازی «تا» لە کتێبی «ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی» ساڵی ١٩٧٦یدا لە (ل٣٠٧)دا، بە ئامرازی پەیوەندی سادە داناوە لەگەڵ هەندێ ئامرازی تردا، کە گومانیان لەسەر نییە، لەم ڕووەوە و وەک لە ڕستەی «تا کەرکووک دەچم»، ڕاستە لێرەدا «تا» ئامرازی پەیوەندی سادەیە: بەڵام مەبەستی بەکارهێنانەکەی، کە کۆتایی شوێنی ڕوودانی فرمان دەگەیەنێت ڕوون نەکردۆتەوە. هەروەها لە (ل٣٢٤)دا، لێژنە لەسەر ناونیشانی «پرێپۆزیشنی (تا)»، ئەم ئامرازەی بە پەیوەندی لەم ڕستانەی خوارەوە داناوەو هێمای ئەوەیان کردووە کە «تا»و شێوەکانی تری وەک «تاکو، تاوەکو، هەتا، هەرتا، هەرتاوەکو...» کۆتایی ئەو شتە رادەگەیەنێ، کە بۆی بەکارهاتووەو لە ئامرازی «تا»ی عطف و شرط و زەرفی زەمان، بەنموونە

جیاکردۆتەوە، نموونەکانی لیژنە وەک ئامرازی پەیوەندی ئەمانەن:

تا ڕواندز دەچم و دەگەڕێمەوە.

هەتا ئێرە بەیەکەوە بووین.

دوێنێ شەو هەتاکو بەیانی نووستم.

ڕاستـە «تا»و ڕواڵەتەکـانی تری، لەو سێ ڕستـەیەی سـەرەوەدا کـۆتایی ڕادەگـەیەنێت، بەڵام یەکـەم شت، لەم بارەیەوە، لیـژنەی ناوبراو دەبوایە زیاتر مـەبەسـتی بەکـارهێنانی ئامـرازی «تا ، هەتا»ی ڕوون بکردایەتەوە، چونکە «سەعید سدقی» پێش نیو سەدە وەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە، ئەمەی دەربڕیوە، ڕاستییەکەی ئامرازی «تا ، هەتاکو» لە ڕستەی یەکەم و دووەمدا، سنوورێک بۆ کـۆتایی بەردەوام بوونی شـوێنی ڕوودانی فـرمـانەکـانی داناوەو، لە ڕستـەی سێیەمیشدا سەرەتاو کۆتایی کاتی ڕوودانی فرمانەکەی دیاری کردووە. هەروەها لە ڕستەکانی تری نموونەکانی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕدا کە بەنموونە بۆ ئامرازی «عەطف وە یا شرط وە زەرفی زەمان» بەکاردێت، هێناوەتەوە؛ وەک:

تا ئێوە هاتن من نامەکەم نووسی. (عطف)

تا ئێوە نەیەن نامە نانووسم. (شرط)

هەتا تۆم ئاشنا بووی ئاشنا بوون. (ظرف)

ڕاسـتـە ئامـرازی «تا ، هەتا» لێـرەدا، بۆ «عطف و شـرط و ظرف»ە بەڵام دەبوایە بوترایە ئامرازی بەستن و گەیەنەری ڕستەی ئاڵۆزن و، بۆ مەبەستی «کات و مەرج» بەکار هاتوون. هەروەها لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە (ل٣٥٤)دا لەگەڵ ئامرازی (ش، یش)دا ئامرازی (تا)ی «عطف» یان، لە چەند ڕستەیەکدا بەکـارهێناوەو، بەلایانەوە هەمـوو ڕواڵەتەکـانی ئامـرازی «تا»یەک واتان؛ ڕاستییـەکەی بەپێی شوێنییـان واتاو مـەبەستی بەکارهێنانیان دەگۆڕێ. لێرەشدا پێویستـە بەدووبارەبوونەوەی هێنانەوەی نموونەکانیـان ناکات، چونکە مـەبەستی

ئامرازی «تا» تیایاندا هەمان مەبەستی رستەکانی پێشووتریانە.

«مەسعود محەمەد»، لە (ل٤٠٢)ی هەمان سەرچاوەی کۆڕی زانیاریدا، رستەی «هەر دەڕوا هەتا دەگاتە ئاوەکە»، بە نموونە بۆ بەکارهێنانی (هەر)، بۆ مەبەستی «بەردەوامی» هێناوەتەوە، راستییەکەی «بەردەوامی» بۆ ئامرازی هەتا»یەو «هەر»یش بۆ تەئکید کردنە.

کتێبی «زمان و ئەدەبی کوردی» پۆلی شەشەمی ئامادەیی ساڵی ٩٧٨، لە ژێر بابەتی «شێوازی مەرجی»، لە نموونەکانیدا، ئامرازی «هەتا»ی بێ ئەوەی هێمای بۆ بکات و دیاری بکات بەکارهێناوە. (بڕوانە ل٢٨- ٣٠)(٤).

هەروەها م. محەمەد لە (ل١٣٦)ی کتێبی «زاراوەسازی پێوانە»کەیدا «هەتا»ی لە رستەی «هەتا هات ساردی کرد، هەتا رۆیشت ئەخەوت» بەتەواوی روون نەکردۆتەوە، وەکو خۆی دەڵێ: «نازانین (هەتا) بە ئامرازی پەیوەندی دابینێین، یاخود سروشتی دووڕەگی بدەینێ. بەلای ئێمەوە «هەتا» لەو دوو نموونەیەی م. محەمەددا ئامرازی بەستن و گەیەنەرە (اداة عطف) بۆ کات.

د. کوردستان موکریانی، لە (ل١٨٦)ی کتێبەکەی «قواعد اللغة الكردية»دا، ئامرازی «تا»ی بە «اداة الربط»ی داناوە، بەشێوەی سادەیی و بە لێکدراوی و واتای کۆتایی دووری و کۆتایی ماوەی کات داناوەو، لەگەڵ ئامرازی (لە)ی پەیوەندیدا، ناوبراو دەڵێت: دەلالەت لە دیاریکردنی دووری و کات دەکات، ئەم بۆچوونەی د. کوردستان ئەگەر بیوتایە، سەرەتاو کۆتایی کات و، ماوەی دووری دەست نیشان دەکات، بەتەواوی راستی دەپێکا.

لێرەدا بەدواوە دێمە سەر دەربڕینی بیروبۆچوونی تایبەتی خۆم دەربارەی ئامرازی «تا» و روالەتەکانی تری، وەک (هەتا، تاکو، هەتاکو، هەتاوەکو، هەتاوەکی، تاوەکی)... کە هەموویان، یەک واتا دەبەخشن، بەلام لە رستەسازیدا، مەبەست و واتایان دەگۆڕێت.

چۆنیەتی باسکردنی «تا» بەم شێوانەی خوارەوە:

١- ئایە «تا» واتای هەیە، وەک وشەیەک لە وشەسازیدا.

٢- «تا» لەڕووی دارێشتنی مۆرفۆلۆژییەوە.

٣- دەوری «تا» لە زمانی کوردیدا.

٤- ئایە بۆچی «تا» نابێتە ئامرازی لێکدەری رستەی لێکدراو.

ئێستا دێینە سەر روون کردنەوەی یەکەیەکەی ئەم بابەتانەی سەرەوە:

١- ئایە (تا) واتای هەیە، وەک وشەیەک لە وشەسازیدا:

بەلای منەوە، «تا» ئەگەرچی تا ئێستا، بە وشەیەکی ناتەواو وشەبەند (مۆرفیمی بەند - Bound morphem)دا دەنرێت و، ناسراوەو، دەوری ئامرازی لە زمانی کوردیدا دراوەتێ، چ لە وشەسازیدا و چ رستەسازیدا، «تا» کورت کراوە «هەتا»، تاکو، تاوەکو، تاوەکی، هەتاوەکی»یەو، هەموو ئەو روالەتەتانەی «تا» واتای «رادەو دیاری کردن و سنوور بۆ دانانی شوێن و کات و رادەی رووداوی فرمان دادەنێت» و، بەتەنها «تا»ش (رادەو دیاری کردن) دەگەیەنێت، «تا» بەشێوە سادەکەی چەند واتایەکی تری لێ دەبێتەوە، وەک: «تا بە واتای تاکێک دێت.

کورت کراوەی وشەی «تاکێک یا تایەک»، دەبێت لەم بارەیدا و کەرتی دووەمیان کە (کێک، یەک)ە سواوەو سووک بۆتەوە، وەک: تا گەنمێکم کڕی، ئەم تاولەرزە گرانە، بارەکەم دوو تایە. «تا» لەم رستانەدا، بۆ دیاریکردنی «بار» هاتووە، هەروەها «تا» واتای نەخۆشی (تاولەرز، گرانەتا، تا) دێت و وەک واتای «تا» لەم رستانەدا: تا گرتمی، تام هاتێ، تام هەیە، تا نەخۆشییەکی پیسە، تا گرتوێتی، تا لاوازی کردووە، خۆت لە نەخۆشی تا دوور بخەرەوە...«تا» لەم رووەوە واتای «گرانی و قورسی» هاتووە، چونکە لەش قورس و گران دەکات و دانەگیرێت وەک تا لەشمی داگرتووە، تا بێهێزمی

کردووه. ئەم «تا»یە جیاوازە لە «تا»ی ئامراز، بەڵام لەڕووی ڕواڵەت و دەنگ و دەربڕینەوە، وەک یەکن بۆ روون کردنەوە دەڵێین: تا کەرکووک دەچم تا گرتمی ، نەخۆشی «تا» لە «تاوسەندنەوە» هاتووەو کورت بۆتەوە. «تاکو» و ڕواڵەتەکانی بەواتای «ئەوکاتە»ش دێت، وەک: تا ئەوکاتە لەسەریان بووم.

٢- «تا» لەڕووی داڕشتنی مۆرفۆلۆژییەوە:

١- سادە، وەک: تا

٢- ناسادە، وەک: تاکو، تاوەکو، تاوەکی، هەتاوەکو، هەتاوەکی، هەتاوەکونێ، تاوەکێنێ، هەتاوەکێنێ. لێرەدا «هەتا»و ڕواڵەتەکانی سەرەوە، لەدووبەشی یا دوو مۆرفیمی بەندی (وشەی ناتەواو - bound mor- pheme)، وەک: «هەر»ی ئامرازی تەئکید کردن و «تا»، «تاکو»ی ...(٤)، ئامرازی پەیوەندی بۆ پێکهاتنی وشەو گرێ و ڕستەی سادە و ئامرازی بەستنی (Conjunction)ی ڕستەی ئاڵۆزەوە پێکهاتووە. واتە لە «هەرتا - هەرتاکو)وە، وای دیاردەی کورت بوونەوەی دەنگ و سووک بوونی دەربڕین بۆتە «تا، هەتا» کە ڕادەو کۆتایی دەگەیەنێت و، بۆ مەبەستی دووەمی «ناسادە» گونجاوترە لە لێکدراو، چونکە وشەی «هەتا» و کەرتەکانی، وەک «هەر، تاوەکو» بەهۆی دیاردەی کورت بوونەوەو سووک بوونەوەی دەنگسازی، وەک نەمان و تێچوونی دەنگی (ر)ی هەرو (کو، وەکو)ی (تاوەکو)ەوە، وشەکە لە شێوە لێکدراوەیکەی پێشووی خۆی، وەک «هەرتاکو - هەرتاوەکو» دوای ئەم گۆڕانی دەنگسازییە، ڕواڵەتی وشەکە گۆڕاوەو دوور کەوتۆتەوەو، ئەم کەرتانەی وشەکە زیاتر لە داڕێژراوییەوە نزیکترن، وەک لە لێکدراوی، بۆیە وا چاکترە بڵێین «تا، هەتا» سادەو ناسادەن، چونکە ناسادە داڕێژراوو لێکدراویش دەگرێتەوە و، مەبەستی بنەڕەت و ئێستای وشە ناسادەکە لەڕووی شێوەوە دەپێکێت.

لەوانەیەو دووریش نییە لە (حتی)ی عەرەبییەوە هاتبێ و دەنگی (ح) ـــ (ه) چونکە بەهەمان مەبەست بەکاردێت، وەک: حتی ـــ هەتا.

## دەوری «تا» لە زمانی کوردیدا:

٣- «تا» لە زمانی کوردیدا، دەوری جیاجیای هەیە، لێرەدا بەپێی هەست پێکردن و، هەبوونی ئەو دەورانەی، لە شوێنی خۆیدا پێشان ئەدەین و، مەبەستی جیاواز جیاوازی لەڕووی بەکارهێناوەوە دیارو دەست نیشان دەکەین. ئەم دەورانەی «تا»، وەک وشەیەکی سەربەخۆ، لە وشەسازی «مۆرفۆلۆژی» و، وەک ئامرازێکیش لە ڕستەسازیدا (سینتاکس) بەدەردەخەین؛ وەک:

١- دەوری «تا» وەک وشەیەکی واتادار دەبێتە ناو

٢- دەوری «تا» لەڕووی داڕێشتنی وشەسازیدا

٣- دەوری «تا» لەڕووی ڕستەسازیوە؛ سێ جۆرە:

أ- وەک ئامرازی پەیوەندی ڕستەی سادە.

تا ـــــــ ب- ئایە «تا» دەبێتە ئامرازی ڕستەی لێکدراو.

جـ- «تا» وەک ئامرازی گەیەنەری ڕستەی ئاڵۆز.

١- دەوری «تا» وەک وشەیەکی واتادار دەبێتە ناو، «تا» بەڕای من لەڕووی شێوەو دەربڕینەوە (الشکل و التلفظ) وەک ئامرازو وشە، وەکو یەکن و، لە ڕستەدا نەبێت بەجیا، جیاواز ناکرێتەوە؛ وەک لەم ڕستانەدا: لە ترسانا تا گرتی، تام هەیە، تا کوشندەیە، ناون، ئەگەر لەگەڵ ئەم ڕستانەی لای خوارەوەدا، بەراوردیان بکەین، شێوەوە دەربڕینیان یەکە: وەک: تا کەرکووک دەچم، تا ئێرە وەرە، تا سەریان بڕۆ.

ئەم دوو جۆرە ڕستانەی سەرەوە، مەگەر «هەتا» یان بۆ بەکار بهێنین، ئەگینا

بەشێوەی «تا» جیاوازییان نییە، تەنها لەڕووی واتاوە نەبێت. ئەمە لەلایەک، لەلایەکی ترەوە، دوو جۆر رستە پێشان ئەدەین؛ لەڕووی دەربڕین شێوەیەکن و لەڕووی واتاشەوە دوو لایەنن (٥) وەک:

تا گرتی ـــــ تا گرتی، («تا» لێرانەدا بۆ کاتی رووداني فرمانە)
(«تا» بۆ نەخۆشی ناوە) تا گرتمی ـــــ تا کوشتویتی
تا کوشتویتی ـــــ
تا سووتاندمی ـــــ تا گرتمی

**دوو شتی جیاوازن**

«تا»ی رستەکانی بەشی یەکەم، واتای ناوی نەخۆشی «تا» دەگەیەنێت، لە رستەکانی بەشی دووەمدا «تا»، وەکو ئامرازێک، کاتی رووداني فرمانەکان دیاری دەکات، کە بەردەوامی رووداني پێشان دەدات. هەرچەندە، ئەم رستانەی سەرەوە، بەوەی کە ئەگەر رستەیەک دوو واتا بگرێتە خۆی، وەک ئەوانەی بەشی یەکەم، بابەتێکی تایبەتییەو سەر بەزانستی واتاسازییە، کە دیاردەو بابەتی «بنج و سیمای رستەی کوردی دەگرێتەوە، بەوەی رستەیەک یا وشەیەک دوو واتاو مەبەست بپێکێت و، سەر بە «فرەواتان (Polysmy)، کە ئەبێتە هۆی دیاردەی تەمومژی (Ambiguity) لە زماندا، بەهۆی پەیوەندی وشەکانی دەوروبەرییەوە، لە یەکتر جیادەکرێنەوەو روون دەکرێتەوە.

ئەمەش بریتییە لە شیکردنەوەی بنجی وشەکانی ناو رستە (البنیه العمیقه) (Deep Structure)

**«تا» وەک ئامرازی پەیوەندی لە داڕشتنی وشەدا**، بەتایبەتی لە پێکهاتنی گرێدا (Phrase) دەوری خۆی لە وشەسازیدا دەبینێ؛ وەک ئەم وشانە:

(شەو تا بەیان. رۆژ تاشەو، تابەکەی، لێرەوە تا کەرکووک، لە بەیانییەوەی تا ئێوارە، شەو هەتا بەیانی، تا بەهارێ، تا چلەی زستان، تا ناو ئاوایی، تا نێرکەی بەهار (تا گەرمەی بەهار)، تا ئەسحابە سپی، تا چیای خاڵخاڵان، تا هەردەی ماسقەلان، تابان شیوە سوور، تا دەمەو ئێوارە، تا دەمەو بەیان،..) هتد.

## دەوری «تا» لە رستەسازیدا

ئامرازی پەیوەندی لە رستەی سادەو، لە رستەی ئاڵۆزیشدا، وەکو ئامرازی بەستن و گەیەنەر دەوری جۆربەجۆری هەیە، وەکو مەبەستی جیاوازی بەکارهێنان؛ وا لە خوارەوەدا، جۆری ئامرازی «تا» و رواڵەتەکانی تری، ئەرکی جیاجیای بەکارهێنانی لەم شێوانەی خوارەوەدا روونده‌کەینەوە :

أ- «تا» وەک ئامرازی پەیوەندی رستەی سادە:

لە رستەی سادەدا ئەم دەورانەی خوارەوە دەبینێ:

١- تا کەرکووک دەچم. (بۆ دیاری کردنی کۆتایی شوێنی روودانی فرمانە).

٢- هەتا ئێوارە لێی دەخەوم. (بۆ دیاری کردنی کۆتایی کاتی روودانی فرمانە).

٣- ترێ تا پایز دەمێنێ. (بۆ دیاری کردنی کۆتایی کاتی روودانی فرمانە)

٤- هەتا هەتایە نیشتمانەکەم لەبیر ناکەم. (بە دووبارەکردنەوەی بەردەوامی و کاتی فرمانە).

٥- هەتا هەتایە کوردو عارەب برایە. (بۆ هەمان مەبەستی پێشوو).

٦- لە هەولێرەوە تاکو مەهاباد بەپێ رۆیشتم. (ئەگەر «تا» کەوتە نێوان دوو ناوی شوێنەوە، سەرەتا کۆتایی ماوەی شوێن و کاتی روودانی فرمان دیاری دەکات).

٧- شەو هەتاکو بەیانی دەخوێنمەوە. (سەرەتاو کۆتایی ماوەی کاتی ڕوودانی فرمان دیاری دەکات چونکە (تا) کەوتووتە نێوان دوو ناوی کاتەوە).

ئامرازی «تا»ی پەیوەندی لەم ڕستانەی سەرەوەدا، (یەک) حاڵەتی ڕووداو پیشان ئەدەن، واتە چ لە سەرەتای کاتەکەوە بێت، تا کۆتایی، یان لەسەرەتای شوێنی ڕووداوەکەوە، تا کۆتاییەکەی هەمان شتەو، پێچەوانەی یەکتر نین، بەڵام لە ڕستەی ئاڵۆزدا «تا» (حاڵەتی جیاواز) بەهۆی فرمانەوە پیشان ئەدات - پاشان ئەمە لە ڕستەی ئاڵۆزدا ڕوونی دەکەینەوە، بەڵام بۆ نموونە سەیری ئەم ڕستە ئاڵۆزە بکە:- هەتا دیاربەکر دەچم و دەگەڕێمەوە. (چوون و گەڕانەوە پێچەوانەن).

ئامرازی «هەتا» جۆرە بەکارهێنانێکی تری هەیە لەگەڵ ئاوەڵفرمانی کات و شوێنیدا، کە خۆیشی دەوری ئاوەڵفرمانی تیا دەبینێ وەک:

١- تائێستا ئاریانی هاوڕێم نەهاتووە. (ئاوەڵفرمانی کاتییە)

٢- غەواسە هەتاکو بنی دەریا دەڕوا. (ئاوەڵفرمانی شوێنییە)

٣- هەتا سەرەوە چووم. تا ژێر ئاوەکە چووم. (ئاوەڵفرمانی شوێنییە)

ئامرازی «هەتا» لە ڕستەدا، ئەگەر کەوتە ڕستەیەکی فرمانی ناتەواوەوە، وەڵام بێت بۆ ڕستەیەکی پرسیاری، کە بەئامرازی «چەند، چییە» پرسیاری لێوە بکرێت، لەو حاڵەتەدا «ڕادەو پێوانە» ئەبەخشێت؛ وەک:

- لێرەوە تا کەرکووک ٢٥٠ کیلۆمەترە

- لێرەوە هەتاکو مەککە سۆفی سەر بەڵەکە. (فۆلکلۆر)

ئامرازی «تا»ی پەیوەندی لە شوێنی ئامرازەکانی تری پەیوەندی، وەک (بۆ، بە) بەکار دێت و شوێنی خۆی دەگۆڕێتەوە، بەڵام مەبەستی ڕستەکە، بەتەواوی دەگۆڕێت بۆ نموونە:

بۆ ـــــــ تا

بۆ سلێمانی دەچم. ( ـ بۆ ـ لێرەدا بۆ ئیتیجاهە)

تا سلێمانی دەچم. (کۆتایی شوێنی روودان پیشان ئەدات)

من بۆ خوێندن هاتووم. (بۆ لێرەدا بۆ ئامانجە دەوری خۆی ناگۆڕێتەوە بە «تا» چونکە «بۆ» لێرەدا بۆ شوێن نییە)

تا × ناگۆڕێت

هەتا بەغدا دەچم. (کۆتایی شوێنی روودانی فرمانە)

بە بەغدادا دەچم. (تا ـــــ> بە: ئاوەڵفرمان دەبەخشێت)

ئەم رستاتەی سەرەوە، ئەوە دەردەخەن، کە ئامرازی «تا، هەتا»، لە رستەدا دەگۆڕێن بەئامرازی (بۆ، بە)ی پەیوەندی، بەمەرجێک بۆ شوێن بن؛ بۆ کاتیش هەمان شتن، وەک:

تا ئێوارە لێرە دەڕۆم. (تا: بۆ ماوەی کاتی رووداننە)

تا ـــــ> بە

بۆ ئێوارە لێرە دەڕۆم. (بۆ: کۆتایی کاتی رووداننە)

تا شەو نان ناخۆم. (تا: ماوەی کاتی رووداننە)

تا ـــــ> بە

بەشەو نان ناخۆم. (بە: دیاری کردنی کاتە)

ئەم دیاردەیەی ئاڵوگۆڕی ئامرازی «تا»، بە ئامرازی (بۆ، بە)ی پەیوەندی لەو شوێنانەی کە مەبەستی شوێن (ئاوەڵفرمان) بەکاردێن، لە رستەی ئاڵۆزیشدا (ئاوێتە) دەکەونە تەک ناوی شوێنەوەو، بۆ هەمان مەبەست بەکاردەهێنرێن، کەچی ئەم دیاردەیەی گۆڕانەی «تا» بە «بۆ، بە» یا بەپێچەوانەوە، لەگەڵ

مەبەستەکانی تری ئەم ئامرازی «تا»یەی جۆرەکانی تری رستەی ئاڵۆزدا بەکارناهێنرێت، بۆ نموونە:

تا رواندز چوو کەسی نەدی.

تا ـــــ بۆ (لێرەدا «تا» ـــــ بۆ)

بۆ رواندز چوو کەسی نەدی.

تا سەری ساڵ چاوەڕێم کرد نەهات. (بۆ: ماوەی کاتی روودانە)

بۆ سەری ساڵ چاوەڕێم کرد نەهات. (تا: کۆتایی کاتی روودانە)

تا شەو چاوەڕێم کرد نەهات. (تا: ماوەی کاتی رووداني فرمانە)

بەشەو چاوەڕێم کرد نەهات. (بۆ: بەدیاریکردنی کاتی روودانە)

دیارەی گۆڕانی ئامرازی «تا»، بە ئامرازی «بۆ، بە» لە رستەی ئاڵۆزی کاتدا کەمترە وەک بۆ مەبەستی شوێن. ئامرازی «تا» و رواڵەتەکانی تری لە رستەی لێکدراودا وەکو ئامرازی پەیوەندی، سەر بەیەکێک لە رستە سادەکانیدا بەکاردەهێنرێ، کە وەکو ئامرازی لێکدەری رستە لێکدراوەکە، نموونە:

تا دهۆک دەچم دەگەڕێمەوە. (تا: لێرەدا ئامرازی پەیوەندی رستەی سادەیە)

ئامرازی تا و رواڵەتەکانی تری، لەگەڵ ئامرازی «ش»ی پەیوەندی دا، بەکاردەهێنرێت و، ئامرازی «ش»ی پەیوەندیش «پەیوەند شتێک پیشان ئەدات، کە لەوە پێش باس کرابێت و بۆ (تەئکید)کردنی ئەو وشانەیە، کە دەچێتە سەری لەناو، ناوی شوێن و کات و فرمان و راناو. نموونە:

هەتا هەورامانیش چووم.

تاکو ئێوارەش پێکەوە بووین.

٢- ئایە «تا» دەبێتە ئامرازی رستەی لێکدراو:

«تا»و رواڵەتانی تری ناتوانن دەوری ئامرازی لێکدەری رستەی لێکدراو

ببینن و، بەو شێوەیەی کە هەردوو لای رستەکە، لەرووی واتاوە سەربەخۆبن و، یەک کێش و قورساییان هەبێت و، بەو شێوەیەی کە ئامرازی «تا»ش سەربەخۆ بێت و، سەر بەهیچ لایەکی رستەکان نەبێت و، تەنها ئەرکی لێکدانی هەردوو رستە سادەکانی گرتبێتە ئەستۆ؛ کەچی «تا»لەهەر لایەک لەگەڵ هەر فرمانێکی رستەی دوو فرمان بێت، ئەو بەشە رستەیەی ئامرازی «تا»، دەبێتە رستەیەکی شوێنکەوتووی، رستە سەرەکییەکەی تر، بۆیە ئامرازی «تا» و شێوەکانی تری وەک «هەتا، هەتاکو، تاکو، تاوەکو».. نابنە ئامرازی لێکدەری رستەی لێکدراو، بەڵکو ئامرازی گەیەنەر و، بەستنی رستەی ئاڵۆزەو نموونەکانی رستەی ئاڵۆز، دەبنە بەڵگەی راستی بۆچوونمان.

### ٣- «تا» وەک ئامرازی گەیەنەری رستەی ئاڵۆز:

ئامرازی «تا» و شێوەکانی تری، دەورێکی چالاکیان هەیە، لە پێکەوە بەستانی بەشەکانی رستەی ئاڵۆز لە لارستەو (الجملە التابعە) شارستە (الجملە الرئیسیە) لەم رووەوە، دەوری جیاجیای بەکارهێنانی ناو رستە ئاڵۆزەکە دەبینین و دەکەونە تەنیشت لارستەکەوەو، لەرووی داڕێشتن و واتاشەوە بەشێکن لەو و ناتوانرێ وازی لێ بهێنرێت و لێرەدا بەنموونەوە دەورو مەبەستە جیاجیاکانی ئامرازی «تا، هەتا»... دەخەینەروو، وەک:

- تا دەڵێی بەرسیلەترێ پێدەگات. (کۆتایی کاتی روودانی فرمان)
- پارو هەتاکو نەجورێ قوت نادرێ. (بۆ مەرجە)
- هەواڵم بۆ نارد تاکو ئاگای لەخۆی بێت. (بۆ هۆیە)
- هەتا دەتوانێت لە رێگا خێرابڕۆ. (رادەی روودانی فرمانە)
- دانیشت هەتاوەکو بحەسێتەوە. (بۆ مەبەستە)
- ئیشەکەی سەری نەگرت تا لە داخا رۆیشت. (بۆ ئەنجامە)-

- هەتا ئەم دەنگوباسە بێت ناحەسێتەوە. (بەردەوامی ڕوودانی فرمانە)
- ڕۆژێ سێ تا چوار نان دەخۆم. (چەندێتی یە).

ئامرازی «تا»ی گەیەنەری ڕستەی ئاڵۆز، لەگەڵ ئاوەڵفرمانی شوێنیدا (مەبەست و هۆ رادەگەیەنن و، وەڵامی پرسیارێکن بەهۆی ئامرازی (بۆچی، چی)ی پرسەوە پرسیاری لێ کرابێت؛ وەک:

- خۆی دایە پاڵ بەردەکە تا نەگوژرێ (مەبەستی ڕوودانی فرمانە)
- لادێییە هەژارەکان دەچنە شار تا کاریان دەست بکەوێت. (هۆیە)

ئامرازی «تا» لەگەڵ پاڕسەی بەرکاری شاڕستەکەیدا (رادە پیشان ئەدات)؛ وەکو:

فەرمانیان دا کار بکەن تا دەست پان نەکەنەوە.

ئامرازی «تا» چۆن لەگەڵ ئامرازی پەیوەندی (ش، یش) لەرستەی سادەدا، بەکارهات و، لەمەو پێشەوە نموونەمان بۆ هێنایەوە، لە ڕستەی ئاڵۆزیشدا ئەم دیاردەیە لەگەڵ «تا»ی ئامرازی گەیەنەردا، بەدی دەکرێ بۆ تەئکیدکردنی دەوری «تا» لەو شوێنانەی، کە بەکاردێت وەک:

- تا ناو شوانیش چووم گەنمم دەست نەکەوت. (تەئکید کردنی شوێن)
- هەتا بەهاریش تەواو بوو، خەڵکی دەهاتە لامان. (تەئکید کردنی کاتی ڕوودانی)

هەتا ئاڤانیشم دیت: قسەم لەگەڵ نەکرد (تەئکید کردنی رادەی ڕوودان فرمان)

- پێم بڵێ تاوەکو منیش چاوەڕێتان بکەم. (تەئکیدکردنی بکەر لە بەشداری ڕوودانی فرمان کە راناوی کەسییە).

ئامرازی «تا» لە رستەی ئاڵۆزدا دەوری ئاوەڵفرمانی دەبینێ لەگەڵ فرمانی پاڕستەکەدا، بۆ کاتی شاڕستەکە لە باری نەبوونی ئاوەڵفرمانی کاتی لە

رستەکەدا وەک:

هەتاوەکو ئالا هات ئاڤێستا ڕۆیشت. (هەتا وەکو ئالا هات - پا رستەیە «الجملە التابعە»).

**دیاردەیەکی ئامرازی «تا» لە رستەدا:**

ئەگەر ئامرازی «تا» کەوتە نێوان دوو وشەی دژ واتاوە، لە رستەیەکی سادەدا، وەکو ئامرازی پەیوەندی، بۆ نموونە وشەکانی: شەو - ڕۆژ، هاوین- زستان، بەیانی - ئێوارە، گەرمیان- کوێستان...هتد ئەوا دەوری ئامرازی «تا» بێجگە لەکات و شوێن، لەگەڵ فرمانەکەدا یەک ڕووداوو دیاردە پیشان ئەدات.

- شەو تا بەیانی دەخەوم. (ڕوودانی ڕووداوی فرمانەکە تەنها خەوتنە)
- لە گەرمیانەوە هەتاکو کوێستان پێشوازی تەرمی شێخی نەمریان کرد.

ئامرازی «هەتاکو» لە نێوان دوو ناوی دژواردا، تەنها ڕووداوی پێشوازی کردنی گرتۆتەوە، یاخود ماوەی نێوان دوو شوێن، یا دوو کات پیشان دەدات، کە لەڕووداوی فرمانی رستەکە، وەکو یەکن و بریتین لە یەک ڕووداوی فرمان، نموونەی تر:

- لێرەوە هەتا مەککە سۆفی سەر بەڵەکە. (نێوان ئێرەو مەککە یەک شتە)
- شەو تا بەیان دەگرین. (لە نێوان شەو و ڕۆژدا تەنها ڕووداوی گریانە)

هەمان ئەم دیاردەیەی ئامرازی «تا»، ئەگەر بکەوێتە نێوان دوو فرمانەوە لە یەک دۆخی ڕوودانابن وەک لە باری ئەرێ دابێت، یەک ڕووداوی وەک یەک پیشان ئەدات وەک:

- تا دەمێم دەخوێنم. (مان و کارکردن یەک ڕووداوی وەک یەکن)
- هەتا مردن کردنە. (مان و کارکردن پێچەوانەی یەکتر نین)
- هەتا دەتوانیت تێبکۆشە. (توانین و تێکۆشان یەک ڕووداون)

ئەگەر «تا» کەوتە نێوان دوو فرمانی دژ واتاوە، یا دووەم نەفی حاڵەتی

فـرمـانی یەکـەم بـکات، ئەوا ئامـرازی «تا»ی رسـتـەی ئاڵۆز، بە پێـچـەوانەی دیاردەکەی سەرەوەیدا دوو رووداو، یا حاڵەت و باری دژ بەیەکتـر پیشـان ئەدات وەک:

- دەگریم تا پێدەکەنم.
- هەتا ماوم درۆ ناکەم.
- هەتا بمێنم قسەی لەگەڵ ناکەم.

**ئەنجامی لێکۆڵینەوە.**

ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەم ئەنجامانەی گرتۆتە خۆی:

١- «تا» و رواڵەتەکـــانی تری بەتەنهـــا بە واتای (رادەو کـــۆتایی و سنووردانان) دێ.

«تا» وەک وشـەو، وەک ئامـرازیش، لە زمـانی کـوردیدا بەکـاردێت، بەڵام دەوری وەکو ئامرازی لەبەکارهێناندا چالاکترو جۆربەجۆرترە.

٣- «تا ، هەتا» کورت کراوەی وشەی لێکدراوی «هەر تاوەکو» ، لە ئەنجامی لێکچوون و سوان و کورت بوونەوەی دەنگدا بۆتە «تا ، هەتا» .

٤- وەک ئامرازی پەیوەندی، لە دارێشتن و پێکهاتنی وشەو گرێدا بەکاردێ و لە رستەی سادەشدا دەوری ئامرازی پەیوەندی دەبینێت.

٥- «تا» نابێـتـە ئامـرازی لێکدەری رسـتـەی لێکدراو، بەڵکو دەورێکی چالاک و مەبەستی جۆربەجۆر دەبینێ وەکو ئامرازی گەیەنەری رستەی ئاڵۆز.

٦- «تا» وەکو ئامرازی پەیوەندی رستەی سادە شوێنی خۆی لەگەڵ ئامرازی تری پەیوەندی وەک (بۆ، بە) دەگـۆرێتـەوە، بەڵام مـەبەسـتی رسـتـەکـە لەرووی واتاوە دەگۆرێ، ئەم دیاردەیە بەزۆر لەو رستـانەدایە کە بۆ شوێن و کاتن بەپلەی یەکەم کە بۆ شوێن بن.

٧- ئامــرازی «تا» و شــێــوەکــانی تری، لەگــەڵ ئامــرازی (ش -یش) بۆ تەئکیدکردنی لە رستەی سادەو ئاڵۆزیشدا، بەمەبەستی جیاجیا و لەگەڵ ئامرازی (هەر)یشدا بۆ هەمان مەبەست بەکاردێ.



**خشتەی ژمارە (١)**

## دەوری تا لە زمانی کوردیدا

## پەراوێز:

١- ئامرازی پەیوەندی: بریتییە لەو ئامرازانەی کە پەیوەندی دەخاتە نێوان وشەکانی زمانەوە، لە (ناو) و (ئاوەڵناو) و بەشە ئاخاوتنی ترەوە لەوشەسازیداو واتایان لە پاڵ وشەکانی تردا لە دروست کردنی رستەدا دەردەکەوێت و تێکەڵ بەدارِشتنی رستەکە دەبن.

٢-ئامرازی لێکدەر: بریتییە لەو ئامرازانەی کە ئەرکی لێکدانی دوو رستەی سادەی سەربەخۆی واتادار دەبەستێت بەیەکترەوە و سەر بەهیچ لایەکی ناو رستە لێکدراوەکە نییەو پارسەنگی هەردوو رستەکانی هەیەو تێکەڵ بەدارِشتنی واتا نابێت.

٣- ئامرازی گەیەنەر: ئەو ئامرازانەی کە ئەرکی بەستن و گەیاندنی لا رستەیەکی شوێنکەوتووی ناسەربەخۆ دەبەستێتەوە، بەشارِستەکەوە، کە واتاکەی بەندە پێوەی و ئامرازەکانیش تێکەڵ بەدارِێشتنی واتای لارِستەکە بوون و، مەبەستی رستەکەش دیار دەکەن.

٤- بروانە بیرورِای نوری، عەلی ئەمین دەربارەی ئامرازی (هەتا) لە (ل٣٩٥)ی کتێبی «رێزمانی ئاخاوتنی کوردی» لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆرِی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .

٥- بروانە. د. وریا عومەر ئەمین، بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، بەغدا، ١٩٨٩، ل٧٢-٧٦ .

## سەرچاوەکان:


١- ک. ک. کوردۆییڤ، ڕێزمانی کوردی بەکەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی. د. کوردستان موکریانی لە زمانی روسییەوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر، ١٩٨٤.

٢- د. کوردستان موکریانی - قواعد اللغه الكرديه - بغداد ١٩٨٩ .

٣- لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆر، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٩٧٦ .

مەحموود فتح الله، کارتەواوکردن لەزمانی کوردی، نامەی ماجستێر، ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٨ .

٥- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی ، چاپخانەی کامەران - سلێمانی ١٩٦٠ .

# دەوری «ب»
# لەڕووی وشەسازییەوە

مۆرفۆلۆجی زانستێکە، لە پێکهاتن و شێوەی گۆڕانی وشەی زمان دەکۆڵێتەوەو، کەرەسەی لێکۆڵینەوەی ئەم ئاستە، واتە (مۆرفۆلۆجی)، مۆرفیمە، مۆرفیمیش بەردی بناغەی پێکهاتنی وشەی زمان دەگەیەنێت و دادەنرێت. ئەو مۆرفیمەی دەوری داڕێشتنی وشە دەبینێ، بەمۆرفیمێکی مۆرفۆلۆجی دەژمێردرێ و، مۆرفیمیش بە بچووکترین پارچەی واتاداری زمان دادەنرێت، کە واتادار بێ، ئەرکی ڕێزمانی ببینێ و، کە نەتوانرێ لەوە زیاتر بچووکتر بکرێتەوە، چونکە بچوک کردنەوەی، واتاو ئەرکی مۆرفیمی، خۆی لەدەس دەدات.

ئەمە وەکو سەرەتایەک، بۆ باسەکەمان پێویست بوو، بخرێتەڕوو، ئەوەی ئێمە لێرەدا، مەبەستمانە بیخەینەڕوو، لێکۆڵینەوەی لە بارەیەوە ئەنجام بدەین، مۆرفیمی «ب»ی مۆرفۆلۆجییە، کە دەوری خۆی لە پێکهاتنی وشەی تازەدا دەبینێ بەچوونەسەر، وشەی تر کە واتای تازەی دەداتێ.

مۆرفیمی «ب» لە وشەسازی کوردیدا، دەوری جۆربەجۆری داڕێشتن دەبینێ، لە دروست کردنی وشەی تازەی سەر بەئاستی مۆرفۆلۆجی.

ئەوەی لەم باسەدا، ڕوونی دەکەینەوە، دەربارەی مۆرفیمی «ب» و دەوری لە

وشەسازی کوردیدا، ئەم مۆرفیمە، یەک شێوەی (مۆرف)ی هەیە لەناو قاڵبی پێکهاتنی وشەکاندا، واتە بەیەک شێوە لە داڕێشتنی وشەی مەبەست جیاجیا دەردەکەوێ.

مۆرفیمی «ب» یا پێشگری «ب» ئەم دەورانەی هەیە، لە داڕێشتنی وشەسازی کوردیدا:

١- بەشداری لە داڕێشتنی فرمانی داخوازی، وەکو پێشگرێک دەکات، بەم شێوەیە لە ڕەگی ڕانەبردوو فرمانی تێپەڕو تێنەپەڕەوە:

مۆرفیمی وشەداڕێژ + ڕەگی ڕانەبردوو + ڕاناوی لکاو

ب + نووس + ە/ن ـــــ بنووسە - بنووسن

ب + کڕ + ە/ن ـــــ بکڕن (بۆ تاک و کۆ)

ب + فڕ + ە/ن ـــــ بفڕە - بفڕن (بۆ تاک و کۆ)

ئەم جۆرە داڕێشتنەی فرمانی داخوازی، بەهۆی پێشگری (ب)ەوە، لەگەڵ ڕەگی ڕانەبردووی فرماندا، کە بەهۆی دەستوورێکی تایبەتییەوە وەردەگیرێ(١).

٢- «ب» وەکو مۆرفیمێکی وشە داڕێژ، فرمانی ڕابردووی مەرجی دروست دەکات لە ڕەگی فرمانی ڕابردووی فرمانی تێنەپەڕەوە:

پێشگری مەرجی + ڕەگی ڕابردووی فرمان + پاشگری (ایە)

ب + کەوت + ایە ـــــ بکەوتایە

ب + خوارد + ایە ـــــ بخواردایە

ب + سووتا + ایە ـــــ بسوتایە

ب + کێڵا + ایە ـــــ بکێڵایە

٣- مۆرفێمی «ب» و داڕێشتنی فرمانی ڕانەبردووی (ئیلزامی) لە ڕەگی ڕانەبردووی تێنەپەڕو تێپەڕەوە بەم شێوە پێشگری (ب) + ڕەگی ڕانەبردووی تێپەڕو تێنەپەڕ + ڕاناو

ب + نووس + م ـــــ بنووسم

ب + کڕ + م ـــــ بکڕم

ب + فڕ + م ـــــ بفڕم

ب + خەو + م ـــــ بخەوم

٤- مۆرفیمی «ب» ناوی بکەر لە رەگی رانەبردووی فرمانی تێپەڕەوە دروست دەکات(٢)، یا هەندێ جار بەتایبەتی بەشێوەی لێکدراوی ئاوەڵناوی بکەر دروست دەکات واتە ئەگەر رەگەکە وشەیەکی واتاداری لەگەڵدابێ؛ نموونە:

بۆ ناوی بکەر

پێشگری (ب) + رەگی رانەبردووی(٣) تێپەر = ناوی بکەر

ب + کڕ ـــــ بکڕ لە (کڕی) رەگی رابردوو

ب + نووس ـــــ بنووس لە (نووسی) = =

ب + گێر ـــــ بگێر لە (گێرا)

ب + کوژ ـــــ بکوژ لە (کوشت) = = گۆڕینی (ش ـــــ ژ)بەپێی یاسای گۆڕین(Dissimilation)دەنگی(ش)بۆتە (ژ).

ب + بڕ ـــــ ببڕ لە (بڕین) = =

بۆ ئاوەڵناوی بکەر:

ئاوەڵناوی بکەر:

ئاوەڵناو + پێشگری (ب) + گیر ـــــ رەشبگیر

زۆر + ب + لێ ـــــ زۆر بلێ (رەگی - وتن - (لێ)یە)

لە چاوگە ناوێزەکان رەگی رانەبردووی فرمانی تریش ناوێزەن وەکو کوژ لە (کوشتن)ەوە، گەز لە (گەستن)ەوە.

خۆر لە (خواردن)ەوە بەهۆی گۆڕانی فۆنۆلۆجییەوە کپ کار دەکاتە سەر ئاوازدارو دەیگۆڕێ و کپی دەکات یا بە پێچەوانەوە بەپێی یاساکەی

پێشو(گۆڕین).

٥- پێشگری (ب) لە رەگی رانەبردووی تێپەڕەوە فرمانی بکەر نادیار بەشێوەی (گومان و مەرج) دروست دەکات دەشێ پێی بوترێ زمانی بکەر نادیاری مەرجی بۆ رابردوو

پێشگری (ب) + رەگی رانەبردوو + نیشانەی تێپەڕی نادیار + نیشانەی کاتی رابردوو

ب + نووس + ر + ا ـــــ بنووسرا

ب + کێڵ + ر + ا ـــــ بکێڵرا

بۆ رانەبردوو بەهەمان شێوەی رابردووە تەنها نیشانە(١)ی کاتی رابردوو دەگۆڕێ بە (ی) بۆ کاتی رانەبردوو، بەم جۆرە:

ب + نووس + ر + ێ ـــــ بنووسرێ

ب + کێڵ + ر + ێ ـــــ بکێڵرێ

ب + کوژ + ر + ێ ـــــ بکوژرێ

بە زۆری لەم نیشانەی (ر)ی نادیاری، لەلایەن رێزمان نووسەکانەوە، بەتایبەتی ئەوانەی شوێن رێزمانی کۆن کەوتوون، لەگەڵ نیشانەی کاتی رابردوو (ا)و(ێ) رانەبردوویە تێکەڵیان کردووەو بە (را)ی ناودەبەن، بۆ رانەبردوویش بە (رێ)، کە راستییەکەی ئەمە هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە ئەم نیشانەیە، لە دوو مۆرفیم پێکهاتووە (ر)ی نادیارو (ا) و (ێ) نیشانەی کاتی رابردوو رانەبردوویی.

دوای ئەوەی دەوری پێشگری (ب)، لە داڕێشتنی فرمانی داخوازی و، فرمانی رابردوو و رانەبردووی مەرجی (ئیلزامی) و ناوی بکەرو ئاوەڵناوی بکەرو فرمانی بکەر نادیاری مەرجی خستە پێش چاو، ئەوەمان بۆ روون دەبێتەوە، کە لەو شوێنە جیاوازانەدا، پێشگرو مۆرفیمی (ب) بەیەک شێوە

(مۆرف) چەند داڕێشتن و مەبەستێکی جیاواز، وەک ئەرک و دەور لە داڕێشتن دەگرێتە خۆی بەم جۆرە:

بخۆ، بڕۆ، بنووسە، (بۆ داخوازی)

بکەوتایە - بنووسیایە (بۆ رابردووی مەرجی)

ب بکەوم - بنووسم - بچم (بۆ رانەبردوو مەرجی)

بخۆر - بکڕ - بفرۆش - رەشبگیر (ناو و ئاوەڵناوی بکەر)

بکێڵرا - بکێڵرێ (فرمانی بکەر نادیار رابردوو و رانەبردوو)

بەمەدا دەرکەوت مۆرفیمی «ب» بەیەک شێوە بۆ چەند مەبەستێک بەکاردێت و لەم وێنەیەدا روونی دەکەینەوە:




| فرمانی داخوازی تاک کۆ | رابردووی مەرجی | رانەبردووی ئیلزامی | ناو ئاوەڵناوی بکەر | فرمانی بکەر نادیار رابردوو | فرمانی بکەر رانەبردوو | بەپێی یلسلی ئارەزوو |
|---|---|---|---|---|---|---|
| بنووسە/ن بنووسن بکەوە بکەون | بنووسیایە بکەوتیایە بکەوتنایە | بنووسم بخۆم بکەوم بکەوین | بنووس بکرو بفرۆش لەگەڵ تێنەپەڕدا دەرناکەوێ | بکێلر بنووسرا هەمان یاسا | بکێڵرێ بنووسرێ هەمان یاسا | دابخە داخە سەربکەوە سەرکەوە |

خشتەی ژمارە «٢»

لێرەدا دەرکەوت، جیاوازییەک نابینرێ، لە نێوان شێوەی (ب)، بۆیە ئەم دیاردەیە، ئەوەمان بۆ روون دەکاتەوە، کە مۆرفێمی مۆرفۆلۆجی، بەیەک شێوە (مۆرف)، بۆ چەند مەبەستێکی جیاواز بەکاردەهێنرێ و، بێ ئەوەی لەناو ئەو شوێنە جیاوازانەدا، شێوەی خۆی بدۆڕێنێ بۆ ئەوەی ئەمە باشتر بسەپێنین و، بکرێتە یاسایەکی مۆرفۆلۆجی، چەند مۆرفیمێکی مۆرفۆلۆجی تر، بەهەمان شێوەی نەگۆڕی مۆرفێمی (ب)، لە شوێنی مەبەست جیاوازانەی، شێوەی شەرتی خۆی بگۆڕێت، وەک مۆرفێمی (دە)ی بەردەوامی یەک شێوە دەگرێتە خۆی لە دوو مەبەستی جیاوازدا، وەک:







لێ (دە) مۆرفێمی بەردەوامییە، بەڵام بەردەوامیێکەی دوو حاڵەت و بارودۆخی دارێشتنی جیاوازی وشەسازی کاتی رابردوو، رانەبردوو پیشان ئەدات، کە دوو تافی جیاوازی فرمانن و قاڵبی دارێشتنی فیزیاوییان لە یەکتر جیاوازن، کە چۆتە سەر رەگی رابردوو و رەگی رانەبردوو.

مۆرفێمی یا نیشانەی (١)ی کاتی رابردوو، لەگەڵ (ێ) نیشانەی کاتی رانەبردوو، لە هەموو فرمانە کۆتایی هاتووەکان بە(ا)ی رابردوو، کە لە رانەبردوودا دەگۆڕێ بە (ێ) لە گەردان کردندا شێوەکانی خۆیان نادۆڕێنن و، تەنانەت ئەم دوو نیشانەیە، لەگەڵ رەگی رابردووی فرمانی بکەر نادیارو، رەگی رانەبردوویيدا، دەرئەکەون بێ ئەوەی لە گەردانی ئەو دۆخانەیدا، شێوەیان

بگۆڕین بۆ نموونە:

| | | | |
|---|---|---|---|
| | سووتام | | دەسووتێ م |
| کوژرا | خنکام | ا ــــ ێ (رانەبردوو) | دەخنکێ ن |
| کوژران | خنکای | بۆ نادیاری ــــ | دەکوژرێ م |
| | | | دەکوژرێن |

بەکورتی ئەو نیشانانەی، کە حاڵەتێکی (دۆخێکی) مۆرفۆلۆجی لە داڕێشتن و پێکهاتنی مۆرفێمیدا، دیاری دەکەن، بەیەک شێوە، چەند مەبەستێکی جیاوازی مۆرفۆلۆجی پێشان ئەدەن.

لە پێشەوە باسەکەمان، جۆرەکانی داڕێشتنی جیاجیا پێشگری (ب) لە داڕێشتنی فرمانی داخوازی و فرمانی رابردوو، رانەبردووی مەرجی (ئیلزامی) و ناو و ئاوەڵناوی بکەرو فرمانی بکەر نادیارمان پێشاندا، کە هەریەکەیان دیاردەیەکی مۆرفۆلۆجین، لە زمانی کوردیدا کە حاڵەتەکانی «داخوازی کردن و فەرمان» و «مەرج و گومان» و «تواناو جولە» دەگرتە خۆیان.

ئەوەی لێرەدا، پێویستە بخرێتەڕوو، ئەوەیە «فرمانی داخوازی» (Imperative- فعل امر) کە بە هۆی پێشگری (ب)ەوە دروست دەبێ، بەهۆی ئاوەڵفرمانی نەکردنی (نەفی) «مە»ەوە نەفی دەکرێ لە روودان، کەچی «ب»، کاریگەری خۆی، بەبوونی (مە)ی نەکردنەوەش وەکو (داخوازی کردن و فەرمان) لە دەس نەداوەو، هەمان مەبەستی داخوازی نەدۆڕاندووە، نموونە:

بکە ــــــ مەکە

| | | | |
|---|---|---|---|
| چەمکی (ب) | مەخۆ | (مە) | چەمکی نەکردن |
| داخوازی | برۆ ــــــ مەڕۆ | | و داخوازی هەیە |
| و فرمان | بنووسە ــــ مەنووسە | | |

هۆی نەدۆڕانی کاریگەری پێشگری (ب)، لە حالەتی بوونی (مە)ی نەکردن، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، کە (ب) مۆرفیمێکی بنەڕەتی وشەی فرمانی داخوازییەو، (مە) و یا پێشگری تر، گەر شوێنی بگرێتەوە، بوونی و کاریگەری خۆی، لەناو ئەو پاشگرە جێگرانەی کە لەلاوە، بۆ مەبەستی تری بەکارهێنان و داڕێشتنی هاتووەنەتە ناوەوە، لە دەست نادات، واتە شێوەی تازەی فرمانە داخوازییەکە، چەمکی «داخوازی و فەرمان کردن»ی خۆی پێوە دەێنێ، کەچی ئەگەر ئەم دیاردەیە، پێچەوانە بکرێتەوە، لە داڕێشتنیدا بەم شێوەیەی خوارەوەو، چەمک و کاریگەری (مە)ی نەکردن و، پێشگری تر، کە فرمانە داخوازییەکان، لە سادەوە دەکەن بەداڕێژراو، پێوەی نامێنێ، واتە بەفرمانەکەوە لە حالەتی بوونی پێشگری (ب)ی داخوازی نموونە:




کردنە یەکەمەو بەپێی یاسایەکی بە ئارەزوو Optional بێجگە لە (مە)ی نەکردن، پێشگرەکانی تری (دا، ڕا، هەڵ، پێ، تێ...) کە فرمانی داخوازی داڕێژراو دروست دەکەن ئەتوانرێ پێشگری (ب)ی داخوازی لەگەڵیاندا، بەکار نەهێنرێ و، دەشتوانرێ بەکار بهێنرێ بەکارهێنان و بەکار نەهێنانی لە چەمکی فەرمانە داخوازییەکە، بەشێوەی داڕێژراوی دروست دەکەن و، کاریگەری پێشگری (ب) پێیانەوە دیارە، بەڵام کاریگەری خۆیان، واتە (دا، را، هەڵ..)

بەوەوە دیار نییە، هۆی ئەمەش ئەوەیە پێشگری (ب) نیشانەیەکی ڕەسەنی دروست کردنی فرمانی داخوازییە، ئەمەش بەم نەخشەیەی خوارەوە روون دەکەینەوە:

١) دا
ڕا ـــــ ب کە ـــــ◀ کەن دابکە ـــــ دابکەن
هەڵ

٢) دا
ڕا ـــــ کە / کەن
هەڵ

٣) بکە (ن)
بۆ دۆخی نەکردن مە کە (ن)

مە + بکە
مە کە

ئەم دیاردەیەی سەرەوە، بەوەی کە پێشگری (ب) داخوازی دەتوانرێ، بەئارەزوو لەناو پێشگرەکانی ترا، کە فرمانی داخوازی داڕێژراو لادەبرێ، کەچی کاریگەری دەمێنێ، بەڵام هی ئەوان لەناو (ب)دا کاریگەری یان نابینرێ، بەلابردنیان ئەمە رەسەنایەتی، پێشگری (ب) دەگەیەنێ، بەوەی کە نیشانەی بنەڕەتە فرمانی داخوازییە، لە زمانی کوردیدا، بەڵام پێشگری «دا، ڕا، هەڵ...» لەولاوە هاتوونەتە ناو وشەی فرمانەکە. (بڕوانە وێنەی (١) و (٢).

حاڵەتی دووەم، بەچوونە سەری (مە)ی نەکردن، پێشگری (ب) فرمانی

داخوازی لەناویدا دەتوێتەوە، بەڵام کاریگەرییەکەی، بە «داخوازی و فەرمانی کردن» بەهۆی «مە»وە پێوە دیارە، کاریگەری و چەمکی «ب» تیایدا لە دەس نەدراوی. بڕوانە وێنەی(٣).

بەڵام لە دۆخی بوونی (ب)ی داخوازی، (مە)ی نەکردنی پێوە چ بەشێوە و چ وەکو تێگەیشتن دیار نادات، چونکە (مە) لەلاوە هاتووەو (ب)ش بنەڕەتی وشەکەیە.

لەلایەکی ترەوە، ئەم بەڵگانەی سەرەوە، ئەوە دەگەیەنن، ئەمانەی لای خوارەوە وەکو ڕاستی یەک بخەینەڕوو.

١- ڕێژەی فرمانی داخوازی، بریتییە لە (پێشگر + ڕەگی ڕانەبردوو + ڕاناو)، هەر پێشگرێکی تر، بێجگە لە ڕێژەکەی خۆی، کە بەهۆی (ب)ەوە پێکدێت، جێگە و واتای(ب)ی فرمانی داخوازی دەگرێتەوە وەک: بکە ــــ ڕاکە، تێکە، پێکە، هەڵکە، جێکە، یا بەلێکدراوی نان بخۆ (نان خۆ)، کارکە، ڕێکە، سەیرکە...

٢- بە نەکردن و روونەدانی فرمانی داخوازی، بەهۆی (مە)ی ئاوەڵفرمانی نەکردنەوە چەمک و کاریگەری (ب)ی فرمانی داخوازی نادۆڕێت.

٣- پێشگری (ب) لە وشەسازی کوردیدا، بەیەک شێوەو (مۆرف) لە چەند مەبەستێکی جیاوازی بەکارهێنانی داڕێشتنی مۆرفۆلۆجی بەکاردەهێنرێ، وەک رابردوو، ڕانەبردووی مەرجی (ئیلزامی)و ناوو ئاوەڵناوی بکەرو فرمانی بکەر نادیار، لە شێوەی مەرج و گوماندا.

٤- مۆرفیمی مۆرفۆلۆجی، بەزۆری یەک شێوە (مۆرف) لە بەکارهێنانی جیاوازدا دەگرێتە خۆی و گۆڕانی بەسەردا نایەت، نموونە:

بکردایە، بنووستایە، ببڕ، بکوژ، ڕەشبگیر، زۆربلێ، بکەم، بڕۆم، بنووسرا، بنووسرام، بنووسرێم.

٥- بەپێی یاسایەکی بە ئارەزوو Optional لە حالەتی دروست بوون و، پێکهاتنی وشەی دارێژراو و لێکدراوی فرمانی داخوازی لادەبرێ و، پاشگری تر بەهەمان واتا شوێنی دەگرێتەوە وەک (بکە - داکە، راکە...)

٦- مۆرفیمی مۆرفۆلۆجی، بریتییە لەو مۆرفێمەی کە ئەچێتە سەر مۆرفیمی ترو، وشەی تازەی، خاوەن مانای تازە دروست دەکا (٤) لەم پێناسەیەوە، ئەوەمان بەپێی باسەکەی سەرەوە، بۆ روون دەبێتەوە، ئەو مۆرفیمانەی، کە دەچنە ناو دروست بوون و، دارێشتنی وشە تازەو دارێژراوەکانەوە، لە گەردان کردندا دەمێننەوە یا بەنەمانی شێوەکەشیان (مۆرف Morph) چەمک و کاریگەریان، لە دەس نادەن وەک (ب)ی فرمانی داخوازی، لە حالەتی دارێژراوی مۆرفیمی (دە)ی بەردەوامی، لە حالەتی فرمانی دارێژراوی رابردوو. رانەبردوودا بەم شێوەیە:

دەچووم هەڵدەچووم هەڵەچووم

(ە)ی پاشکۆی پێشگری (هەڵ) جێگری (دە)ی بەردەوامییە، بەشێوەی کورت کردنەوەو مانەوەی واتای (دە).

دەچم هەڵدەچم هەڵچم شوێنی (دە)یە

کردنەوە کردمەوە بیکەوە

کەچی بوونی ئەم دیاردەیە، لە ئەلەمۆرفی رێزمانی پێچەوانەی ئەم دیاردەیە مۆرفۆلۆجییەی سەرەوەیە چونکە مۆرفیمی رێزمانی یا ئەلۆمۆرفی رێزمانی (بە) شێوەی جیاجیا بە پێی شوێنی جیا بۆ تاکە مەبەست و یەک ئەرک و دەوری ئەدرێتێ. وەک:

(ەکە)ی ئامرازی ناساندن و (ان)ی نیشانەی کۆ

ەکە کە ەک ک یان ان وان

رێوی یان کچان خانووان

## پەراوێزەکان:

١- د. وریا عومەر ئەمین، چەند یاسایەکی مۆرفۆلۆجی داڕێشتنی فەرمان، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٩)ی ١٩٨٦، ل٢٥٨-٢٦٣ .

٢- رەفیق محەمەد، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، نامەی ماجستێر، ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٨، ل٩٨-١١٠ .

٣- بۆ دۆزینەوەی رەگی فرمانی رابردوو، رانەبردوو، بڕوانە وتاری د. وریا عومەر ئەمین «کات و نیشانەی فرمان» کاروانی (٩٢) ساڵی ١٩٩١ . ئەم یاسایە خراوەتەڕوو.

٤- د. وریا عومەر ئەمین، (مردنی وشە) گۆڤاری کاروان، ژمارە (٤٥)، ١٩٨٦ ل٨-١٤ .

٥- د. وریا عومەر ئەمین، ئەلۆمۆرفی رێزمانی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٢)، ١٩٨٩ ل١٦٦-١٦٩ .

## سەرچاوەکان:


١- رەفیق محەمەد، ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، نامەی ماجستێر، ئادابی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٨ .

٢- زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی شەشەمی ئامادەیی ١٩٨٦ .

٣- کۆڕی زانیاری کوردی، رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦ .

٤- ک. کوردویێف. رێزمانی کوردی، وەرگێڕانی لە رووسییەوە، د. کوردستان موکریانی، هەولێر ١٩٨٤ .

٥- د. وریا عومەر ئەمین، ئەلۆمۆرفی رێزمانی، رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٢) - ١٩٨٩، ل١٦٦-١٦٩ .

# دیاری کردنی ئامراز
# لە زمانی کوردیدا

دوای لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت لە زمانی کوردیدا، بە تایبەتی لە شێوەی کرمانجی خواروودا، بابەتی ئامرازو جۆرەکانی و کەرەسە جیاجیاکانی بەتەواوی روون نەکراونەتەوەو، لەگەڵ بابەتی تری وەک زیادەی وشە داڕێژ - Affix (پێشگرو پاشگر)و ئاوەڵفرمان و نیشانەو جێناو تێکەڵ کراوەو، یا هەندێک جۆرە ئامراز فەرامۆش کراوە بۆیە هەڵدەگرێ لێی بکۆڵرێتەوەو کەم و کورتی یان کەم بکرێتەوە.

ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە، دیاری کردنی ئامرازە لە زمانی کوردیدا، کە لە رووی شێوەو واتاو سەربەخۆیی بوون و، دەوری ناو رستەو تایبەتییەکانیان و دوولایەنی بەکارهێنانیان دەگرێتەوە.

## ئامراز:

لە زماندا، لە رووی کارکردن و بەکارهێنانەوە، وەکو ئامێرێک وایە کە بە هۆیەوە شتی جۆربەجۆری پێ ئەکرێ و بۆ مەبەستی جیاجیاکانی قسەکردن بەکاردەهێنرێت، هەندێک جۆری بەشداری دارێشتن و پێکهاتنی وشە دەکەن و لە رستەشدا - دەوریان چالاکەو بە بەشێکی ئاخاوتن دادەنرێن و واتادارو بێ واتان.

ئامراز بە گشتی لە رووی بوونەوە، لە زمانی کوردیدا دوو جۆرن: وەک

١- ئامرازی بەستنەوەی کە (ئامرازی پەیوەندی ئامرازی لێکدەرو ئامرازی گەیەنەر دەگرێتەوە(١).

٢- ئامرازی نیازو مەبەست وەک ئەو ئامرازانەی مەبەستی تایبەتیان هەیە کە ئەمانەن:

١: ئامرازی سەرسوڕمان - ادوات التعجب

٢: ئامرازی بانگ کردن - ادوات النداء

٣: ئامرازی وەڵام (بۆ ئەرێ، بۆ نەرێ) - ادوات الاستجواب

٤: ئامرازی خۆزگە. - ادوات التمني

٥: ئامرازی گومان. - ادوات الشك

٦: ئامرازی بێجگە. - الاستثناء

٧: ئامرازی لێکچواندن. - ادوات التشبيه

٨: ئامرازی تەئکید. - ادوات التاءكيد

٩: ئامرازی مەرج. - ادوات الشرط

١٠: ئامرازی وریا کردنەوە (تنبيه) - ادوات التنبيه

١١: ئامرازی نەفی. - ادوات النفي.

١٢: ئامرازی گاڵتەپێکردن سەرزەنشت کردن - ادوات الاستهزات والسخرية.

باسی دیاری کردنی ئامرازو جۆرەکانی، پێویستە ناساندنی ئەو دوو جۆرە ئامرازە بکەین تا بتوانین لە یەکترو لە بابەتی تر جیایان بکەینەوە بکەینەوە، ئەم لیکۆڵینەوەیە، تایبەتە بە (ئامرازی مەبەست)و جۆرەکانی و دەوری جیاجیان لە رستەدا(٢).

ئامرازی مەبەست: لە رووی واتاوە واتادارو بێ واتان و، هەر جۆرەی بە

مەبەستی تایبەتی لەرستەدا بەکار دەهینرێن و، کەرەسەی هەر جۆرە ئامرازێکیان بۆ تاکە مەبەستێک بە کاردەهێنرێت و، مەبەستی رستەکان لە رووی واتاوە، بۆلای خۆیان رادەکێشن و بەشێکی ئاخاوتن پێکدەهێنن.

پێش ئەوەی بێینە سەر روونکردنەوەی لایەنەکانی ئامراز، پێویستە جیاوازی نێوان ئامراز لەگەڵ ئەو بابەتانەی، کە بە هەڵە بە ئامراز دادەنرێن نیشان بدەین وەک:

جێناوو نیشانەو ئاوەڵفرمان، تا لە یەکتریان جیابکەینەوە.

جیاوازی ئامراز لەگەڵ جێناودا ئەوەیە، ئامراز وەکو ئامێرێک وایە، کە بە هۆیەوە بۆ مەبەستی جیاجیای قسەکردن بەکاردەهێنرێن و لە رووی واتاوە رەوتی تێکڕای رستە دەگۆڕێت و، پەیوەندی نێوان بەشەکانی رستە رێک دەخات، بەلام هەرچی جێناوە لە جیاتی کەس و جێگای ناو دەگرێتەوەو، دەوری بەشە بنجێکانی ناو رستە دەبینێ، وەک بکەرو بەرکارو تەواوکەر. هەرچی نیشانەشە بۆ دروستبوونی تاکە مەبەستێک بەکاردەهێنرێن، وەکو (ان)ی نیشانەی کۆ، وشەی تاک دەکات بە کۆو، (ەکە، یەک) ناوی ناسراوو نەناسراو دروست دەکەن. ئاوەڵفرمانیش لە رستەدا، تەنها کار لە دیاری کردنی روودانی فرمانی رستە، لە رووی شوێن و کات و هۆو رادەو چۆنیەتی دەکات، هەرچی زیادەی وشە دارێژیشە، دەچێتە سەر مۆرفیم و کەرەسەو وشەی تر، وشەو مۆرفیمی تازە دادەرێژێت وەک پێشگرو پاشگر.

دوای ئەم بەراورد کردنەی سەروە، دێینە سەر روونکردنەوەی یەکە یەکەی پیلانی دارێشتنی لێکۆڵینەوەکەمان، لە بارەی ئامرازەوە، کە بەم جۆرەیە:

## ئامرازی مەبەست لە رووی واتاوە دوو جۆرە:

**١- ئامـــرازی واتادار:** ئەو ئامـــرازانەن، کـــە جگە لە بوونی رواڵەتی سـەربەخۆییـان وەکـو وشـەیەکی فـەرهەنگی واتا بەخشـن و لە رسـتـەدا دەوری جیاجیا دەبینن، وەک ئەم جۆرە ئامرازانە:

ئامـرازی سەرسـوڕمـان، ئامـرازی وەڵام، ئامرازی خۆزگە و گـومـان، ئامرازی لێکچواندن، ئامـرازی مـەرج، ئامـرازی بێـجگە (جگە)، ئامـرازی بانگ کـردن (بەشە واتادارەکەی)، ئامرازی گاڵتەپێکردن، ئامرازی وشیارکردنەوە.

**٢- ئامـرازی بێ واتا:** ئەو ئامـرازانەن کـە واتای فـەرهەنگیـان نیـیـەو لە رسـتـەدا دەورو واتایان روون دەبێـتـەوە، وەک: ئامـرازی بـانگ کـردن (بەشـە بێ واتاکەی کە لە شێوەی پیتدان)، ئامرازی تەئکیدی (هەر)ی... دەربچێ ئەوانی تر دوو لایەنن.

## ئامراز لە رووی سەربەخۆیی بوونەوە لە زمانی کوردیدا دوو جۆرن:

١: ئەو ئامـرازە مـەبەسـتـانەی، کـە رواڵەتی سـەربەخـۆیان هەیە: ئامـرازی سەرسوڕمان، ئامرازی وەڵام، ئامرازی بانگ کردن (بەشە سەربەخۆکەی) ئامرازی خۆزگەو گومان، ئامرازی بێجگە، ئامرازی لێکچوواندن، ئامرازی گاڵتەپێکردن و سەرزەنشتکردن، ئامرازی ئاگادارکردنەوە.

٢: ئەو ئامـرازانەی رواڵەتی سەربەخـۆیان نییـە: جۆرە ئامـرازێکن لە رسـتەدا، ئەبێ وەکـو کـەرەسەو وشـەیەکی زمـانی کـوردی هەست بەبوونیـان ناکرێت، نموونە: ئامـرازی بانگ کـردن (ئەوانەی لە شێوەی پیتدان وەک (ە، ێ، ۆ، ینە) ئامـرازی تەئکیـد ئامـرازی (دەبا)ی لێ دەربچێ، ئەوانی تر، بۆ مـەبەسـتی تریش شێـوەیان بەکاردێت، وەک (با، هە، کە).

## ئامرازی مەبەست لە رووی روالّەتی

## دروست بوونەوە، دووبەشن:

١ : ئامرازی مەبەستی سادە: هەر جۆرەی، لە شوێنی خۆیدا، بە تەنها دەیان خەینە روو.

٢ : ئامرازی مەبەستی ناسادە: بەهەمان شێوەی یەکەم لە شوێنی خۆیان دەیان خەینە روو.

ئامرازی مەبەست لە رووی بەکارهێنانەوە، لە زمانی کوردیدا هەندێکیان دەوری دوولایەنیان هەیە، بەوەی جگە لە دەورەکەی خۆیان، لە ئاخاوتندا، دەبنە جۆرە ئامرازێکی جیاواز لە خۆیان، وەک ئامرازی خۆزگەو گومان و لێکچواندن و تەئکید، دەبنە ئامرازی گەیەنەری رستەی ئالّۆزو لا رستەی شوێن کەوتوو (الجملة التابعة Suburdinate Clause لەناو رستەی ئالّۆزدا دروست دەکەن(٣).

## تایبەتییەکانی ئامرازی مەبەست:

ئامراز بە هۆی تایبەتییەکانییەوە، لەو کەرەسانەی کە بە هەڵە بە ئامرازی دانراون جیادەبنەوە، وا لە خوارەوە دەست نیشانیان دەکەین.

١ : هەندێکیان واتادارن و هەندێکی تریان بێ واتان و، مەگەر لە رستەدا نەبێ واتاو دەوریان نابێتەوە. (لەمە پێشەوە خستمانە روو).

٢ : بە زۆری دەوری چالاکی رستە سازییان هەیەو، واتاو مەبەستی رستەکان بۆ لای خۆیان رادەکێشن و، بەو مەبەستەوە جۆری مەبەستی رستەکان دەست نیشان دەکرێن و، بەو مەبەستەوەش ناودەبرێن، وەک رستەی مەبەست خۆزگەو گومان، بانگ کردن و لێکچواندن ... هتاد ..

٣: بە پێچەوانەی ئامرازی بەستنەوەوە، هەندێک جۆری ئامرازی مەبەست،

وەک ئامـرازی تەئکیـدو، ئامـرازی بێـجگەو، ئامـرازی بانگ کـردن (شـێـوەی پیـتـەکـەی) بەکـەمی بەشـداری دارێشتن و پێکهـاتنی وشـەو جـۆرە ئـامـرازی تر دەکەن.

٤: لە رووی بوونیـانەوە لە زمـانەکـەدا، بە زۆری سـەربەخـۆن و، یەک دوو جـۆری نەبێ، نا سـەربەخـۆن و، لە رسـتـەدا نەبێت شـێـوەو بوونیـان هەست پێ ناکرێت.

٥: ئامراز بەگشـتی و ئامرازی مەبەست بە تایبەتی لە رووی بەکارهێنانەوە. لە ئاخـاوتندا وەکـو ئامـێـرێـک وان، کـە بە هۆیانـەوە مـەبەسـتی ئاخـاوتن دیاری دەکەن و، رستە بۆ مەبەستی جیاجیا رێکدەخەن.

## دیاری کردنی جۆرەکانی ئامرازی مەبەست:

لێرەدا پێناسەی هەر جۆرە ئامرازێکی مەبەست، لەگەڵ کەرەسەو ئامرازەکانی هەر جۆرێکی دست نیشان دەکەین:

١: ئـامـــرازی ســەرســورمــان (ادوات التــعــجب Interjection): ئەو ئامرازانەن، لە زمـاندا کە بۆ سەر سوڕماندن، لە کـارو کردەوەی نا ئاسـایی، لە شت و رووداوی خـۆش و نـاخـۆش و سـەیر بەکـار دێن، بەبێ بـەکـارهێنانیـان ئەم جـۆرانەی لێ دیار کـران و، وەک ئـەم ئامـرازانە. «پەکـو، پەح تەح، ئـۆف، ئاخ، ئای، وای، ئـای ئای، ئـۆی ئۆی، ئـۆخ، ئـۆخـەی، ئـۆخـەیش، ئـافـەرین، هـەیهـۆ، دەیهۆ، هەی، هەو، ئەیەڕۆ..»

نموونە: پەکو! لەو مارە زلە.

ئاخ! لە دەست جەورو ستەمی زەمانە.

ئۆخەی! کوڕکەم بە سەلامەتی هاتەوە.

هەیهۆ! لەم حاڵ و ژیانە.

## تایبەتییەکانی ئامرازی سەر سوڕمان:

١: لە کوێدا بەکارهات، پێویستە نیشانەی سەر سوڕمان بە شێوەی (!) لە دوای ئامرازە سەرسوڕمانەکەوە، لە نووسیندا بەکاربهێنرێت.

٢:بە زۆری لەگەڵ رستەی فرمانی ناتەواودا بەکاردێ وەک: ئای! لە تۆ، ئاخ لە دەست زەمانە! ئۆخەی! لەدەست ناخۆی رزگار بووین.

٣: لەگەڵ فرمانیشدا بەکاردەهێنرێن، وەک: ئاخ! ئەمجارەش دواکەوتین، ئۆخەی! هاتەوە، ئاخ! جارێکی تر رێکەوتی وامان بۆ هەڵناکەوێت.

٤: زۆر بەکەمی بەشداری دارێشتنی وشە دەکەن وەک بە دووبارەکردنەوە، یان ئامرازی تری سەر سوڕمان، بە شێوەی لێکدراوی یا گرێ پێکدەهێنن، وەک ئاخ و ئۆف، ئای ئای، وەی وەی، ئۆی ئۆی.

## جۆرەکانی ئامرازی سەر سوڕمان لە رووی بە کارهێنانەوە:

**١: ئامرازی سەر سوڕمانی سەیر:** وەک ئەها، پەح، پەکو، پیاح، حەی، وەی، هەو، دەک (ئەک)، هەک، حەک، ئەبێ (ئەدی)، بەدی (بۆ وەڵامی پرسیاریش بەکاردێ وەک: بەدی هاتەوە!). بۆ، نموونە:

هەو! خۆ دوێنێ بە بووکی چوو.

هەک! چۆن رادەکات.

ئەها هات.

حەی لەم نموونانە.

**٢: ئامرازی سەرسوڕمانی خۆشی:** وەک: ئۆخەی، ئۆخەیش ئافەرین، بەهبەه، ئۆی ئۆی، دۆی دۆی، (لە کاتی گۆرانی شای و هەڵپەرکێدا، بەکاردێت)، ئای ئای، هەیهۆ، دەیهۆ.

٣: ئامرازی سەر سورمانی پەژارەو ناخۆشی: وەک ئاخ، ئۆخ، ئۆف. ئۆی، مخابن، وەیش، داخ، ئاخ داخ، داد، ئای ئای (دولایەنە بۆ خۆشی و ناخۆشی) هەی هۆ.

هەندێک جاریش ئامرازی (وەی وەی) بۆ دەربڕینی خۆش وشتی، سەیر بەکاردەهێنرێن، وەک: وەی وەی لە مانە!.

وەی وەی لەم شای و سەیرانە!.

نموونە لە رستەدا: - حەیف و مخابن بۆ قاسملوو!

- وەیش بۆ ئەو کوڕە ئازایە!

- دادو بێداد! لە دەس جەوری زەمانە.

هەیهۆ لەم شاییە خۆشە.

هەیهۆ لە دەس تۆ.

هەیهەی! چ هەراو مەزادێکە.

## ئامرازی سەر سوڕمان لە رووی شێوەوە:

**١- سادە:** وەک هەموو ئامرازە تاکەکان: (پەح، پەکو، وەی، هەو، ئەک، پەح، پەکـــو، وەی، هەو، ئەک، بەدی، ئەدی، ئاخ، داخ، ئۆف، ئای، ئۆی، مخابن، داد، دەی).

**٢: ئامرازی سەر سوڕمانی ناسادە: وەک:**

ئۆخەی، ئۆخەیش،بەهبەهـ، ئۆی ئۆی، دۆی، ئاخ، داخ، ئاخ و ئۆف، وەیش، هەیهۆ، وەی وەی، هەیهەی، ئای (ئا + ی) وەی وەی.

ئامرازی سەرسوڕمان لە رووی واتاوە، زۆربەیان واتادارن و وەکو وشەیەکی سەربەخۆ واتاو بوونیان لە زمانەکەدا دیارە.

هەندێ جار، ئامرازی (ئا)ی وەلام بەبێ پاشکۆی (ی) بە هۆی دەربڕینێکی

تایبەتێوە سەرسوڕمان دروست دەکات، وەک: ئا هات!

٢: ئامـرازی وەڵام: (ادوات الاسـتـجـواب) ئەو ئامـرازانەن، کـە بۆ وەڵام دانەوەی پرسیار بە شێوەی ئەرێ و نەرێ بەکاردەهێنرێن و دوو جۆرن:

١- ئامـرازی وەڵام بۆ دۆخی ئەرێ: وەک: بەڵێ، ئا، ئێ، ها، هۆو، هۆی، با، ئێ، ئێی، ئەدی، بەدی، نموونە:

بەڵێ هاتم، نەچووم، هۆو بەڵێ، هۆ ئازاد، هۆی بەڵێ. ئاخر.

٢- ئامرازی وەڵام بۆ دۆخی نەرێ: نەخێر، نە، نا، نە، نموونە:

نەخێر نایەم، نا نان ناخۆم، نە وازی ناکەم.

## تایبەتییەکانی:

١- لەگەڵ زۆربەی جۆرەکانی فرماندا بەکاردەهێنرێن.

٢- هەر دوو جرەکـانی ئامـرازی وەڵام لەگـەڵ دۆخی فـرمـانـی ئەرێ و نەرێ بەکاردێن.

٣- بە زۆری ئامـرازی وەڵام لە رووی واتاو نـاوەڕۆکـیـەوە، رسـتـەی هەواڵی دروست دەکات، وەک ئاخر وایە (بەڵێ وایە)

٣- ئامرازی بانگ کردن: ئەو ئامرازانەن کە بە هۆیانەوە کردەی بانگ کردن ئەنجام دەدرێ و، بەپێی بوونیان لە زمانی کوردیدا، دەبن بە دوو بەشەوە:

١: بەشێکیان بە شێوەی وشەی تەواوو واتادارن (Free Morphem)، وەک: هۆ، هۆو، ئەرێ، ئەی، هێی، هێ، هەی، وەی، پا).

٢: بەشی دووەمیان بە شێوەی ئامرازی بێ واتان (Bound Particl)، وەک: ا- ئامـرازی بانگ کـردن بۆ کـاتی نێـر، وەک: ە، و: خـاڵە، خـاڵۆ، مامە،مامۆ کاکە، کاکۆ.

ب- ئامرازی بانگ کردن بۆ تاکی مێ، وەک: ێ: پورێ، کچێ، ژنێ.

ج- ئامـرازی بانگ کـردن بۆ کـۆی نێـرومێ، وەک: ینە، کـوڕینە، کـچـینە، براینە.

ئەگەر وشە بانگ کراوەکە بە بزوێن کۆتایی بێت، ئەوا بزوێنی وشەکە خۆی دەبێـتە ئامرازی بانگ کـردن و ئامرازی بانگ کردنەکە لە ناو بزوێنی وشـەکەدا دەتوێتەوە، وەک: برا، مامۆستا،..

دیاردەیەکی سەیر لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامرازی بانگ کردن هەیە، ئەگەر هاتوو وشـە بانگ کراوەکـە، لێکدراوی نێـر بێت، ئەوا ئامـرازە لێکدەرەکـەی کە (ە)یە بێـجگە لە ئەرکی لێکدان، دەوری بانـگ کـردنی نێـریش دەبینێ وەک: پیرەمێرد، پیرەپیاو.

لە ناوی لێکدراوی مێـینەشدا ئامرازی لێکدرەی (ی) دەوری بانگ کـردنی مێ دەبینێ، وەک: پیرێژن.

ئامـرازی (ی)یش بە کـەمی بەکـاردێت، (وەک برای من، کـوڕی من، کـچی من، هەرچەندە، ئەمە لەبنەڕەتدا ئامرازی پەیوەندییە بۆ ئیزافەو ئەم، دەورەش لە بانگ کردندا دەبینێ.

جاری واش هەیە، نیشانەی ناسراوی دەوری بانگ کردن دەگێڕێ وەک:

کوڕە کە وەرە، کچەکە بڕۆ، پیاوەکە بۆ کوێ دەچێت.

ئامرازی بانگ کردن، لە رووی بوونەوە، لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرانەی هەن، وەک:

١: ئامرازی بانگ کردنی مرۆڤ، وەک: هۆ، ئەرێ، ئەی.

٢: ئامـرازی بانگ کـردنی ئاژەڵ و پەلەوەر: ئۆحـە، هۆش، یخـە، هرە، تەس، گدی گدی، (هێشـە)، هس (هسە)، پشـە (پش پش)، چغ (چغە)، کوت کوت، کوچ کوچ، کس کس، جوو جوو.

## ئامرازی بانگ کردن لە رووی شێوەوە:

١: سادە: هۆ، ئەرێ، ئەی، هۆش، یخە، هڕ، تەس، هێش، پشە، هس، چخ.

٢: ناسادە: هۆو، هڕە، هسە، پشە (پش پش). کوت کوت، کوچ کوچ، جوو جوو.

## تایبەتییەکانی ئامرازی بانگ کردن:

١: بە زۆری لەگەڵ رستەی فرماندار بەکار ئەهێنرێن، یاخود دەوری فرمان دەبینن لە رستەدا.

٢: ئامرازی بانگ کردن، بۆ بانگ کردنی گیان لەبەر بەکار دەهێنرێن چ مرۆڤ یا ئاژەڵ و پەلەوەر بێت.

٣: هەریەکەی لەم ئامرازانە، دەوری بەکارهێنانی تایبەتی دەبینێ، واتە هەر یەکەیان دیاری کراون کە بۆچی بەکاردەهێنرێن بۆ مرۆڤ بێت یا ئاژەڵ و پەلەوەر بێت.

نموونە لە رستەدا: هۆ ئارام وەرە.

- ئەرێ لەگەڵ تۆمە.
- هڕە مەڕە پیرە.
- کشە مامرە رەشە.
- گدی گدی کارە رەش.
- هسە مەڕە کوڕیس.
- هش بزنە گەڕ.

تەس وا وەرە.

تەس مەڕە گێژە.

٤: واتا دارو بێ واتان.

٥: لە رووی بوونەوە ئامرازی بانگ کردنی (ە، ێ، ی، ۆ، ینە)ی لێ دەرچێ ئەوانیتر سەربەخۆن و لە شێوەی وشەی واتادارو دادەنرێن.

**٤- ئامرازی خۆزگە:** ئەو ئامرازانەن، کە بە هۆیانەوە، ئاوات و خواستنی جێبەجێ کردنی کارێک دەکرێ کە لەمەو پێشەوە رووی بدایە، نموونە:

خۆزگە، بریا، کاشکی، ئاوات.

نموونە لە رستەدا: خۆزگە ئەم کچەم بخواستایە.

- بریا کۆماری مەهاباد نەڕوخایە.

## تایبەتییەکانی ئامرازی خۆزگە:

١: بە زۆری لەگەڵ فرمانی رابردوو بەکار دەهێنرێن بە تایبەتی جۆری رابردووی بەردەوام و ئینشائی نزیک و دوور.

٢: زۆر بەکەمی لەگەڵ فرمانی رانەبردوو بەکاردێت و چونکە، خۆزگە و ئاوات بۆ دەربڕینی رووداوو کردنی کارێکە، کە لە رابردوودا بکرایەو ئێستا ئەنجامی کردن و نەکردنی روون بۆتەوە.

٣: ئامرازی خۆزگە، بە زۆری (خۆزگە، ئاوات). وەکو ناویش لە رستەو ئاخاوتندا بەکار دەهێنرێن و دەورە جیاجیاکانی ناو، وەکو بکەرو بەرکاری راستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەبینن، وەک:

- دیوانی خۆزگەو ئاواتم خوێندنەوە.
- خۆزگ زۆرە.
- هەر بە خۆزگەی تۆ نابێت.
- خۆزگەم دەخواست لەگەڵم بوایە.
- ئاواتم زۆرە.
- ئیش کردن بە ئاوات نابێت.

- خۆزگە هیچمان بۆ ناکات.

٤: ئامرازی خۆزگە دەوری ئاوەڵفرمانی چۆنیەتی دەبینێت، وەک:

بە خۆزگەی تۆنابێ بە هیچ.

٥: لە رووی واتاو بوونیانەوە لە زمانی کوردیدا وشەیەکی سەربەخۆن.

٦: دەوری دارِشتنی وشەیان نییە، چونکە ئامرازی رستە سازین.

## ئامرازی گومان:

ئەو ئامرازانەن بە هۆیانەوە، گومان لە بەئەنجامدان و جێبەجێ کردنی کارێک، لە رووداو و روونەدانی دەکرێت.

نموونە: (بەڵکو، بەشکو، ئەشێ، بشێ، لەوانەیە، ئەبێ ئەگەر، گەر، رەنگە، ئەگونجێ، ناگونجێ، سا).

نموونە: لە رستەدا: - ئەبێ بێت بۆ سەر ئیشەکەی.

- سا وەرە لام خوا کەریمە.
- ئەشێ ببێت بە سەرکردەی گەل.
- لەوانەیە هاتبێت بۆ بازارِ.
- بەشکو لە تاقی کردنەوە، دەردەچێت.

## تایبەتییەکانی ئامرازی گومان:

١: لەگەڵ جۆرەکانی فرمانی رابردوودا بەکاردێت، تەنها رابردووی بەردەوام نەبێت.

٢: لەگەڵ فرمانی رابردوو، رانەبردووی ئیلزامیدا بەکاردێت.

٣: لەگەڵ دۆخی فرمانی نەرێدا بەکاردێن.

٤: لە رووی واتاو بوونیانەوە لە زمانەکەدا، سەربەخۆن و هەست بە بوونیان

دەکرێ.

٥: لە رووی شێوەی دروستبوونیانەوە، ئامرازی (ئەگەر، ئەبێ) ناسادەن و ئەوانی تر، وەک: (بەڵکو، بەشکو، ئەشێ، بشێ، لەوانەیە)، سادەن.

٦: ئامرازی (ئەبێ) کە خۆی فرمانە، ئەگەر لەگەڵ فرمانی تری ئیلزامیدا بەکار هات ئەوا دەبێتە ئامرازی گومان، وەک: ئەبێ بێت لەگەڵمانا.

## ٦- ئامرازی لێکچواندن: (اداة التشبيه)

ئەو ئامرازانەن، کە بۆ لێکچواندنی دوو ناوو راناو کردەوە بەکار دەهێنرێن کە لە سیفەت و خاسیەت و کردەوەیەدا، لێکدەچوینرێ و نزیکایەتی پیشان ئەدەن یا وەک یەکن.

**ئامرازی لێکچواندن ئەمانەن:** (وەک، وەک یەک. ئەڵێی، ئەڵەی، عەینەن، کوت و مت، هەروەکو، ئەمنی ...)

نموونە لە رستەدا: ئاڤێستا وەک زەردەشت زیرەکە.

- ئەوەندە ئازایە ئەڵێی شێرە.
- ئاریان کت و مت دایکێتی.
- ئەمنی بە رازە.

## شێوەی پێکهاتنی ئامرازی لێکچواندن:

١: سادە: وەک ئەم ئامرازانە: وەک، عەینەن، ئەمنی.

٢: ناسادە: وەک: (ئەڵێی ئەڵەی، کوت ومت.

## تایبەتییەكانی ئامرازی لێكچواندن:

١: لەگەڵ زۆربەی جۆرەكانی فرماندا بەكاردێن وەک، رابردوو، رانەبردوو داخوازی ئیلزامی و ئینشائی.

- وەک ئەو هات.
- وەک یەک دەڕۆنە رێگاوە.
- وەک ئەو نان بخۆ.
- ئەڵێی بچم بۆ لای براكەم.
- كوت ومت وابوایە چاک بوو.

٢: لە رووی بوون و واتایانەوە، واتادارو سەربەخۆن.

٣: لەگەڵ رستەی بێ فرمانیشدا، لە بەراورد كردنی دوو كەس، یا دوو سیفەت بەكاردەهێنرێن، وەک:

- تۆ وەک منیت.
- ئالا عەینەن باوكێتی.
- كەركوک كوت و مت كرماشانە.

٤: لێكچواندنی ئامرازی (ئەڵێی، عەینەن، كوت ومت) لە ئامرازەكانی تر بە هێزترە، واتە لە بەراورد كردنی دوو لایەندا تەواو وەكو یەكیان پیشان دەدەن و جیاوازیان نابێت.

### ٧: ئامرازی بێجگە: (ادوات الاستثناء)

ئەو ئامرازانەن كە ناوو راناو لە رووداو و روونەدانی رووداوی ناو رستەدا دادەبڕن واتە لە بەشدار بوون و بەشدار نەبوونیدا.

**ئامرازی بێجگە ئەمانەن:** بێجگە، جگە، بێجگەلە، جگە لە، بێ، بەبێ، تەنیا، تەنها، بەس، وێڕای، باوە جوو.

شێوەی پێکهاتنیان: ١ : سادە: وەک: جگە، بێ، تەنیا، بەس، وێڕای.

٢ : ناسادە: وەک: بێجگە، جگە لە، بێجگە لە، بەبێ.

نموونە لەرستەدا: - بێ تو هاتمەوە.

- بێجگە لە دیدار کەس نەهات.
- تەنها مەهاباد خۆشە.
- بەس هاوڕێکەی من هاتەوە.
- من بەبێ (بێ) تۆ هەڵناکەم.
- جگە لە ئاکۆ کەسم خۆشناوێ.
- وێڕای منداڵە زیرەکیشە.
- باوە جو مناڵیشە زیرەکە.

## تایبەتییەکانی ئامرازی بێجگە:

١ : ئامرازی بێجگ لە رستەی ئەرێ و نەرێشدا بەکاردێن.

٢ : لەگەڵ زۆربەی جۆرەکانی فرماندا بەکاردەهێنرێن.

٣ : لە رووی بوون و واتایانەوە، سەربەخۆو واتادارن و، بە ئاسانی لە کەرەسەکانی تری زمان جیا دەکرێنەوە.

**٨: ئامرازی نەرێ: (ادوات النفي)**

جۆرە ئامرازێکن، لە شێوەی وشەی سەربەخۆدان و، تەئکیدی رووداني فرمانی دەخەنە دۆخی روونەدانەوە، ئەمانەن: هەرگیز، قەت، هەرگیزاو هەرگیز.

شێوەی پێکهاتنیان: ١ : سادە، وەک هەرگیز، قەت.

٢ : ناسادە، وەک: هەرگیزاو هەرگیز.

- نموونە لەرستەدا: هەرگیز لە خۆمی دوور ناخەمەوە.

- هەرگیزاو هەرگیز دێیەکەم لە بیر ناکەم.
- قەت بەقسەی ناکەم.

## تایبەتێتی ئامرازی نەرێ:

١: لە رووی بوونەوە سەربەخۆو واتادارن.

٢: بە زۆری لەگەڵ ئاوەڵفرمانی (نە، نا، بێ، مە)ی نەرێ بەکاردەهێنرێ.

٣: جیاوازیان لەگەڵ ئاوەڵفرمانی نەرێدا، ئەمان واتادارو لە شێوەی وشەی سەربەخۆن، هەرچی ئاوڵفرمانی نەرێیە، ئەگەر لە رووی بوونەوە لە زمانەکەدا سەربەخۆن بەڵام بێ واتان و لە شێوەی مۆرفیمی بەندن.

٤: وەکو جۆرەکانی تری ئامرازی مەبەست بە چەند ئامرازێک یەک مەبەستی بەکارهێنان دەگەیەنن وەک (هەرگیز، هەرگیزاو هەرگیز، قەت) هەموویان مەبەستی نەرێ دەبەخشن.

## ٩: ئامرازی تەئکید:

ئەو ئامرازانەن بۆ تەئکیدی رووداو و روونەدانی ئەنجامدانی کارو کردەوەیەک لەلایەن قسەکەرەوە لە ئاخاوتندا بەکار دەهێنرێن. وەک ئەم ئامرازانەن: (با، دەبا، دە، دەی، کە، هەر، وا، دەسا، جا)

## شێوەی پێکهاتن:

١: سادە: وەک: با، کە، دە، هەر، جا.

٢: ناسادە: وەک: دەبا، دەی، دەسا، سا، (دوو لایەنە، چونکە بۆ گومانیش بەکاردێت و واتای (ئەگەر) ئەبەخشێت.

نموونە: - با برۆین.

- دەبا بۆ خۆیان بلێین. ـــــ ئەمە کەی کوردیە!

- هەر دەنووسم.

- سا وەرە پێت بلێیم.

- با بڕۆشتایە.

- هەر هاتووە قسە بکات.

جا وەرە لەگەڵما.

- دەسا وایە.

## تایبەتێتی ئامرازی تەئکید:

١ :لە رووی بوونەوە، بە زۆری سەربەخۆنین، چونکە ئامرازی دوو لایەنن واتە دەوری جۆرە ئامرازی تری وەک (وەلام، هاندان، گەیەنەر..) دەبینن.

٢ : ئەگەر ئامرازی (با) بچێتە سەر فرمانی رابردوو، رانەبردوو، دەبێتە وەلامیش وەک: (با هاتم، با دەچین) بەلام لەگەڵ کاتی فرمانی تردا دەبێتە تەئکید وەک: با بڕۆین، با بچونایە، با بچن، ...

٣: وەکو ئامرازی تەئکید لەگەڵ جۆرەکانی فرمانی رانەبردوو، رابردوو، ئیلزامی و ئینشائی بەکاردەهێنرێن.

٤ : ئامرازی (دە) وەکو تەئکید، لەگەڵ فرمانی رانەبردوو بەکار نایەت، چونکە ئەم جۆرە فرمانە، خۆیان نیشانەکەیان بریتییە لە (دە)ی بەردەوامی، کە هەمان شێوەی هەیە، هەروەاهـ لەگەڵ فرمانی ئیلزامی و ئینشائی بەکار نایەت، ئەم ئامرازە لەگەڵ ئامرازی (با)ی تەئکید، زۆر چالاکە لە بەکارهێناندا، وەک دەبا بچین، دەبا بێت، دەبا بڕۆیشتایە.

٥: ئامرازی (هەر) بە زۆری بۆ تەئکید بەکاردێت.

٦: ئامرازی (هەر)ی تەئکید لە دروست بوون و داڕێشتنی وشەدا دەور

دبینێ، وەک: (هەردەم، هەرچۆن، هەرجار، هەرکە، ...)

٧" بە زۆری بێ واتان، وەک (دە، کـە، دەبا)و ئەوانی تر وەک: (با، دەی، هەر) واتادارن.

**١٠: ئامرازی مەرج: (ادوات الشرط)**

ئەو ئامـرازانەن رووداوو کـارو کـردەوەیەک، بە رووداونی ترەوە دەبەسـتـێت، یا رووداونی رووداوێک، بە هۆی ئەم ئامرازانەوە مەرج دەبێت بۆ رووداونی تر.

**ئامرازی مەرج ئەمانەن:** (ئەگەر، مەرج بێ، مەرجە، شەرت بێ، شەرتە، تا، هەتا).

نموونە لە رستەدا:- ئەگەر هات بۆماڵمان پێی دەڵێم.

- مەرج بێ لە قسەت دەرنەچم.

- شەرت بێ لە داخت تەرکی دنیا کەم.

مەرجە ئیتر وانەکەم.

- هەتا نەیەیت پێت ناڵێم.

## ئامرازی مەرج لە رووی شێوەوە: دوو جۆرن:

١: سادە وەک: گەر. تا.

٢: ناسادە، وەک: ئەگەر، مەرجە، مەرج بێ، شەرتە، شەرت بێ، هەتا.

## تایبەتییەکانی ئامرازی مەرج:

١: لە رووی واتاوە، هەموویان واتادارن.

٢: لە رووی بوونەوە سەربەخۆن و بە ئاسانی هەست بە بوونیان دەکرێت.

٣: دەوری دوو لایەنیـیـان هەیە، چونکە دەبنە ئامـرازی گـەیـەنەری رسـتـەی

ئالۆزیش.

٤: بوونیان لە رستەدا وەکو ئامرازی مەرج بەکار دێن و رستەی وەڵامی مەرجیش بە دوایاندا دێت.

**١١: ئامرازی ئاگاداری و وریا کردنەوە:**

ئەو ئامرازانەن، کە بۆ وریا کردنەوەو ئاگادار کردنەوەی کەس و گیاندار لە رووداوو کارو کردەوەیەک بەکار دەهێنرێن، وەک ئەم ئامرازانە:

(ئەها، ئەهـ، ئادەی، هی، هەی، وا، ئەوا ئەمانە دوو لایەنن)

نموونە: ئەها لە ترسا رای کرد.

- ئادەی وەرە بۆ ئێرە.
- ئەهـ ئەوە هات.
- هێی برا ئەمە وا نابێت.
- کورە وا هاتن بۆ ئێرە.

## لە رووی شێوەوە: دوو جۆرن:

١: سادە، وەک: ئەهـ، ئەها.

٢: ناسادە، وەک: هێی، ئادەی.

٣: هەندێکیان بۆ سووکاتی و نزمی کەس بەکاردێن وەک (هێی).

٤: ئامرازی ئاگادار کردنەوەی ((ئادەی) بە زۆری لەگەڵ فرمانی داخوازی بەکاردەهێنرێن، وەک: ئادەی راکە، ئادەی وەرە، ئادەی بخوێنە، ئەوانی تر لەگەڵ زۆربەی دەمەکانی فرماندا بەکار دەهێنرێن.

### ١٢: ئامرازی سەرزەنشت کردن و گاڵتەپێکردن:

ئەم ئامرازانە بۆ گاڵتەپێکردن و سەرزەنشت کردنی کەسێک، لەلایەن قسەکەرو بەرامبەرەکەیەوە بەکار دەهێنرێت، بۆ مەبەستی تەوس وەک ئەم نموونانە: (شیڕ، چش(٤)، تف، هەی هەی، دۆیها، دەیها، تۆیها، دەیهۆ، جرت، جرت و فرت، پف).

ئامرازی سەرزەنشت لە رووی شێوەوە:

١: سادە، وەک: شیڕ، چش، ترحێو، فرت، زەڕ.

٢: ناسادە، وەک: هەی هەی، دۆیها، دەیها، تۆیها، دەیهۆ).

نموونەیان لە رستەدا: - شیڕ تۆ ئیش بکەیت.

- چش کە رۆیشت.
- ترحێو دیسان هاتەوە.
- دەیها کەس بەکەس نییە.
- پف لەم دەم و چاوە.
- زەڕ هەی کەرە.
- جرت و فرت دێن و دەچن.
- جرت برۆ، فرت وەرە.
- دەیها دێنەوە بۆ ماڵ.
- هەی هەی کارێک تۆ بیکەیت.
- جرت و فرت بە یەکا دێن هیچ ناکەن.

### تایبەتییەکانیان:

١: لەگەڵ زۆربەی دەمەکانی فرماندا بە بەکاردەهێنرێن.

٢: بە زۆری وەکو وشەیەکی واتادارو سەربەخۆ، لە زمانی کوردیدا

بەکاردەهێنرێن.

٣: بە زۆری بۆ مەبەستی گاڵتە پێکردن و سوک کردنی کارێک، لە لایەن یەکێکەوە کرابێت بەکاردەهێنرێن.

٤: هەموو ئامرازەکانی بە زۆری بۆ یەک مەبەست بە کاردێن، ئەویش گاڵتە پێکردنە.

٥: هەندێکیان وەک (هەیهەی، ...) بە مەبەستی تریش بەکار دەهێنرێن وەک بۆ سەر سوڕمان: هەیهەی لەو شایی و هەڵپەڕکێیە.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوە

١: ئامراز بەو وشەو کەرەسانە ئەوترێن، وەکو ئامێرێک وان بە هۆیانەوە لە ناو زمانەکەدا کاری ئاخاوتنی جۆر بە جۆری پێ ئەنجام ئەدرێت.

٢: ئامرازی مەبەست چەند جۆرێکە، هەر جۆرەی لە چەند ئامرازێک پێکهاتووە، کە بە هەموویانەوە یەک مەبەستی ئاخاوتن پێکدێنن: وەک: لێکچوون، وەڵام، سەر سوڕمان، بانگ کردن، بێجگە، تەئکید، بە کاردێن.

٣: زیادەی وشە داڕێژو نیشانەو جێناو، بە ئامراز دانانرێن.

٤: ئامراز بە پێی ئەو ئەرکەی دەیبینن، دەکرێن بە دوو بەشی وەک: ئامرازی بەستنەوەو ئامرازی مەبەست، کە یەکەمیان دەوری وشە سازی و رستە سازی دەبینێت، بەڵام دووەمیان بەزۆری دەوری رستە سازی دەبینێ.

٥: هەر ئامرازێکی بەستنەوە، دەوری جیا جیای رستە سازی دەبینێ و بە پێی شوێنیان لەناو دەورەکانیان دەگۆڕێت، هەرچی ئامرازی مەبەستە تەنها یەک مەبەست بەکاردێن وەک بۆ لێکچواندن.

٦: ئامرازی مەبەست، جاری واهەیە هەندێک جۆریان ئەرکی دوو - لایەنی بەکارهێنانیان هەیە، وەک ئەوەی دەبنە دوو جۆرە ئامراز، وەک بانگ کردن بۆ

وەلام، یا بۆ وریاکردنەوەش بەکاردێن، یا ئامرازی سەر سوڕمان دەبنە ئامرازی گاڵتە پێکردن. یا ئامرازی خۆزگەو گومان دەبنە ئامرازی لێکدەر.

٧: هەندێک جۆری ئامرازی مەبەست وەک خۆزگەو گومان و لێکچوون ... هەن دەوری ئامرازی بەستنەوە دەبینن لە رستەدا، بەلام هەر دەوری خۆیان ناگۆڕن ئەم تایبەتییەی ئامرازی مەبەست لە جۆرەکانی بەستنەوە جیا دەکاتەوە.

٨: بەپێی ئەوەی ئامراز لە زمانی کوردیدا، لە رووی تایبەتێتی بەکارهێنانیەوە وەک: لە خالّی چوارەمی ئەم ئەنجامانەدا، کران بە دوو جۆری جیاواز لە یەکترەوە، بۆیە بەشەکانی ئاخاوتنیش پێویستە بە تەواوی دیاری بکرێن، هەروەکو لەمەو پێشەوە، بە ناتەواوی دانراون، ئەمجا دەست نیشان کردنی ئەو بەشانە، لەسەر بنەڕەتێک دەبێت، کە هەر یەکەیان لە زمانەکەدا، لە رووی دەوری سەربەخۆیی کارکردنیان، جیاواز بێت لەوی تریان و، تایبەتێتی خۆیان هەبن وەک ئەم بەشانە:

١: ناو.

٢: راناو.

٣: ئاوەڵناو.

٤: فرمان.

٥: ئاوەڵفرمان.

٦: ئامرازی پەیوەندی.

٧: ئامرازی لێکدەر.

٨: ئامرازی گەیەنەر.

٩: ئامرازی نیازو مەبەست.

# دابەشكردنی ئامرازو جۆرەكانی لە زمانی كوردیدا

**ئامرازی بەستنەوە:**

١: ئامرازی پەیوەندی    ٢: ئامرازی لێكدەر    ٣: ئامرازی گەیەنەر

**ئامرازی نیازو مەبەست:**

١: ئامرازی بانگ كردن.

٢: ئامرازی گومان.

٣: ئامرازی بێجگە.

٤: ئامرازی لێكچواندن.

٥: ئامرازی تەئكید.

٦: ئامرازی مەرج.

٧: ئامرازی وریا كردنەوە.

٨: ئامرازی نەرێ (نەفی).

٩: ئامرازی خۆزگە.

١٠: ئامرازی وەلام.

١١: ئامرازی سەر سورمان.

١٢: ئامرازی گاڵتەپێكردن.

## پەراوێز:

١- بڕوانە: ا- ساڵەح پشدەری، کورتەیەک لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا ١٩٨٥، ل٦٠، جۆرەکانی دووەمی روون کردۆتەوە.

٢- جۆری یەکەمیان کە (ئامرازی بەستنەوەیە)، لێرەدا لێی نادوێین، چونکە بابەتی لێکۆڵینەوەی نامەیەکی دکتۆرایەو، ئەم بابەتەو جۆرەکانی تیادا روونکراوەتەوە، بڕوانە: رفیق محەمەد محێدین شوانی سەرچاوەی پێشوو (ا، ب).

٣:بڕوانە: رەفیق محەمەد محێدین شوانی، سەرچاوەی پێشوو، ب.

٤: بۆ سەرسوڕمان بەکار نایەت، وەکو تۆفیق وەهبی لە لاپەڕە (٢٩)ی فەرهەنگەکەیدا وایداناوە، هەروەها نوری عەلی ئەمین لە لاپەڕە (١٥٢)ی ڕێزمانی کوردی بە هەمان شت دایناوە، راستییەکەی هەڵەیە چونکە بۆ توڕەبوون و گاڵتە پێکردنن.

## سەرچاوەکان:

١- د. ئەو رەحمانی حاجی مارف، جێناو، بەغدا، ١٩٨٧.

٢- رەفیق محەمەد محێدین، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلێجی پەروەردەی ئیبن روشد زانکۆی بە غدا، ١٩٩٧.

٣- رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

٤- ساڵەح حوسێن پشدەری، کورتەیەک لە رێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥.

٥- ک. ک. کورد وێیف، رێزمانی کوردی، وەرگێرانی د. کوردستان موکریانی، هەولێر ١٩٨٤.

٦- نوری عەلی ئەمین، رێزمانی کوردی سلێمانی، ١٩٦٠.

٧- د. وریا عومەر ئەمین، ئامرازەکانی بەستن، رۆژی کوردستان، ژ (٦٧)، بەغدا ١٩٨٤، ل ٢٨- ٣١.

٨- نیعمەت عەلی سایە، ناوو راناو لە زاری کەلهوڕیدا، رۆشنبیری نوێ، ژ (١١٦) بەغدا، ١٩٨٧، ل ٩٣-١٠٠.

# دەوری ئامرازی (بۆ) لەڕووی واتاوە لەڕستەدا

پێش ئەوەی بێینە سەر روونکردنەوەی، دەوری جیاجیای ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لەڕووی واتاوە، پێویستە هێما بۆ ئەوە بکەین، کە بابەتی ئامراز، یا هەر کەرەسەیەکی زمان، پەیوەندی بە ئامرازەوە بێت، یا باشتر بڵێین، سەر بەجۆرەکانی ئامرازبێت، ئەرکی جیاواز، لە شوێنی جیاجیادا دەبینن، واتە وەکو تایبەتییەک بابەتی ئامراز، فرە ئەرکە، چونکە هەر ئامرازێکی بگرێت چەند ئەرکێک دەبینێت(١). جێگای خۆیەتی، ئەوەش روونبکەینەوە، کەرەسەکانی زمان زۆربەیان، لە رستەسازیدا، دوو ئەرک دەبینن، کە ئەمە ئامرازیش دەگرێتەوە.

١- ئەرکی بەشە بنجێکانی ناو رستە، لەمەدا ئامراز لەگەڵ کەرەسەکانی تردا، دەتوانێت ئەم دەورانە ببینێت کاتێک کە گرێ (Phraze)دروست دەکەن.

٢- ئەرکی واتای جیاجیا، لە رستەدا، بەپێی گۆڕانی شوێنیان، دەبینن کە ئەمەیان لە ئەرکی جۆری یەکەم جیاوازە، چونکە سەر بەئاست و بابەتی سیمانتیکییە، (Semantic) چونکە لایەن و ئاستی رستە، پەیوەندییەکی راستەوخۆ بەواتا سازییەوە هەیە، چونکە واتا سازی، بەهۆی رستە سازییەوە

روون دەکرێتەوە، بۆیە پەیوەندییەکی بەهێزو راستەوخۆ، لە نێوان ئەو دوو زانستە زمانەوانییەدا هەیە، واتە واتاسازی و رستەسازی، ئەمجا لێرەشدا، بەپێی بۆچوون و رێزمانی گوێزانەوە (Transformationalrule) کاتێک کەرەسەکانی رستە، بەپێی یاسای دەرهاویشتن (الحذف) و خستنە سەر (الاضافة) و جێگۆڕکێ، (احریک عنصر مکان عنصر لغوی اخر)و گۆڕین(٢)، دەتوانرێ پەیوەندی بنج بکاتە پەیوەندی سیما، رستەکان دوو روویان دەبێ، واتە هەندێک رستە لەرووی واتاوە زیاتر لەواتایەک دەگەیەنێت، چونکە رستە لەرووی واتاوە دوو بنجی هەیە(٣)، ئەم بنجانەش (بناغە) هەریەکەیان سیمای خۆی هەیە، یا یەک سیماو دوو بنجی هەیە، بۆیە (Surface Structure) رستە لە دوو رووەوە لێی دەکۆڵینەوە، لەرووی بنج (Deep Structure) و سیماوە(Surface Structure)، رستە هەیە، یەک بنج دوو سیمای هەیە، یا هەیە یەک سیماو دوو بنجی هەیە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت(٤). ئەمجا ئەم لێکۆڵینەوەیەی ئێمە، سەربە واتاسازییە، لەو شوێنانەدا ئەرکی ئامرازی (بۆ)، بەپێی شوێنی لەناو رستەکاندا، لەرووی واتاکەیەوە دەخەینەروو، لە کوێش بینیمان رستەکان، لەرووی رێزمانی گوێزانەوەوە، زیاتر لە واتایەک دەبەخشن، بنج و سیمایان دەخەینەروو.

وا لە خوارەوە، دەوری واتای ئامرازی پەیوەندی (بۆ) دەخەینەروو، کە پەیوەندی بە ئەرک و دەوری ناو رستەوە نییە.

دوا شت پێویستە ئەوەش بزانین کە ئامرازی (بۆ)، بە پێچەوانەوەی دوو ئامرازەکەی ترەوە، وەک (بە، لە) نییە، لەرووی دەوریانەوە سەر بەئاستی رستە سازییە، چونکە زۆر بەدەگمەن روودەدات ئەم ئامرازە لە پێکهاتی وشەی دارێژراوو لێکدراو بەشداری بکات، بەڵام هەرچی ئامرازی (لە، بە)ن بێجگە لە دەوری رستەسازییان، دەوری چالاکی وشەسازیش دەبینن لە داریشتن و

پێکهاتنی وشەدا، وەک:

بە: بەجەرگ، بەسۆز، قوڕبەسەر، نابەجێ، سەربەسەر.

لە: نالەبار، چنگ لەسەر شان، شەولەبان، سەرلەئێوارە، سەرلەبەر.

هەرچی (بۆ)یە، تەنها گرێ دروست دەکات، وەک: نان بۆ نانەوا، گۆشت بۆ قەساب، بۆ سبەی شەو، بۆ فەقیرو هەژار.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا، هەوڵماندا‌وە، لەڕووی پراکتیکی بەکارهێنانەوە، یاسای دەوری واتای ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، لە رستەدا بدۆزینەوەو، ئەوەش پیشان بدەین، کە ئەم ئامرازە، لەگەڵ چی کەرەسەیەکی زمانی کوردی، لەناو بەشەکانی ئاخاوتندا دێت، دەوری واتاکەی روون دەکاتەوە، ئەو فرمانەی لەگەڵیدا، لە رستەکەدا دێت، چ جۆرە فرمانێکە لەڕووی کات و جۆرەوە؟ هەروەها ئەو گۆڕانانەی کە بەسەر ئەم ئامرازەدا هاتووە، روونمان کردۆتەوە، چ جۆر گۆڕانێکەو، سەر بەچ یاسایەی زمانناسییە، بۆ نموونە وەک جێگۆڕکێ پێکردنی، لە شوێنێکی رستەوە بۆ شوێنێکی تری رستە، ئایا لەو گۆڕان و جێگۆکێیەدا چی روودەدات، وەک ئەوەی ئامرازەکە، وەک خۆی کە ئامرازی پەیوەندییە دەمێنێتەوە، یا دەگۆڕێت بەکەرەسەیەکی تری زمانەکە، یا لە گۆڕیندا، بەئامرازی تری پەیوەندی لەناو هەمان رستەکەی خۆیدا، لێرەدا مەبەستی رستەکە دەگۆڕێت.

وا لە خوارەوە، ئەم دەورانەی ئامرازی (بۆ)یە نموونەوە، رووندەکەینەوە.

١- دەوری ئامرازی پەیوەندی (بۆ) لە رستەدا ئەم دەورانە هەیە:

١- بۆ بەرەو (ئاست - اتجاه).

ئاپ: (بۆ) + ئاوەڵفرمان و ناوی شوێن و جێناوی پرسی شوێن + فرمانی تێنەپەڕی گوێزانەوە:

وەک: بۆ کەرکووک دەچم، بۆ سەرەوە رۆیشتم، بۆ شار هات.

بۆ کوێ دەڕوات؟ بۆ کام لا بردی؟ بۆ (بۆتە جێناوی پرس).

٢- بۆ (لەپێناو - لأجل): بۆ + ناوی کەس (گشتی و تایبەتی)، راناو، ئاوەڵفرمانی

رادەو ریزی و بالآ + فرمان، وەک:

بۆ خوا کردم، بۆ ئالآ هێنام، بۆ پیاوەکە بردم - بۆ خۆیەتی.

١- بۆ + راناوی کەسی: بۆ ئێمەیە، بۆ ئەو رۆیشتم، بۆم کرد.

٢- بۆ + راناوی لکاو: بۆم هات، بۆی کرد، بۆم کڕی.

٣- بۆ + راناوی خۆی: فرمانی تێپەڕ، بۆ خۆی بردی، بۆ خۆتان چوون.

٤- بۆ + راناوی نیشانە: بۆ ئەمە هات، بۆ ئەوانە ناردی، بۆ ئەم بوو، بۆ ئەمانە دەبێ.

٥- بۆ + راناوی نادیار: بۆ فلان کردی، بۆ فیسارمە.

٦- بۆ + ئاوەڵفرمانی رادە: بۆ هیچ کەس نییە، بۆ تۆزێک بەراو ئێرەی جێهێشت.

٧- بۆ + ئاوەڵفرمانی ریزی: خەلآتەکە بۆ یەکەمین کەسە.

٨- بۆ + ئاوەڵناوی پلەی بالآ: بۆ جوانترین کچ دانراوە.

٩- بۆ + راناوی پرسی کەس: بۆ کێ بوو؟، بۆ کام کەسە؟ بۆ کێ هات؟

١٠- بۆ + فرمانی تێپەڕ: کتێبی بۆی کڕی، بۆی برد، نانم بۆ کڕی، پارەی بۆ برد.

ئەگەر (بۆ)ی نموونەکانی یاسای دەیەم لەتەک فرمانەکەوە، جێگۆڕکێی بۆ سەرەتاو پێشەوەی بەرکارەکە بەپێی یاسای گوێزانەوە (Transformation) پێ کرا، لە ئامرازی پەیوەندییەوە دەگۆڕێت بۆ جێناوی پرس، بەم شێوەیە، هۆی ئەمە ئەوەیە، شێوەیان یەکە، ئەگەر جێناوە پرسەکەی (بۆ) بگەڕێنینەوە بنەڕەتەکەی کە (بۆچی)یە ئەم دیاردەیە هەڵدەوەشێتەوە.

نانم بۆ کڕی ......... بۆ نانم کڕی؟............ بۆ کڕی؟ (بەهۆی) (لێ

دەرکردنەوە).

جارێکی تر بوو پرسیار. لە رستەکاندا شێوەی (بۆ)یەکان یەکن، بەڵام لە واتادا جیاوازن:

نانت بۆ کڕی....... بۆ نانت کڕی؟.....

بۆچی نانت کڕی (بەهۆی) زیادکردن و هاویشتنە سەری (اضافە).

٣-(بۆ) نیازو مەبەست یاسایەکەی:

ئاب (بۆ) + ناوی کردەوەو چاوگ، ئیش و کار، ناوی بەرجەستەو واتایی..

- ئاپ (بۆ) + ناوی بەرجەستەو واتایی..

- ئاپ (بۆ) + ناوی کردەوە: بۆ ئیش وکار رۆیشتم، بۆ جووت دەچم.

- ئاپ (بۆ) + ناوی چاوگ: بۆ خەو دەچمەوە، بۆ پۆشاک کڕین رۆیی.

- ئاپ (بۆ) + ناوی چاوگ: زەردەشت بۆ خوێندن دەڕوات.

- ئاپ (بۆ) + ناوی بەرجەستە: ئالا بۆ ئاو دەچێت، ئاڤێستا بۆ دار دەچێ.

- ئاپ (بۆ) + ناوی واتایی: وێنەکەم بۆ جوانی کڕی، بۆ خۆشی هاتووە.

ئەڵێی بۆ فریشتە ئەیکات.

٤- (بۆ) دیاری کردنی کات:

١- لەگەڵ ناوو ئاوەڵفرانی کات و جۆرەکانی فرمانا، کاتی رووادانی فرمان دیاری دەکات، نەک رووی دابێ لەماوەیەکی دوورا، ئەگەریش بگونجێ بۆ رابردوو، ماوەی روودانەکەی یا نزیکە، یا پەیوەندی بە کاتی روودانێکی نزیک ترەوە هەیە، وەک:

- لەگەڵ ئاوەڵفرمانی کاتا: بۆ لەمەولا دێم بۆ لاتان، بۆ ئێستا دەست پێدەکات.

- لەگەڵ ناوی کاتا: بۆ ئێوارە دەڕۆم بۆ کەلی سمایل بەگی، بۆ سبەینێ هات، بۆ ئێوارە دێ.

٢- لەگەڵ ناوو ئاوەڵفرمانی کاتی رابردوودا، بەکارناهێنرێت و ناشێ بڵێین: بۆ دوێنی چووم، بەڵام ئەگەر فرمانەکەی رابردووە دووربێ بەکاردەهێنرێت وەک: خەڵاتەکە بۆساڵی رابردوو بوو.

٣- لەگەڵ جێناوی پرسی کاتا، کە بۆ دیاریکردنی کاتی روودانی فرمانەکەیەو دەبێتە جێناوی پرس و لە ئامرازی دەکەوێت: بۆ کەی هات؟ بۆ: ئاپ.

بۆ کەی دێت؟ دەبێتە جێناوی پرس.

٥- (بۆ) هۆ: لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕی گوێزانەوەو روودان (مطاوعە)و ئەو فرمانانەی، کە لە دەنگە سروشتییەکان و، فرمانە بەتێپەڕ کراوەکانا، بەهۆی نیشانەی (اند)ەوە، دادەرێژین، هەروەها لەگەڵ جێناوی پرسی هۆدا، بەڵام لە ئامرازی پەیوەندێتی دەکەوێت و، دەبێتە جێناوی پرس، نموونە:

- (بۆ) لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕی گوێزانەوەدا: ئەو بۆ هات؟ بۆ کەوتن؟
- (بۆ) لەگەڵ فرمانی تێنەپەڕی روودانا: بۆ سووتا؟ بۆ خنکا؟
- (بۆ) لەگەڵ فرمانی دەنگە سروشتییەکانا: بۆ قیڕاندی؟ بۆ زیڕاندی؟
- (بۆ) لەگەڵ فرمانە بەتێپەڕ کراوەکانا: بۆ سووتاندی؟ بۆ خنکاندی؟
- (بۆ) لەگەڵ جێناوی پرسی (چی)دا، بەڵام لە ئامرازی پەیوەندێتی دەکەوێت وەک: بۆچی لە کاروانی خەباتا دواکەوتی؟

ئەگەر ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، کەوتە سەرەتای رستەی فرمانی تێپەڕەوە، وەک لەکۆتایی یاساکانی (بۆ)ی ئامرازی پەیوەندی (لەپێناو)دا، خستەڕوو رستەکە کە بۆ مەبەستی پرس دەگۆڕێت. کەچی ئەم دیاردەیە، بەپێی یاسای جێگۆڕکێی رێبازی گوێزانەوە(٥)، لە رستەی فرمان تێنەپەرا پێچەوانەی یەکترین، وەک:

رستەی فرمان تێپەڕ: کتێبی بۆکڕی (لەپێناو)....... بۆ کتێبی بۆ

(کڕی؟) (بۆ هۆ)؟

له ڕستەی فرمانی تێنەپەڕا، ئەگەر ئامرازەکە، لە سەرەتای ڕستەکەوە هات، بەمەرجێک بەرکاری ناڕاستەوخۆی لەگەڵدا بێت، (لەپێناو) دەگەیەنێت و، لەم دۆخەیدا، بەشەکانی ڕستە لە (بکەر، بەرکار، فرمان) لەرستەدا دیارن، بەڵام ئەگەر بووە پرس تەنها بکەرو فرمان دیارەو پرسیار لەبەرکار دەکرێ وەک:

بۆ کوڕەکە هات، بۆ کۆڕەکە هاتین (بۆ: ئاپ) لە پێناو دەگەیەنێ) کوڕەکە بۆ هات؟ (بۆ: جێناوی پرس ل ئاپ).

ئەگەر پێکەوە پشان بدرێن، تەواو پێچەوانەی یەکترین بەم شێوەیە: ڕستەی فرمانی تێپەڕ/ ڕستەی فرمانی تێنەپەڕ: بەمەرجێک جێناوی پرسی (بۆ) لە ڕستەکەدا نەبێت وەک لەرستەی (بۆچی کتێبی بۆکڕی؟)، بڕوانە نموونەی ئەم دیاردەیە:

کتێبی بۆ کڕی؟ (بۆ – لەپێناو) / کوڕەکە بۆ هات؟ (بۆ ـــ )پرسی هۆ)

بۆ کتێبی کڕی؟ (بۆ – پرسی هۆ) / بۆ کوڕەکە هات. (بۆ ـــ لە پێناو)

دیاردەیەکی تری ڕستەی فرمانی تێپەڕ لە چۆنیەتی بەکارهێنانی ئامرازی پەیوەندی (بۆ)دا، ئەوەیە، ئەگەر بە هۆی دەربڕینەوە ئاوازی (Intonation) ڕستەکە، هێز خرایە سەر ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، ئەوا ڕستەکە، دەگۆڕێت بۆ پرسی هۆ، ئەگەریش ئاوازی ڕستە وەک یەک دەربڕا، ئەوا (بۆ) وەک خۆی بە ئامرازی پەیوەندی دەمێنێتەوەو (لەپێناو) دەگەیەنێ، بەپێی یاسای بەکارهێنانی. وەک:

کتێبی بۆ کڕی؟ (بۆ – پرسی هۆیە) – نیشانەی بەکارهێنانی سترێس و ئاوازە.

کتێبی بۆ کڕی. (بۆ – ئاپ – لەپێناو).

٦- ئاپ (بۆ) گومان:

ئەگـەر ئامـرازی پەیوەندی (بۆ)، بەپێی یاسـایەک لەگـەڵ فـرمـانی (ئیلزامی)چاوگی (بوون) و (هەبوون)، بۆ کاتی رانەبردوو رابردوو، بەکارهات (گومان) دەبەخشێ.

وەک: بۆ+تەواوکەری ناڕاستەوخۆ + فرمانی چاووگی (بوون،هەبوون):

بۆ کـوڕەکـەی بێ ببێ ). بۆ کـوڕەکـەی هەبێ باشـە، بۆ کـوڕەکـەی بوایە. بۆ کوڕەکەی هەبوایە باش بوو.

٧- ئاپ (بۆ) دوعاو نوزا دەگەیەنێت، وەک:

- بۆ خاتری خوا وازی لێ بهێنە.

- بۆ خاتری کاکە حمەدی شێخ لێرە برۆ.

٨- بۆ: بۆ (لەگەڵ بوون ) - المصاحبە: ئاوەڵناو + ئاپ (بۆ) + ناو

وەک: بەحیلمە بۆ ئەدەب و زانست. خراپە بۆ کوڕەکەی.

٩- بۆ: بۆ ماوەی (مسافە) کات و شوێن: ناوی کات + ئاپ + ناوی کات.

ماوەی کات: لە ئێوارەوە بۆ بەیانی کاردەکەم.

ماوەی شوێن + ئاپ + ناوی شوێن: ماوەی شوێن: لە هەولێرەوە بۆ مەهاباد چووم.

١٠- بۆ: بۆ هەیی (تملک (POSSESSIVE).

ئاپ (بۆ) + ناو، راناو (کەسی و خۆیی)

ئەمە بۆمن، ئەوەش بۆ ئاڤێستا.

بۆ پیاوی عاقڵ ئیشارەتێک بەسە.

١١- بۆ: وەکو ئامرازی گەیەنەر (بۆ شوێن و بەرەو) لە شێوەی گرێدا:

ئاپ (بۆ) + گرێی ئاوەڵفرمانی شوێن:

بۆ هەر لایەک بێت ئەویش دەڕوات.

بۆ هەر کوێیەک بڕوات ڕێزی لێدەگرن.

١٢- بۆ: وەکو ئامرازی گەیەنەر بەشێوەی گرێ (بۆ هەڵبژاردن)

ئاپ (بۆ) + ئامرازی گەیەنەر (هەڵبژاردن): بۆ هەر کامیان بێت دەیخوازم.

١٣- بۆ (بۆ دیاری کردنی شوێنی ڕوودان): ئاپ (بۆ) + ئاوەڵفرمان + پاشکۆ ئاپ.

بۆ خوارەوە، بۆ سەرەوە، بۆ لاوە.

گۆڕان و جێگۆڕکێ کردنی ئامرازی پەیوەندی بۆ:

ئامرازی پەیوەندی (بۆ) ئەگەر بکەوێتە دوای فرمانی گوێزانەوەوە، ڕواڵەتی دەگۆڕێ و دەبێتە ئامرازی/ە/یا /تە/ و لەگەڵیدا جێگیر دەکرێ:

زەردەشت چوو بۆ بازاڕ..... زەردەشت چووە بازاڕ.

بۆ ........... (ئەمە جێگری ئامرازی پەیوەندی (بۆ)یە(٦)

ئاڵا هاتووە بۆ ئێرە........ ئاڵا هاتۆتە ئێرە. بۆ ـــ تە.

دیاردەیەکی تری بەکارهێنانی ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، لەگەڵ فرمانی تێپەڕا هەیە، ئەگەر بەرکارەکە لە ڕستەدا بەڕاناوی لکاو جێگیرکرا ئەوا (بۆ) دەکەوێتە تەک فرمانەکەوە، وەک: گوڵتان بۆ دەنێرم...... بۆتان دەنێرم.... بۆ دەنێرم.

کوڕەکەم بۆ هێنا..... بۆم هێنا...... بۆ هێنا.

بەلادانی بەرکارو جێگیرکردن بەراناوی لکاوو پاشان لادانی(٧) جێگرەکەشی، کە ڕاناوی لکاوە، یەکسەر دەکەوێتە تەک فرمانەوە، هەمان دیاردەی سەرەوە ئەگەر فرمانەکەی تێنەپەڕبوو- لەمە پێشەوە، ئەمەمان بەشێوەیەکی تر خستۆتەڕوو - دەبێتە ڕستەی پرسیاری، بەم جۆرە:

ئێمە بۆی بچین ـــ بۆی بچین ـــ بۆ بچین؟ هەمان دیاردەیە لەگەڵ فرمانی تێپەڕی داخوازییا (فەرمان - أمر) دەگەیەنێ، وەک: بۆم هێنا ـــ بۆ بهێنە.

## گۆڕینی ئامرازی پەیوەندی (بۆ) بە ئامرازی تر:

لە رستەدا دەتوانرێ، بەپێی یاسای گۆڕینی کەرەسەیەک، بەکەرەسەیەکی تر، کە بەشێکە لە سیستەمەکانی رێزمان(٨) دەتوانرێ ئامرازی (بۆ)ی پەیوەندی بگۆڕین بەئامرازێکی تری پەیوەندی، کە تەنها لەو گۆڕانەدا مەبەستی بەکارهێنانی ئامرازەکە، بێ تێچوونی واتا گشتییەکەی دەگۆڕێ و دەورێکی تری دەداتێ، وەک گۆڕینی (بۆ - تا)،(بۆ - بە)، نموونە:

بۆ سەر لوتکەی خاڵخاڵانا دەچم (بۆ - بەرەو) تا سەر لوتکەی خاڵخاڵان دەچم، (تا کۆتایی شوێنی روودان) بەگۆڕینی (بۆ) کە (ئاست -اتجاه) دەگەیەنێ بۆ ئامرازی (تا) کۆتایی شوێنی روودان دەبەخشێت.

بەسەر لوتکەی خاڵخاڵان دەچم، گۆڕینی (بۆ ـــــ بە)و راگەیاندنی سەرەتای روودان و وەرگرتنی پاشکۆی (ا)ی کورتکراوەی (دا) نیشانەی ئاوەڵفرمانی شوێنە. کەچی لەم گۆڕینەدا لەگەڵ ئامرازی (لە)ی پەیوەندیدا ناگونجێ و واتای رستەکە ناوێزە دەرەچێ و، بەریاساکەی چومسکی ناکەوی، کەچی (تا) شوێنی (بۆ) لە نێوان دوو ناوی شوێنا بەکاردەهێنرێ وەک:

لەکەرکووکەوە بۆ بەغدا چووم (بەرەو - اتجاه) ـــــ لە کەکووکەوە تا بەغدا چووم (بۆ کۆتایی شوێن).

## ئامرازی پەیوەندی (بۆ)و وەرگرتنی پاشکۆ

ئامرازی (بۆ) تەنها لەگەڵ ئاوەڵفرمانی شوێنیدا پاشکۆی (ەوە) وەردەگرێ و لەگەڵ بەشەکانی تری رستەدا لە ئاوەڵفرمانی کاتی و بەرکارو تەواوکەری ناڕاستەوخۆدا نایەت(٩).

بۆ خوار(ەوە) دەڕۆم. پاشکۆی (ەوە) وەردەگرێ چونکە ئاوەڵفرمانی شوێنییە.

بۆ ئێواره دەڕۆم. پاشکۆی نییه چونکه ئاوەڵفرمانی کاته.

بۆ ناڕوجه ڕۆیشت. پاشکۆی نییه چونکه تەواوکەری ناڕاستەوخۆیه.

ئەم (بۆ)یەی سەرەوه که لەگەڵ پاشکۆی (ەوه)دا بەرکارهاتووه. دەتوانرێ چ بێ گۆڕانی ڕستەکه - واته بێ دەستکاری کردنی - لەگەڵ (له)ی ئامرازی پەیوەندیدا دەورەکەی خۆی بگۆڕێتەوه بۆ مەبەستی (داخ خواردنەوه): کەچی، له شوێنی ترا لەگەڵ (له)دا بەکارنایەت وەک:

- بۆ کەرکووک ڕۆیشت. (بەرەو)

لەکەرکووک ڕۆیشت. (بۆ داخ خواردن) وەک بڵێی: له ئێمه چوو ـــ له دەست ئێمه چوو.

+ بۆ سلێمانی چوو.

له سلێمانی چوو. (واته له دەستی خەڵکی سلێمانی چوو.

**تایبەتییەکانی ئامرازی پەیوەندی (بۆ):** ئەمانەن

١- بەمەبەستی جۆر بەجۆر له ڕستەدا و بەپێی شوێنەکەی بەکاردێت، بۆ کات و ئاست (بەرەوو هۆو نیازو ماوەو له پێناوو لەگەڵ بوون و گومان... بەکاردەهێنرێت.

٢- تەنها لەگەڵ ئاوەڵفرمانی شوێنی یا پاشکۆی (ەوه) وەردەگرێت.

٣- دەبێته جێناوی پرسی هۆ، له دوو دۆخ و شوێندا، ئەگەر بکەوێته نێوان بکەرو فرمانی تێنەپەڕەوه، له ئامرازی پەیوەندی دەکەوێت، وەک (کوڕەکه بۆ هات؟) بەپێچەوانەشەوه ئەگەر کەوته سەرەتاو پێشی بەرکاری هەمان جۆری فرمانەوه، دەبێته ئامرازی پەیوەندی و (له پێناو) وەک: (بۆ کوڕەکه هات).

دەگەیەنێت، هەروەها ئەگەریش فرمانی ڕستەکه تێپەڕ بێت، له سەرەتای ڕستەوه ئامرازی (بۆ) دەبێته جێناوی پرس، لەڕواڵەت و واتاداو ئەگەر لەنێوان بەرکاری ڕاستەوخۆو فرمانەکەوه بێت، دەبێتەوه ئامرازی پەیوەندی و لەجێناوی

پرس دەکەوێت و لە (پێناو) دەگەیەنێ.

٤- ئەگەر بەرستەی فرمانی تێپەڕا، لەڕووی دەربڕینی ئاوازی رستەکەوە، هێز خرایە سەر ئامرازی پەیوەندی (بۆ)، رستەکە دەبێتە پرس و، لەبوونە ئامرازی پەیوەندی دەکەوێت، ئەگەریش ئاوازی دەربڕینی رستەکە یەکسان بوو وەک خۆی (بۆ) بە ئامرازی پەیوەندی دەمێنێتەوە.

٥- (بۆ) بەپێی رێباز و رێزمانی گوێزانەوە (Transformation) بەتایبەتی یاسای جێگۆڕکێ کردنی لەگەڵ ئامرازی تری پەیوەندییاو بەپێی پەیوەندی ستوونی (Pragmaticrelation) دەتوانرێ بەکەرەسەیەکی تری سەر بەهەمان رەگەز (١٠)، کە ئامرازی پەیوەندی (بە، تا)یەو، بێ ئەوەی کار لە تێکچوونی شیرازەی پێکهاتن و واتاکەی بکات و تەنها مەبەست دەگۆڕێت، کەلەمەو پێشەوە بەنموونەوە خستمانەڕوو.

پەراوێز:

١- رفیق محمد محێدین، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دوکتۆرا زانکۆی بەغدا ١٩٩٧، ل٥٣.

٢- نوم چۆمسکی، البنی النحویه، ت: یوئێل یوسف عزیز، بغداد، ١٩٨٧، ص١٥٤.

٣- محمد رەزای باتینی ئاوڕێکی تازە بۆ سەر رێزمان، وەرگێڕانی حەسەنی قازی، سوێد، بنکەی ئازاد، ١٩٩٣، ل١١٤.

٤- د. وریا عومەر ئەمین، بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢١)، بەغدا ١٩٨٩، ل٧٢- ٧٥.

٥- نوم چۆمسکی، هەمان سەرچاوە، ل١٥.

٦- هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە، هەروەها نوری عەلی رێزمانی کوردی، سلێمانی ١٩٦٠، ل٢٠٣.

٧- محمد رەزای باتینی، هەمان سەرچاوە، ل١١٤.

٨- هەمان سەرچاوە، ل٧٣.

٩- ئاوەڵفرمان پاشکۆ وەردەگرێ، بەڵام بەرکارو تەواوکەری ناڕاستەوخۆ وەری ناگرێت، بڕوانە: محمود فتح الله، کار تەواوکردن لە کوردیدا، ١٩٨٨، ل١٢٢ .

١٠- سەرچاوەی ژمارە (٣)، ل٧٩-٨٠ .

## سەرچاوە:

١- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بەغدا، ١٩٧٦ .

٢- رفیق محمد محێدین، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دوکتۆرا زانکۆی بەغدا، ١٩٩٧ .

٣- سالّح حوسێن پشدەری، کورتەیەک لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا ١٩٨٥ .

٤- محمد رەزای باتینی، ئاوڕێکی تازە بۆ سەر ڕێزمان، سوێد، ١٩٩٣ .

٥- محمود فتح الله، کار تەواوکردن لە کوردیدا، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٨ .

٦- نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠ .

٧- نوم چۆمسکی، البنی النحویه، ت: یوئێل یوسف عزیز، بغداد ١٩٨٧ .

٨- وریا عومەر ئەمین، بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٢١)، ل٧٢-٧٥ .

# جیاکردنەوەی هەندێک
# کەرەسەی ڕێزمانی لەیەکتر

ڕێزمان بریتییە لە دیاریکردنی یاساو دەستووری بەکارهێنانی کەرەسەی زمان، کە بە هۆیانەوە بەپێی سیستەمێکی ڕێکوپێک ئاخاوتن دێتە ئەنجام، ئەمجا دیاریکردنی ئەو کەرەسانەی زمان هەوڵێکی گرنگی ڕێزمانە، چونکە ئەو کەرەسانە لە پێشدا پێویستە، لەیەکتر جیابکرێنەوە، ئەگەر جیانەکرێنەوە، ئەوا لە لێکۆڵینەوەی ئاستەکانی زماندا بەپێی کارکردنی زمانەکە، تووشی هەڵە دەبین، لێرەدا جێگای ئەوەیە زمان لە رووی بنیادگەرییەوە - Structure- بە خانوویەک دابنێین، پێش ئەوەی خانووەکە بکرێت، دەبێت هەموو کەرەسە خاوەکانی لە بچووکترینەوە تا گەورەترین دیاری بکرێن، ئەمجا لە قۆناغی دووەمدا لەیەک دەدرێن و هۆی لێکدانیشیان لە هەندێک شوێندا پێویستە وەک لە دیوارکردندا ناتوانرێت بەبێ قوڕو چیمەنتۆ ئەو کەرەسەو خشت و بلۆک و بەردەکانی لێکبدرێن، هەندێکیانیش بەبێ هۆی ڕاستەوخۆ لێکدەدرێن، بەڵام دەبێت هەر کەرەسەیەکی لە شوێنی خۆیدا دابنرێت، تا خانووەکە تەواو دەبێت، زمانیش بەوجۆرە بەپێی پێکهاتنێکی بنیادگەرییەوە -Structure- لە کەرەسەی بچووک تا گەورەو گەورەتر وەک (دەنگ، فۆنیم- Phonem، مۆرفیم - Morphem، وشە، گرێ-Phrase، ڕستە) پێکدێت ئەم دانانە،

هەریەکەیان دەخرێنە سەر یەکترو کەرەسەی لە خۆیان گەورەتر، پێکدەهێنن، وەک دەنگە خاوەکان دەبنە فۆنیم و لە شوێنی جیاوازدا واتای وشە دەگۆڕن، چەند مۆرفیمێک وشە پێکدەهێنێت و پاشان لە وشەوە رستەو رستەش گەورەترین دانەی زمانە، کە بە هۆیەوە کردەی ئاخافتن ئەنجام دەدرێت.

جا ئەم کەرەسانە لە رێزماندا وەک دانەی کردارەکی (عملي) لەناو بەشەکانی ئاخاوتن سەر بەو بەشانەن، پرۆسەی قسەکردن ئەنجام دەدەن.

بۆیە ئەو کەرەسانە لە رووی دیاریکردنی دەوریانەوە لە رێزماندا یا بوونیان لە ناو خانەی زماندا، واتە لەناو ئاستەکانیدا Level- دوو جۆرن:

١- **کەرەسەی وشەسازی:** بریتییە لە وشەو مۆرفیم کە لە رووی هەبوونیانەوە لە زمانەکەدا سەربەخۆو ناسەربەخۆن.

٢- **کەرەسەی رستەسازی:** لە گرێ و رستە پێکدێن، لەناویاندا کەرەسەی وا هەیە، واتای نییە، بەڵکو لە بواری رستەدا ئەرکی خۆی دەبینێت و بە کەرەستەی رێزمانی ناو دەبرێن.

ئەمجا ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە، لە دیاریکردن و جیاکردنەوەی هەندێک لەو کەرەسانە، کە تا ئێستا بە چەند شێوەیەک یا وەک چەند بابەتێک ناویان لێنراوە، یا باسکراون، لێرەدا ئێمە هەوڵدەدەین سنوورێک لە نێوانیاندا دابنێین، چونکە رێزمانی زمان ئەگەر بە تەواوی دیاری نەکرێت ئەوا لێکۆڵینەوەکانی ناتەواو دەردەچن.

لە رێزمانی زمانی کوردیدا، هەندێک کەرەسەی وەک (زیادەی وشە دارێژ affix مەبەست لە پێشگرو پاشگر، نیشانە، جێناو- بەتایبەتی هی پرس، بابەتی ئامراز) بەناوی بابەتی ئامراز دانراون، راستییەکەی ئەمانە بابەتی لە یەکتر جیاوازن و، بەهەڵە وەک بابەتی ئامراز، لە رێزماندا جێگایان دەست نیشان کراوە، یا باشتر بڵێین، ناتوانرێت ئەم بابەتە جیاوازانە، وەک ئامراز لە

لێکۆڵینەوەی زماندا، رەفتاریان لەگەڵدا بکەین، چونکە هەریەکەیان بابەتێکی جیاوازن و بە تەنیا تایبەتییەتی خۆیان هەن، بۆیە پێویستە لەیەکتر جیابکرێنەوەو، لە زمانەکەدا سنوورێک بۆ جیاکردنەوەیان بەپێی ئەرکەکانیان، دیارو دەست نیشان بکرێت، چونکە بابەتی تێکەڵ کراو، سەر لە شیکردنەوەی کەرەسەکانی ناو رستەسازی دەشێوێنێت، ئەم تێکەڵ کردنەش، لەناو زمانەوانانی کوردو ناکوردا کراوە، بۆیە ئەم بابەتانەی سەرەوە ناکرێ و ناشێت بینە ئامراز، لەبەر ئەوەی ئامراز بابەتێکی فرە ئەرکە، بەپێی گۆڕانی شوێنی ناو رستەیان، کە ئەم گۆڕانی شوێنە، وەک بەشێکی رێزمانی گوێزانەوە (Trans Formation) ئەو دەورە جیاوازانەی کەرەسەکانی ئامراز ڕووندەکاتەوە. ئامراز بابەتێکی چالاکی زمانە، رەوتی رستە بۆ لای خۆیان رادەکێشن، ئامرازیش بە هەردوو جۆرەکەیەوە وەک:

١- ئامرازی بەستنەوەو جۆرەکانی(١)

٢- ئامرازی نیاز و مەبەست (٢)

دەبنە هۆی رێکخستنی سیستەمی رستەو، هەر جۆرێکی ئەو دوو جۆرانەی سەرەوە لە چەند جۆرە بابەتێکی ئامراز پێکهاتوون و هەر یەکەیان لە چەند کەرەسەیەکی ئەو جۆرانە پێکهاتوون، بەپێی شوێن ئەرکیان دیاری دەکرێت.

ئەم ئامرازانە وەک کەرەسەیەکی زمان، ئاخاوتنیان پێ ئاسان دەکرێت و چۆنیەتی سیستەمی پێوەندی ناو بەشە بنجێکانی رستە، لە رووی رێکخستنی پێوەندی نێوانیان و دەرخستنی مەبەستی ئەو بەکارهێنانە جیا جیایانە ڕووندەکەنەوە، ئەم دوو جۆرە ئامرازانەی سەرەوە، هەردووکیان فرە ئەرکن، ئەگەرچی جۆری دووەمیان رادەی فرە ئەرکییان لە جۆری یەکەمیان کە ئامرازی بەستنەوەیە کەمترە. لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لەدەورێک و ئەرکیان هەیە(٣).

بۆیە دەکرێت، ئەم کەرەسەی ئامرازە، لە رووی ئەرکەوە، لە زماندا دەوریان لە

هەندێک ئامێرو ئامرازی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ دەچێت، کە مرۆڤ بۆ ئاسان کردنی ئیش و کارو راپەڕاندنی بەکاریان دەهێنن و لە زەحمەتی مرۆڤ کەم دەکەنەوە، بۆ نموونە وەک ئامێرو ئامرازی چەکوش و پلایس و دەرنافیز و گاز..... تاد وان.

هەرچی ئامرازی زمانیشە، کردەی ئاخاوتن ئاسان دەکەن و، دەبنە هۆی دروست بوونی پێوەندی و ئەرکی جۆر بەجۆری ناو ئاخاوتن دەبینن، بۆ نموونە ئەگەر کوردی نەزانێک تازە زمانی کوردی فێر بووبێت، نازانێت ئەم ئامرازانە بەباشی و یان لە کوێدا بەراستی بەکاریان بهێنێت، بۆیە نارێکی بە ئاخاوتنەکەیەوە دیارە.

نموونە ئەرکی ئامێرەکان:

چاکوچ: ——— بزمار دادەکوتێت، بزمار هەڵدەکەنێت، هەرشتێ بتەوێت پێی دەشکێنیت.

پلایس: ——— بزمار هەڵدەکەنێت، شتی پێدەگرێت، وایەری پێ کەرت دەکەیت وایەری کارەبای پێ دەگرێت، وایەر دەقرتێنێ.

دەرنافیزو گاز: هەمان ئەرکی جیاواز دەبینن، بورغی دەبەستێت، بورغی دەکاتەوە. گاز بزمار هەڵدەکەنێت.

هەر لەبەر ئەمەشە زمانەوانان ناویان ناوە ئامراز. نموونەی ئەرکی چەند ئامرازێک لە ئەرک و شوێنی جیاوازدا:

**- بۆ سەرەوە دەچم. ئاوەڵفرمانی شوێنی پێکهێناوە - تەواوکەرە**

**- بۆ ئازاد هێنام. بەرکاری ناڕاستەوخۆی دروست کردووە.**

**- گوڵەکە بۆ تۆیە. تەواوکەری ناڕاستەوخۆی دروست کردووە.**

**- بۆ ئێوارە هاتمەوە. ئاوەڵفرمانی کاتی دروست کردووە، تەواوکەری ناڕاستەوخۆی فرمانە، لە رووی واتاوە ئامراز دیسان واتای بەپێی شوێن**

**دەگۆڕێت وەک:**

**- بۆ تۆم هێنا. (لە پێناو دەگەیەنێت - واتە لأجل)**

**- بۆ خاتری خوا. (بۆ دوعاو نوزاو پاڕانەوە)**

**- بۆ کەرکووک چوو. (بەرەو - اتجاه تەواوکەری ناڕاستەوخۆ)**

**بە: - من بە تۆم وت . (بەرکاری ناڕاستەوخۆی دروست کردووە)**

**- دەبم بە گوڵ. (تەواوکەری ناڕاستەوخۆی فرمانی بێهێزە)**

**- بە چەکوش شکاندم ( بە: واسیتەو هۆیە)**

**وەک: - مامۆستا وەک باوکە (وەک: ئامرازی لێکچوونە)**

**- وەک تۆ هاتیت من نووستبووم. (کات- ئامرازی گەیەنەرە) رستەی ئاڵۆزی پێکهێناوە.**

**- خۆزگە دەهاتم لەگەڵتانا. (ئامرازی خۆزگەیە)**

**- بە خۆزگە نابێت. (ناوە: تەواوکەری ناڕاستەوخۆیە)**

**- دیوانی خۆزگەم خوێندەوە. (گرێی ناوی پێکهێناوە - ئەرکی بەرکاری ڕاستەوخۆیە).**

تایبەتییەکی تری ئامراز لەوە دایە، کە بێجگە لە ئاستی رستەسازی، ئەرکی ئاستی وشەسازیش دەبینێت و بەشداری داڕێشتن و پێکهاتنی وشەو مۆرفیمی دی دەکات، وەک ئامرازی پێوەندی:

بەڕێز، بە جەرگ، بە سۆز، قوڕبەسەر، دەست بە دەست، مێرگەسوور. هەرکەس، هەردەم، هیچ کەس، نالەبار، سەروبەر، گەرمەسێر، کانەبەرد.

ئەم نموونانەی سەرەوە جیاوازی نێوان ئامرازو بابەتەکانی تری وەک (زیادەی وشەداڕێژ، نیشانە، جێناو) روون دەکەنەوەو لە خوارەوەدا ئەم بابەتانەی سەرەوە وەک بابەتی جیاواز جیاواز لە ئامراز دەست نیشان دەکەین:

## زیادەی وشەداڕێژ affix

ئەم بابەتە پێشگرو ناوگرو پاشگر دەگرێتەوە، سەر بە ئاستی وشە سازین و لە داڕێشتن و پێکهاتنی وشەی داڕێژراوو لێکدراو بەشداری دەکەن و، دەبنە بەشێک لە وشە پێکهاتووەکەو گۆڕان بەسەر رەگی وشە دەهێنن و واتاکەی بۆ دەگەڕێننەوە، یا وشەی نوێ و تازەی لێوە پێکدەهێنن وەک ناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان: نووسەر، نووسراو، بنووس، نامەنووس، بەهێز، بێ هێز، بەجەرگ، راگرتن، هەڵکردن، جوانی، جوانوو، سەربن، سەوزە، سەوزەوات، پیاوەتی، کڕیار، کۆکە، پرسە، کەوتوو، خەوتوو، زانا، دانەر.... تاد.

ئەم پێشگر و پاشگرانە، ناوو ئاوەڵناوی جۆر بەجۆریان دروست کردووە و، چوونەتە ناو قاڵبی وشەکانەوەو، واتاو رواڵەتی تازەیان پێداون.

لێرەدا ئەوەی جێگای سەرنجە، ئامرازی پێوەندیش لە ئاستی وشەسازی بەشداری پێکهاتن و داڕێشتنی وشە وەک پێشگر و پاشگر دەکات و، دەوری ئەو دوو کەرەسەیە وەردەگرن و، لەناو وشەکەدا وەکو ئەوانیان لێ دێت نموونە:

**وەک پێشگر:** بەهێز، بەجەرگ، لەبار، لەسەر (واتە تووڕەو هەڵەشە)،....

**وەک ناوگر:** لە نجەولار، سەروبەر، قوڕبەسەر، نالەبار، گوڵەگەنم.

ئامرازە پێوەندییەکانی سەرەوە، بوونەتە بەشێک لەو وشانە، جیاوازییان لەگەڵ ئامراز ئەوەیە، ئامراز دەورو واتای جۆر بەجۆرو بەپێی شوێن دەگۆڕێن، بەڵام زیادە و وشەداڕێژەکانی (پێشگر و پاشگر) سەرەوە، تەنانەت ئامرازی پێوەندیش، کە ئەو دەورە دەبینن، یەک واتاو دەوریان هەیە. واتە هەر پاشگرو پێشگرێک دەبینیت یەک واتای هەیە، وەک (هەڵ) واتای بۆ سەرەوە دەبینێت وەکو هەڵگرتن، یا داگرتن، (دا) یەک واتای بۆ خوارەوە هەیە، بەڵام ئامرازە پێوەندییەکان، لە ئاستی رستەسازیدا، ئەرک و واتای جۆر بەجۆریان هەیەو، بەپێی شوێنی ناو رستەکان، بەپێی یاسا جیا جیاکانی رێزمانی، شیکردنەوەی

گـوێزانەوە (Trans Formation) لە جـێگۆڕکێ پێکردن و گـۆڕانیـان بە کەرەسەو ئامرازی تر (٤) ئەو دەورانە دەبینن.

**نموونە: - بۆ کەرکووک دەچم. بەپێی یاسای گۆڕان (شوێن)**

**- تا کەرکووک دەچم. کۆتایی شوێن**

**- بە کەرکووکدا دەچم. ناو شوێن روودان- تێپەڕین**

**- چووم بۆ کەرکووک ــــ چوومە کەرکووک. جێگیرکرا بەڕاناو**

**- بۆ ئێوارە دێمەوە (کاتە: گرێی ئاوەڵفرمانی کاتە)**

**- بۆ من هات. (لە پێناو - لأجل)**

ئامرازی ناو رستـەکانی سەرەوە، دەوری تەواوکەری ناڕاستـەوخۆیان داوەتە گرێکەیان، هەندێک جار بۆ شوێن و بۆ کات دیاریکردن، یا بۆ مەبەست و دەوری تر، پاشکۆیان بە دوادا دێت و پێکەوە دەوری گـرێ دروسـتکراوەکـەیان دیارو دەست نیشان دەکەن، وەک:

**بۆ شوێن - قوتابی لە دڵەوە مامۆستای خوشدەوێت. (لە - ەوە)**

**لەگەڵبوون - بە مامۆستاوە وەرن بۆ لام. (بە - وە)**

**شوێن - بۆ لاوە ئاوڕی دایەوە (بۆ - وە)**

بەم جۆرە دەبینین ئامراز رەوتی رستە دەگۆڕێت.

ئامرازیش لە رووی جۆری بەکارهێنان و نیـازو مـەبەسـتەوە دوو جۆرن، وەک:

١- ئامـرازی بەسـتنەوەو جـۆرەکـانی لە (ئامـرازی پێـوەندی، ئامـرازی لـێکدەری رستەی لێکدراو، ئامرازی گەیەنەری رستەی ئاڵۆز) (٥).

٢- ئامــرازی نیـــازو مــەبەست و جـۆرەکــانی، ئەم جـۆرە ئەگـەرچی، هەر جۆرێکیان بۆ مەبەستێکن، بۆ نموونە ئامرازی لێکچوون، یا بانگ کردن و وەڵام و خۆزگە بۆ لێکچوون و بانگ کردن و وەڵام و خۆزگەن ... تاد

بەڵام دەوری تریش دەبینن بۆ نموونە ئامرازی لێکچوون:

وەک: - مامۆستا وەک باوکە (بۆ لێکچوونی دووناوە)

**- وەک تۆ هاتیت من دانیشتبووم (ئامرازی گەیەنەرە)**

**- خۆزگە دەهات لەگەڵمدا. (بۆ خۆزگەیە دەوری ئامرازە)**

**- بە خۆزگە نابێت. ( بۆتە ناو)**

**- ئەگەر هاتیت پێت دەڵێم. (بۆتە گومان - ئامرازی گومانە)**

**- کاکە وەرە بۆ لام (ە: بۆ بانگ کردنی نێرە)**

**- پورێ وەرە لام (ێ: بۆ بانگ کردنی مێیە)**

کەواتە دەوری جۆر بەجۆر، یا بۆ مەبەستی جۆراو جۆرن. کە ئەمە تایبەتییەتی فرە ئەرکی ئامراز پێشان دەدەن، بە پێچەوانەی زیادەی وشە دارێژو جێناوو ئاوەڵفرمانەوە، جیاوازییەکی تری ئامرازو جۆرەکانی، هەر جۆرێکیان لەوانەی سەرەوە، واتە جۆرەکانی (١-٢) بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆ پێکدەهێنن، بەڵام پێشگرو پاشگر وا نییەو، لەناو بەشە ئاخاوتنی تردان و، ئاوەڵفرمان و جێناویش بە هەموو جۆرەکانیانەوە، هەر یەکەیان بەشی ئاخاوتن پێکدەهێنن، واتە هەموو جۆرەکانی ئاوەڵفرمان، یەک بەشی ئاخاوتن و جێناویش هەر هەموو بە شێکی ئاخاوتنن، بەڵام ئامراز چوار بابەتی جیاوازی بەشە ئاخاوتن پێکدەهێنن، وەک (ئامرازی پێوەندی، ئامرازی لێکدەر، ئامرازی گەیەنەر، ئامرازی نیازو مەبەست).

بابەتی (نیشانە)ش، پێویستە لەگەڵ ئامرازدا تێکەڵ نەکرێت، چونکە نیشانە هەر یەکەی واتە جۆرێکی بۆ یەک مەبەست بەکاردێن و، دەست نیشانی مەبەستێکی رێزمانی پێدەکرێت وەک: نیشانەی کۆ (ادات الجمع) کە (ان، ات، گەل، ها) بۆ کۆکردنەوەی ناوی تاک بۆ کۆن واتە تاک دەکەن بە کۆ:

**- مامۆستایان، پیاوان، کچان (ناوی +نیشانەی کۆ =ناوی کۆ)**

**- سەدەها، ساڵەها، رۆژەها، (ناوی کات + نیشانەی کۆ = ناوی کۆ)**

**- سەوزەوات، باخات، دێهات، ماڵات (ناو+ ات/ = ناوی کۆ)**

**- سەگەل، مێگەل، کورگەل (ناو+ نیشانەکۆ = ناوی کۆ)**

هەروەها (ەکە) ناسراوی وەک: مامۆستا+ ەکە= مامۆستاکە، (یەک / ێک)ی نەناسراوی وەک: مامۆستایەک، کوڕێک.

ناوی گشتیبیان کرد بە ناوی ناسراوو نەناسراو.

نیشانەی (دە)ی بەردەوامی، کاتی فرمانی رابردووی بەردەوام و رانەبردوو دروست دەکات وەک: نیشانەی کات + قەد + راناو= رابردووی بەردەوام

- دە + هات ـــــ دەهات، دەڕۆیشت، دەخست،

- نیشانەی بەردەوامی +رەگ + راناو= فرمانی رانەبردوو

- دە + چـ + م ------ دەچم، دەکەم، دەنووسم.

(بـ)ی (٦) نیشانەی داخوازی رەگی فرمان لەگەڵ راناوی لکاودا دەکات، بە فرمانی داخوازی: بـ + رەگ + راناوـــــــ بنووسە / بنووسن.

(وە)ی نیشانەی کاتی تەواو، رابردووی نزیک دەکات بەرابردووی تەواو: قەدی چاوگ (Steem) + راناو= هاتووە، خواردووە سوتاوە. کڕیوە.

نیشانەی (/)ی نادیاری کە فرمانی بکەر دیار (Passive) دەکات بە فرمانی بکەر نادیار بۆ رابردوو لەگەڵ نیشانەی (١).

(ێ) وەک: کوشتن: رەگ +نیشانەی نادیاری+ نیشانەی کات

کوژ + ر+ ا= کوژرا (بۆ رابردوو)

دە + کوژ + ر+ ێ= دەکوژرێ ( بۆ رانەبردوو)

هەروەها (ن) نیشانەی چاوگە وەک: نووسین، چوون، مردن، کردن، فڕین، کوشتن، کەوتن، کێلان، یا نیشانەی (تر) و (ترین) ئاوەڵناوی پلەی چەسپیو دەکەن بە ئاوەڵناوی پلەی بەراورد، وەک:

جوان + تر ــــــ جوانتر، بۆ پلەی باڵا: جوان + ترین ــــــ جوانترین.

(اندن) نیشانەی کردنە فرمانی تێنەپەڕە، لە دەنگە سرووشتییەکانەوە.

وەک: ناو + نیشانە کردنە فرمان = فرمانی تێنەپەڕ

قیرە + اندن ــــــ قیراندن

لە تێنەپەڕیشەوە، تێپەڕ دروست دەکات؛ وەک: سووتا + اندن ــــــ بە نەمانی (١) بزوێنێکیان دەبێتە: سووتاندن.

ئێستا دەرکەوت ئەم کەرەسە رێزمانیانەی سەرەوە، نابێت بە ئامراز دابنرێت، چونکە هەر بابەتێکی، بۆ یەک مەبەست دەست نیشان کراوە، واتە نیشانەی بابەتێکن و هەر نیشانەیەکیان بابەتەکەی پێ دەناسرێنەوە.

دواشت پێویستە ئامراز لە جێناو جودا بکەینەوە.

## جیاوازی ئامراز لەگەڵ جێناودا

جێناو ئامراز نییە، چونکە بابەتێکی سەربەخۆی سەر بەو وشانەن، کە ناون واتە لە بەکارهێناندا جێگای ناو دەگرنەوە و لە جیاتی ناو بەکاردێن و ئەرک و تایبەتێتی ناو وەردەگرێت، لە ئاخاوتن و بەکارهێناندا، هەندێک جێناو بەتایبەتی جێناوی (پرس) - interrogative بە هەڵە لەگەڵ بابەتی ئامرازدا تێکەڵ دەکرێت، یا باشتر بڵێین، دەدرێتە پاڵ بابەتی ئامراز و پێی و تراوە ئامرازی پرس، راستییەکەی ئەمە هەڵەیەکی باوە، نابێت جێناوی پرس، کە لە پرسکردندا بۆ پرسیار کردن، لەناو و جێناو بەکاردێن و، پرسیان پێ لە ناو دەکرێت (لەناوو جۆرەکانی) بکرێنە ئامراز، چونکە ئامراز، بابەتێکە لەگەڵ ناودا بەکاردێت و دەچێتە پاڵ ناوو کەرەسەی ترەوە بە هۆیانەوە دەوری خۆی دیاری دەکات، بەڵام جێناو یا جێناوی پرس، لە جیاتی ناو یا پرسی پێ لەناو دەکرێ و، ناوە لێ پرسراوەکەی دیارنییە، جێناو وەک (جێناوی کەس، جێناوی کەسی

لکاو، جێناوی پرس، جێناوی نیشانە، جێناوی خۆیی، جێناوی نادیار..... تاد).

ئەمجا جێناوی پرس یا جێناوی تر، هەر جۆرەی بۆ تاکە مەبەستێک، وەکو مەبەستەکانی سەرەوە بەکاردێن، بەڵام ئامراز هەر دانەیەکی، بۆ مەبەست و دەوری جیا جیان، نموونە بۆ جێناوی پرس:

**- کێ هات؟ زەردەشت هات.**

**- کوێ خۆشە؟ کوردستان خۆشە**

**- چی خۆشە؟ زمانی کوردی خۆشە**

**- بەکێت وت؟ بەرکاری ناڕاستەوخۆیە**

**- کێت دیت؟ ئاڤێستام دیت. (کێ: جێناوی پرسە - بەرکاری ڕاستەوخۆیە)**

**- بۆکێ یە؟ تەواوکەری ناڕاستەوخۆیە**

دوای ئەوەی جیاوازی نێوان بابەتی ئامراز، لەگەڵ بابەتی (زیادەی وشەدارێژو نیشانەو جێناو) خستە پێش چاو، پێویستە ئەوە لە بیرنەکەین، کە دەڵێین جێناو یەک ئەرک دەبینێت، مەبەستمان ئەوەیە جێناوەو بەس، واتە جێناو نابێتە کەرەسەیەکی تری ڕستە سازی، وەک ئەوەی جێناوی نیشانە، دەوری خۆی لە ڕستەدا بگۆڕێت و ببێتە جێناوی پرس، جێناوی خۆی یا جێناوی نادیار... یا ببێتە هەر کەرەسەیەکی تر.

لێرەدا ئەمە ئەوە ناگرێتەوە، کە جێناو، دەوری جیا جیای بەشە بنجێکانی ناورستە لە (بکەر، بەرکار، تەواوکەر بەراستەوخۆو نارستەخۆیەوە) دەبینن، چونکە لەو دەورانەشیاندا هەر جێگای ناویان گرتۆتەوە، کە بۆ مەبەستە بنەڕەتەکەی خۆیان بەکارهاتوون کە جێناون، ئەمجا بۆ کەس بێت، یا بۆ پرس یانیشانە... بن بەڵام ئامراز دەورو مەبەستی جیاواز دەبینن(٧).

بەڵام ئامراز وەک کەرەسەیەک لەناو وشە سازیدا، بۆ مەبەستی ئامرازی

پێـوەندی دانراوە، دەوری خـۆی دەگۆڕێت و دەبێـتـە پاشگرو پێـشگر- لەسـەرەوە نیـشانماندا- یا ئامرازی خۆزگە دەبێتە ناو، یا ئامرازی گومانی (ئەگەر) دەبێـتە ئامـرازی مـەرج یا ئامـرازی لـێکچـوون، دەبێـتـە ئامـرازی گـەیەنەر یا هەندێک ئامـرازی پێـوەندی وەک (تا، و، ش/یش....) دەبنە ئامـرازی لێکدەر یا دەبنە ئامـرازی گـەیەنەر، وەک (تا- تاکـو) یا ئامـرازی سـەرسـوڕمـان، دەبنە ئامـرازی بانـگ کـردن و ئاگـاداری، یا ئامـرازی ئاگـاداری دەبێـتـە ئەو جـۆرانەی وەک سەرسوڕمان.

نموونە:

ئامرازی پێوەندی دەبێتە ئامرازی لێکدەر:

- من و تۆ هاتین: من هاتم و رۆیشتم

ئامرازی پێوەندی دەبێتە ئامرازی گەیەنەر.

- ترێ تا پاییز دەمێنێت ــــــ تا تۆ دێیت من دەڕۆم.

ئامرازی بانگ کردن ــــــ ئامرازی وەڵام:

- هۆ زاگرۆس وەرە بۆ ئێرە ــــــ هۆ بەڵێ.

ئامرازی وەڵام ــــــ دەبێتە جێناوی پرس:

- ئەرێ ئەرێ وایە. ئەرێ هات؟

- ئای وا نابێت. (بۆ تەئکیدە)ــــــ ئای لە تۆ! (سەرسوڕمانە)

- بەشکو هات (ئامرازی گومانە)ــــــ بە بەشکوی تۆ نابێت (ناوە)

- وەک تـۆم بینـی، ئاراس هـات (ئامـــرازی گـــەیەنەرە) - تـۆ وەک من (لێکچوونە)

- کە پارەت دا مەلا لە مزگەوت دەرەکەیت (کە: ئامرازی مەرجە)

- کە تۆ هاتیت من لەماڵ نەبووم (کە: ئامرازی گەیەنەری کاتە)

- ئەگـەر پارەت دا مـەلا لە مزگـەوت دەرەکەیت (ئەگـەر: ئامرازی گـەیەنەری

مەرجە)

لێرەدا (ئەگەر) وەک ئامرازی گومان بەپێی یاسای چوونە ناویەک (overlap- التداخل)ی زانستی زمان (Linguistic) لەناو هەمان شوێنی رستەدا هەمان واتای ئامرازی (کە)ی گەیەنەری رستەی ئاڵۆزی دیوە کە (بۆ مەرجە) (٨).

هەروەها ئامراز دەتوانێت شوێنی ئامرازی تری ناو رستە بگرێت و، مەبەستەکەی بە پێچەوانەی یاساکەی سەرەوە دەگۆڕێت و، شوێنی دەگرێت نموونە، ئامرازی (بۆ) شوێنی (تا) دەگرێت و بە پێچەوانەوە:

- تا کەرکووک دەچم. (تا: کۆتایی شوێنی روودانە)
- بۆ کەرکووک دەچم. (بۆ: بەرەو - اتجاه)
- بە کەرکووکدا دەچم. (بە: سمین (إختراق و دیاریکردنیْ)

ئەمەی سەرەوە بریتییە لە یاسای گۆڕینی رێزمانی گوێزانەوە (Transformation)، کە یاسای گۆڕینی کەرەسەیەک بە کەرەسەیەکی ترو، دەوری تەواوکەری ناڕاستەوخۆی فرمانن بۆ شوێن، کە کەرەسەی گرێی ئاوەڵفرمانی شوێنییە.

دیاردەیەکی تری هەندێک لەم ئامرازانە، کە ئەگەر بێتو سەیری پێکهاتنی رستەیەکی یەک شێوەیی (فۆرم Form) بکەیت و ئەو رستەیە دوو واتای گەیاند ئەوا ئەم رستەیە یەک شێوەو دوو واتا دەگرێتە خۆی

- تا گرتی ـــــــ تا گرتی (تا: ئامرازی پێوەندی بۆ کات)
- تا گرتمی ـــــــ تا گرتمی.

تا کوشتویتی ـــــــ تا کوشتویتی / تا: لە هەموویاندا لەریزی دووەم ئامرازە بۆ روودانی کاتی فرمانە.

تا سووتاندمی ـــــ تا سووتاندمی.

(تا)ی ڕستەکانی بەشی یەکەم واتای نەخۆشی (تا) دەگەیەنێت و لە ڕستەی دووەمدا وەک ئامرازێک، کاتی ڕوودانی فرمانەکانی دیاری کردووە.

ڕستەکانی ڕیزی یەکەم سەر بە زانستی سیمانتیکن (Semantic)، واتە واتاناسی وشەکانی سەرەوە (تا) وشەیەک و دوو مەبەست پێشان دەدات سەر بە فرەواتان (Polysmy)، کە دەبێتە هۆی دیاردەی تەم ومژی لە زمانداو، بە هۆی پەیوەندی وشەکانی دەورو بەرییەرە (٩) لە یەکتر جیا دەکرێنەوەو، واتاکان ڕووندەکرێنەوە، ئەمەش بریتییە لەشی کردنەوەی بناخەی ناوەوەی ناو ڕستە (البنية العميقة Deep Structure).

بە کورتی و لە کۆتاییدا، ئەوە ڕوون دەبێتەوە، کە ئامراز بابەتێکی فرە ئەرکەو، لە شوێنی جیاوازدا دەرەکەوێت و ئەرکی ناو ڕستەی دەگۆڕێت، بەڵام زیادەی وشە داڕێژ و، نیشانەو جێناو، لەناو شوێنی جیاوازی ڕستەشدا، نابنە کەرەسەی ترو هەر بە زیادەی پێشگرو پاشگر و نیشانەو جێناو دەمێننەوە.. ❖

## پەراوێز:

(١) ڕەفیق محەمەد شوانی، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دوکتۆرا، کۆلێجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا، ١٩٩٧، ل

(٢) ڕەفیق شوانی، دیاریکردنی ئامراز لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری (الاستاذ)، ژ:١١، گۆڤاری کۆلیجی پەروەردەی یەکەم/ زانکۆی بەغدا،١٩٩٨-ل٥٤٤-٥٧١.

(٣) ڕەفیق شوانی، هەمان سەرچاوەی ژمارە (٢)، ل ٦٤.

(٤) محەمەد ڕەزای باتینی، ئاوڕێکی تازە بۆسەر ڕێزمان، وەرگێڕانی حەسەنی قازی، بنکەی ئازاد، سوێد، ١٩٩٣، ل ١١٤.

(٥) ڕەفیق شوانی، نامەی دوکتۆرا، ل ٣٥، ٣٦.

(٦) ڕەفیق محەمەد محێدین، دەوری مۆرفیمی (ب) لە رووی مۆرفۆلۆژییەوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٨)ی ١٩٩٦، ل ٢٢ - ٢٥.

(٧) ا- ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٦،ل٣٣٦.

ب- کوردۆییف، ڕێزمانی کوردی، وەرگێڕانی د. کوردستان موکریانی، هەولێر، ١٩٨٢ ل ٣٤٨ - ٣٦٤.

(٨) ڕەفیق شوانی، نامەی دوکتۆرا، ل ١١٨، ١٣٢.

(٩) ا- ڕەفیق محەمەد محێدین، دەوری (تا) لە زمانی کوردیدا، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٣٥)، ١٩٩٥، ل ٦٣- ٦٩.

ب- وریا عومەر ئەمین، بنج و سیماو یاساکانی گوێزانەوە، ڕۆشنبیری نوێ (١١٥)، ل ٧٢ - ٧٥.

## سەرچاوەکان:


(١) رەفیق محەمەد محێدین، دەوری (تا) لە زمانی کوردیدا، رۆشنبیری نوێ، ژ (١٣٥)ی ١٩٩٥، ل ٦٣ - ٦٩.

(٢) رەفیق محەمەدمحێدین، دەوری مۆرفیمی (ب) لە رووی مۆرفۆلۆژییەوە، رۆشنبیری نوێ، (١٣٨)، ١٩٩٦، ل ٢٢ - ٢٥.

(٣) رەفیق محەمەد محێدین، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا، کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا، ١٩٩٧.

(٤) رەفیق شوانی، دیاری کردنی ئامراز لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری الاستاذ- ژ: ١١، بغداد ١٩٩٨، ل ٥٤٤ - ٥٧١.

(٥) رێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٦.

(٦) کوردۆییف، رێزمانی کوردی، وەرگێڕانی د. ک موکریانی، ١٩٨٢.

(٧) محەمەد رەزای باتینی، ئاوڕێکی تازە بۆ سەر رێزمان، وەرگێڕ حەسەنی قازی، سوێد ١٩٩٣.

(٨) وریا عومەر ئەمین، بنج و سیما و یاساکانی گوێزانەوە، رۆشنبیری نوێ (١١٥)، ل ٧٢ - ٧٥.

(٩) نعوم چومسکی، البنى النحوية ترجمة یۆئیل یوسف عزیز، بغداد ١٩٨٧.

# مۆرفیمی (ە) و
# شێوە جیاجیاکانی لە رستەدا

زمانەوانانی کورد لە بارەی (ە)ەوە دواون، بەتایبەتی لەو رووەوەی، کە لە رستەی بێ فرماندا دەوری فرمان دەبینێت و، (ە) بە فرمانی کاتی ئێستا دادەنێن و، دەیبەنەوە سەر (هەیە) و بناغەکەیان کە (بوون)ە. راستییەکەی زمانەوانانی کورد، لەم رووەوە دەبنە دوو بەش لەباسکردنی (ە)ی کۆتایی رستەدا، بەشێکیان کە زۆربەی زمانەوانی کورد پێک دەهێنێت لەسەر ئەوەن کە ئەم (ە)یە فرمانە و لە رووی کاتەوە بۆ دەمی (تاف- کات) ئێستایە، ئێمە لە خوارەوە بیرو بۆچوونی هەردوو لا دەخەینەڕوو، بێجگە لەوەی دەستەی دووەمی زمانەوانان ئەم (ە)یە بە راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک دادەنێن.

مامۆستا سەعید سدقی، لە لاپەڕە (٦٥)ی ڕێزمانەکەیدا، (ە) بە «حرف اضلا» لە رستەی: وەرە دەرەوە، کەوەر بکرە» دادەنێت، بێ ئەوەی جیاوازی لە نێوان جۆرەکانی (ە)ی ئەو دوو رستەیە بکات و، هەر هەموویانی، وەک پیتێکی رێنووس داناوە، لە رستەی «احمد عاقلە، علی زیرەکە» بە پیتی «رابطە لە بین مبتدأ وخبراو بە آخر حرف خبرەوە دەنووسی» (١) راستییەکەی ئەم (ە)یانەی ئەو رستانەی سەرەوە، لە نێوان پیت و جێناوی کەسی لکاوو، ئەم

(ە)یەی کە دەحکەی لەسەرەو بەزۆری نووسەران بە فرمانی ئێستای دادەنێن.

مامۆستایان نووری عەلی ئەمین و سادق بەهادین، بە فرمانی یاریدەری دادەنێن (٢) و، یەکەمیان بەلایەوە رستە لە زمانی کوردیدا بەبێ فرمان نابێت و، لە ڕێژەی کەسی سێیەمدا بەدەردەکەوێت. دکتۆر نەسرین فەخری لە لاپەڕە (٣١٦) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردیدا بەلایەوە (ە)، گەلێک شتە لە زماندا، وەک پاشگرو لەناو (فعلی إنتقالی دا و، هەندێک جاریش فعلی مساعدە.)، مامۆستا مەسعوود محەمەدیش لەگەلێک شوێنی بەرهەمەکانی باسی کردووەو، (ە) بە ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک داوەتە قەڵەم (٣) و، بەلایەوە رستەی بێ فرمانیش هەیە، واتە رستەی ناوی، لەم رووەوە بیروڕای مامۆستایان صالح حوسێن پشدەری و د. ئەورەحمانی حاجی مارف هەمان شتەو لەگەڵ مامۆستا مەسعود محەمەد یەک دەگرنەوە. (٤)

دوکتۆر شێرکۆ بابانیش لە وتارێکیدا (ە)، بە مۆرفیمی کاتی ئێستای داناوەو، لەگەڵ هەندێ نیشانەی کاتی وەک رابردووی تەواوی [ووە/وە] و، لەگەڵ جێناوی کەسی سێیەمی تاکی لکاوی (ە)دا تێکەڵ کردووەو، چۆنیەتی دەربڕینی بیروڕاکانی (مطلقە)ە، کە لە زانستدا ئەمە بە کارێکی نابەجێ دادەنرێت و (مطلق)، لە زانستدا نییە و ئەگەر بۆچوونێکی هەڵەش بێت، دەرگا بۆ باسی تر دەکاتەوەو، نابێت دەرگا لەسەر ئەم و ئەو بەتایبەتی بۆ لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی کوردی تازەخزمەتکراو دابخەین، و باسەکەی دەکات بەدیاری و لەلایەکی ترەوە، واباس دەکات، کە باسەکەی کۆکردنەوەیە، ئیتر چۆن، شتی ئەم و ئەو دەکرێت بەدیاری! و لە زۆربەی شوێنی وتارەکەیدا، بە تەواوی (مطلق)انە قسە دەکات (٥) و بۆشایی بۆ کەس و لێکۆڵینەوەی تر جێنەهێشتووە.

من لەم لێکۆڵینەوەیەدا، هەوڵ دەدەم (ە)ی کۆتایی رستەی بێ فرمان و جۆرەکانی دیارو دەست نیشان بکەم و، جۆرەکانی تری (ە) لەناو رستەسازیدا

بخەمە پێش چاو، کە جیاوازن لە (ە)ی کۆتایی رستە.

مۆرفیمی (ە) لە رستەی زمانی کوردیدا لە ناوەڕاست و کۆتایی رستەوە دێت و، هی ناوەندی رستەکانیش، هەموویان یەک جۆرنین، لێرەدا ئێمە دەمانەوێت، یەکە یەکەی ئەم مۆرفیمە لە شوێن و دۆخە جیاجیاکانیدا پیشان بدەین و، لەیەکتریان جیابکەینەوە.

(ە) وەک ئامرازی پێوەندی و بەستن و بەشەکانی رستە بەیەکترەوە، لە ناوو ئاوەڵناوو کەرەسەی تر دەبەستێتەوە، (٦) وەک:

- کتێبە مێژووە کوردییەکەم خوێندەوە.
- منداڵە هەژارە بێکەسەکەم دیت.

(ە) وەک پاشکۆی جێناوی نیشانە لە دوای وشە دەست نیشانکراوەکانەوە، لە رستەدا دەردەکەون و، ئەو وشانە دەگرنە نێوان خۆیانەوە، واتە نێوان جێناوی نیشانەو پاشکۆکەیەوە، بەم شێوەیە [ئەم/ ئەو ـــــــ ە]، نموونە:

- ئەم منداڵە زیرەکە. [جێناوی نیشانە+ ناو+ ئامرازی پێوەندی + ئاوەڵناو+ پاشکۆی جێناوەکە]
- ئەو گوڵە سوورە.

(ە)ی یەکەمی ئەو دوو رستەیە، ئامرازی پێوەندییە، چونکە دوو وشەیان بە یەکترەوە بەستۆتەوە، وەک (منداڵ، زیرەک)، بەڵام (ە)ی کۆتایی رستەکان پاشکۆی جێناوی نیشانەی (ئەم- ئەو)ن و لە هەمان کاتدا رستەیەکی هەیی دروست کردووە، [هەیی- تملک Possessive] کە بێ کاتەو ئەم جۆرە رستانە کات و رووداني مەرجی فرمانیان تێدا نییە و، دیاردەیەکی (مطلق) باس دەکەن- لە شوێنێکی تری ئەم باسە ئەمە روون دەکەینەوە. هەر لە رستەکانی سەرەوەدا، بەپێی یاسای لادان (حذف) لە رێزمانی گوێزانەوەدا (القواعد التمویلي- Transformation)، ئەگەر ناوەکانی دوای جێناوە نیشانەکان

لابا ین، جێناوەکان دەچنەوە دۆخی بنەڕەتی خۆیان، کە بریتین لە (ئەمە، ئەوە – ئە...انە، ئەوانە) و (ە)ی دوای خۆیان وەک جێگر شوێنی ناوە لادراوەکە (...حذوف) دەگرێتەوە، نموونە:

ئەمە کوردە. بە لادانی (ە)ی (ئەم) ــــ ئەم کوردە. ناتەواوە. ــــ ئەم کوڕە کوردە.

ئەمە زیرەکە. [واتە (ە)ی یەکەم جێگری ناوە لادراوەکەیە، بۆتە جێناو)

بەم شێوەیە [جێناوی نیشانە+ جێناوی جێگر+ ئاوەڵناو+ پاشکۆ لە هەمان کاتدا جێناوە] ئەگەر هەمان ئەم ڕستانە بکرێنە کۆ، بە تەواوی ئەو دیاردەیە ڕوون دەبێتەوە،

وەک: ئەمان منداڵی زیرەکن. ئەگەر ناوەکە لادرا دەبێتە: ئەمان/ ئەمانە زیرەکن.

لێرەدا دوو شت دەرکەوت یەکەمیان کە (ە) و (ان) جێگری ناوە لادراوەکەن و، پاشان (ە)ی ئامرازی پێوەندی ناوەندی ڕستەکان بووە (ی)، ئیسپاتی دەکات کە (ە)ی ناوەند، پاشکۆی جێناوی نیشانە نین و ئامرازی پێوەندین کە (ی)ن، بەڵام (ە)ی کۆتایی ڕستەکەکان پاشکۆن و، ڕستەی (هەیی دروست دەکەن و (ن) کۆتایی ڕستەکە جێگری (ان) نیشانەی کۆی کەسن و، بەپێی یاسای ڕێکەوتن (agreement) نیهاد و گوزارە لە تاک و کۆدا وەک یەکن، لە لایەکی ترەوە، ئەو (ن)ی کۆی کۆتاییە ئەوە دەگەیەنێت، کە (ە) فرمانی کاتی ئێستا نییە و باسی دیاردەیەکی (مطلق) دەکات و کات و ڕووداویان تێدا نییە کە لەگەڵ کەسدا بەتایبەتێتی فرمان دادەنرێن.

**(ە)ی ئامرازی بانگ کردن**

ئەم ئامرازە لە کوردیدا، بۆ مەبەستی بانگ کردن و ئاگادار کردنەوەی(٧) تاک بەکاردێت، بۆ ڕەگەزی نێرینەو لە هەمان کاتدا، ڕستەش دروست دەکات:

کاکە، خاڵە، مامە ـــــ ئەرێ کاکە، باشە کاکە.

**(ە)ی ئامرازی وەڵام**

ـ ئەم جۆرە (ە)یە، کە وەڵام دەگەیەنێت بۆ رستەش دەور دەبینێت بە تایبەتی ئەگەر بکەونە ناو رستەی وەڵامەوە یا وەک وشەیەک وەڵام ببەخشێت.

نموونە: - بەڵێ باشە، باشە

- چاکە، وایە ـــــ بەڵێ وایە

- خراپە، راستە

ئەم دوو دیاردەیەی (ە)ی ئامرازی بانگ کردن و، وەڵام لە بنەڕەتدا، جێناوی کەسی لکاوە بۆ سێیەمی تاک، چونکە راستییەکەی وەڵامی کەسێک یا یەکێک بەرامبەر بەکەسێکی تر پێکدێن، کە لە دەمە تەقێ دابن و، دیاردەکەی کە دەبێتە وەڵامی نێوانیان کەس و حاڵەت پێکدێن کە پلەی سێیەمی ئەو ئاخاوتنەن، لە گەردان کردنیشدا بۆ کەسەکان ئەمە بە دەردەکەوێت:

بەڵێ باشم- ین چاکم چاکین

بەڵێ باشین- ن چاکیت چاکن

بەڵێ باشە- ن چاکە چاکن

ئەم دیاردەیەی سەرەوە بەهێزی راناوی لکاو دەرەخات، لە رستە پێکهاتندا ئەگەر بەراوردیان بکەیت، وەک ئەو فرمانانەن کە لە شێوەی وشەن و، رستەش پێک دەهێنن بەتایبەتی لە فرمانی رابردووی تێنەپەڕی کەسی سێیەمی تاکدا وەک: (هات، رۆیشت، کەوت) جیاوازی نێوانیان تەنیا ئەوەیە دیاردەی یەکەم بێ کات و رووداون.

## (ە)ی ئامرازی پێوەندی بە هۆی جێگیرکردنەوە

(ە) لە رستە سازیدا بێجگە لە شوێنەکانی سەرەوە، لە ئەنجامی جێگیرکردنی ئامرازی پێوەندی (بۆ،بە)ش، لەگەڵ فرمانی (انتقالیدا) دەردەکەوێت، وەک:

من چووم بۆ بازاڕ ـــــ من چوومە بازاڕ

پارەکەی دا بە زاگرۆس ـــــ پارەکەی دایە زاگرۆس.

## (ە) رستەی هەیی (تملک) دروست دەکات

لەو رستـانەی کـەلە بنەڕەتدا، لە شـێـوەی وشـەی لێکدراوو گـرێن، کـە لە ناوەڕاستـەوە کۆمەڵەی یەکەمی راناوە لکاوەکانی (م، ی، ت، مان، تان، یان) وەردەگرن، (ە) لە کۆتایی ئەو شێوانەوە دەردەکەوێت و، رستـەی ناوی دروست دەکات، کە کـات و روودانیـان تێـدا نییـەو، تێکڕای رستـەکـە لە رووی واتاوە هەیی (تملک) دەبەخـشـێت و، دیاردەیەکی (مطلق) باس دەکـات و، بەهۆی ئەم (ە)ی بێ کاتەوە دروست دەبێت و، باسی دیاردەیە کە وەک:

سەر بەرز، گوڵی جوان، چاو ڕەش: بەهۆی گەردانەوە دەبنە رستەی هەیی:

سەرم بەرزە. سەرمان بەرزە.

سەرت بەرزە. سەرتان بەرزە.

سەری بەرزە. سەریان بەرزە.

ئەم دیاردەیەی راناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی یەکەم هەمان شێوەی ئەو فرمانە تێپـەڕانەیە، کە بەرکارەکـانیـان لەگەڵدا بێت، راناوە لکاوەکانیـان لە ناوەندەوە دەچێتە سەر و سەلماندنی ئەم دیاردەیە بەوە دەسەلمێنرێت کە (هەبوون) و (بوون) وەک تێـپـەڕ تەواوکـەر وەردەگـرێت وەک لە سـەرەوە پیـشـانمان دان، بڕوانە، ئەم دۆخەی تێپەڕ:

نان خواردن گرێیە ـــــ کە بووە رستە لەگەڵ راناوەکانیدا بەم شێوەیەی

خوارەوە گەردان دەکرێت:

نانم خوارد نانمان خوارد دڵم پاکە دڵمان پاکە
نانت خوارد نانتان خوارد دڵت پاکە دڵتان پاکە
نانی خوارد نانیان خوارد دڵی پاکە دڵیان پاکە

دیاردەی ئەم رستانەی (ە)، شتێکی مطلق و هەمیشەیی باس دەکات پێوەند نییە بەکاتەوە و، هیچ روودانێکی تێدا رووی(٨) نەداوە لە وێنەی کردەوەی (رۆیشتن، چوون، خواردن، سووتان)، واتە کە کاری (رۆیشتی، چووە، خواردت)ی نەکردووە بەکاتەوە بەسترابێت تەنیا کەس و حاڵەت نەبێت.

## (ە)ی کۆمەڵەی دووەمی راناوە لکاوەکان

کۆمەڵەی دوومی راناوە لکاوەکان، کە بریتین لە (م، یت، ە، ین، ن، ن) بەزۆری لە زمانی کوردیدا لەگەڵ وشەی واتا داری ناو، ئاوەڵناو، جێناو، ئاوەڵفرمان، ژمارە، بێجگە لە فرمان رستە دروست دەکەن، کەچی ئەم دیاردەیە، لەگەڵ راناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی یەکەمدا، فرمانی لێ دەرچێت، نابینرێت رستە دروست بکەن، تەنیا هەیی (تملک) دەبەخشن، نموونە بۆ کۆمەڵەی دووەمی راناوە لکاوەکان کە رستە دروست دەکەن:

کوردم کوردین
کوردیت کوردن لەگەڵ ناو دایە
کوردە کوردن
منم ئێمەین
تۆیت ئێوەن لەگەڵ جێناوی کەسی سەر بەخۆدا
ئەوە ئەوانن
جوانم جوانین

جوانیت   جوانن   لەگەڵ ئاوەڵناودا

جوانە   جوانن

لارم   لارین   زۆرم   ین

لاریت   لارن   زۆریت   ن   لەگەڵ ئاوەڵفرمان و

لارە   لارن   زۆرە   ن   رادە

یەکم   یەکین   دووەمم   دووەمین

یەکیت   یەکن   دووەمیت   دووەمن   لەگەڵ ژمارەدا

یەکە   یەکن   دووەمە   دووەمن

گومان نییە نموونەکانی سەرەوە رستەن و بێ کات و بێ روودانن، چونکە ئەوانە دیاردەیەکی (مطلق)و بێ رووداون، بێ کاتن و هیچ رووداوێک تێیاندا رووی نەداوە، لە کاتێکی دیاری کراودا، ئەمە بێجگە لەوەی کە ئەگەر (٥) بە فرمانی کاتی ئێستا دابنرێت، لە رستەکانی ریزی سێیەمدا، کە بۆ راناوی کەسی سەربەخۆی (ئەو)ن، ئەی چی لە کەسەکانی تری ئەو رستانە دەکەیت، کە بوونی راناوەکانیان وەک (م، یت، ین، ن...) تێیاندا ئاشکراو بێ گومانن، ئەگەر چی دەبێت ئەوەش بزانین، کە راناوە لکاوەکان لە دروست کردنی رستەدا، زۆر چالاک و بەهێزن، تەنانەت رستەی فرمانداریش، بەبێ ئەوان دروست نابێت و کەسی و کاتیان بەبێ راناوە لکاوەکان تێیدا دیار نییە و، تەنانەت واتاش وەک فرمان روون نییە، ئەوانەیان نەبێت کە فرمانی رابردووی تێنەپەڕن بۆ کەسی سێیەمی تاک، ئەویش لەبەر ئەوەیە راناوی لکاوی ئەو جۆرە فرمانە، لەو حاڵەتەدا دەرناکەوێت بۆیە کات و روودانی تێدایە.

با سەیری فرمانی تێپەڕی دەمی رابردوو بکەین، بەبێ فرمان: کە هیچ وشەیەکی لەگەڵدا نەبێت:

کێلا، کرد، ئەوانەش نەبێت، کە نیشانەی چاوگە کەیان بە (ی) کۆتایی

دێت، کە لەگەڵ راناوی لکاوی (ی) کەسی سێیەمی تاکدا، تێکەڵ دەبن و هەمان شێوەن بۆیە واتاو کات و رووداان دەبەخشن، ئەگینا فرمان نین، بەڵام کەوتیت (کێلای، کردی، بردم، بردت، بردمان، بردتان...) واتایان لەگەڵ کات و رووداوەکەیدا ئاشکرا دەبێت، ئەوانەش دەڵێن هەیەتی، سەلیقەی ئێمەرووانی واتای وشەی زمانەکە وایان لێ دەکات بڵێین ئەو فرمانانەی سەرەوە، بەهۆی راناوی لکاو، کات و رووداو دەبەخشن(٩)و دەبنە فرمان.

با کۆمەڵەی دووەمی راناوە لکاوەکان، کە بۆ فرمانی تێپەڕو هەیی بکاردێن بزانین لەگەڵ وشەی نا فرماندا رستە دروست دەکەن یان نا نموونە:

م: کەرکووکم کەرکووکمان/مان کەرکووکیم/م

ت: کەرکووکت کەرکووکتان/تان بۆ هەیین کەرکووکیت/یت رستەن

ی: کەرکووکی کەرکووکیان/یان کەرکووکییە/ە

ئەم نموونانەی سەرەوە ئاشکرا دیارە، رستە نین و گرێی هەییان پێکهێناوە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە کۆمەڵەی یەکەم، بێ فرمانیش وەک لە سەرەوە پیشانمان دان، لەگەڵ زۆربەی بەشەکانی ئاخاوتندا، رستەی بێ فرمانیان پێک هێنا، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت، کە (ە)ی راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک، لە کۆمەڵەی یەکەمدا، لەو شوێنەی وەک (ئەو مرۆڤە، ئەو قوتابییە) فرمانی کاتی ئێستا نین و راناون و دەچێتە سەر زۆربەی بەشەکانی ئاخاوتن. (١٠)

## (ە)ی وەک راناوی لکاو لەگەڵ وشەی لێکدراوو گرێدا:

ئەگەر وشەی لێکدراو یا گرێ، لەو جۆرانەی کە (ە)ی هەیی چووە سەریان و رستەیان پێک هێناو، وەک لە سەرەوە خستمانە روو، لێرەدا ئەگەر راناوی کۆمەڵەی دووەم بچێتە سەریان رستە پێک دەهێنن، وەک:

- سەر بەرزم سەر بەرزین.

- سەر بەرزیت      سەر بەرزن.

- سەر بەرزە        سەر بەرزن.

لێرە دەرکەوت لەم رستانەی سەرەوە (ە)ی راناوی لکاوی کۆمەڵەی دووەم، کە بریتین لە (م، یت، ە، ین، ن، ن) رستە دروست دەکەن و (ە)ش راناوە، نەک مۆرفیمی کاتی ئێستا (فرمانی بێهێز، فرمانی ناتەواو، فرمانی یاریدەر)، ئەمە بێجگە لەوەی لەو رستانەدا، بەهیچ جۆرێک کات و روودانیان تێدا نییەو، رستەی ناوییان پێک هێناوەو راناوەکان بەهیچ جۆرێک لە ژێرەوە ئاوێتەی مۆرفیمی کاتی ئێستا نەبوونە و، جارێکی تر ئەوە دەهێنینەوە یاد کە فرمان خۆشی بە تەنیا ناتوانێت بەبێ راناوی لکاو دروست ببێت و، کات و روودان ببەخشێت، ئەمەمان لەمەو پێشەوە روونکردەوە.

ئەگەر (ە)ی رستەی (سەر بەرزە) کات بێت، دەبێت راناوی (م،یت، ین، ن،)یش کاتی ئێستا بن و فرمان بن، لە کاتێکدا پێویستە فرمان، لە رەگی چاوگەوە وەربگیرێت یا بڵێین لە مۆرفیمی بناغەییەوە، ئەم دۆخەو حاڵەتەش لە رستەکانی سەرەوەی کۆمەڵەی دووەمی راناوە لکاوەکانەوە بەدی ناکرێت کە رەگیان هەبێت لەم رووەوە، (ە)ش رەگی (بوون) و (هەبوون) نییەو راناوی لکاوەو ئاوێتەی کات نەبوونە لەگەڵ کەسەکانی تریشدا.

## (ە)ی راناوی لکاوی فرمانی داخوازی:

(ە)ی راناوی کەسی، لە گەردانی کردنی فرمانی داخوازیشدا، بۆ کەسی دووەم بەدی دەکرێت و دەکەوێتە کۆتایی رەگی فرمانەکەوە کە بریتییە لە: پێشگری داخوازی+ رەگ+ راناوی کەسی دووەمی تاک/ یان کۆ: ب+ نووس + ە= بنووسە/ بنووسن

ئەگەر رەگی فرمانەکەش، بە بزوێن کۆتایی هاتبێت، ئەوا (ە) تووشی توانەوە

دەبێت، یا یەکێکیان دەمێنێ وەک: بکە.

لەم نموونەیەشدا (ە) نیشانەی کاتی ئێستا نییە و بەرامبەرەکەی لە کۆدا دەبێتە (ن)ی کەسی دووەم، ئەگەر (ە)کات پیشان بدات دەبێت (ن)ەکەش هەمان شت بێت، بەلاّم راناوی کەسیین.

بە هەمان شێوەی (ە)ی راناوی لکاوی فرمانی داخوازی (ە) بە تەنیا لە فرمانی رابردووی تەواو، کە بریتییە لە (ووە/وە)، هەروەها (ە)ی سەر بەمۆرفیمی {ایە}ی نیشانەی کاتی فرمانی ئیلزامی نابێت، بە هەڵە تێکەڵ بکرێت، چونکە یەکەمیان راناوی لکاوی داخوازییەو، دووەم وسێیەم نیشانەی کاتن و، ناتوانرێت بە هیچ شێوەیەک (ە)کە، لەو دوو جۆرە کاتە، بە تەنیا دابماڵرێت، تەنیا لە گەردان کردندا نەبێت کە راناوە لکاوەکان دەکەونە ناوەڕاستەوە بەم شێوە:

هاتووە ـــــ هاتوومە – هاتووینە

هاتوویتە هاتوونە

هاتووە هاتوونە

لە ئیلزامیشدا دیسان ناتوانرێت (ە)، لە [ایە] دابماڵرێت و، بوترێت (ە) نیشانەو مۆرفیمی کاتی ئێستایە، چونکە ئەم دوو نیشانەیە، بریتین لە [ووە/وە]، [ایە] نەک (٥)، ئەگەڵ فرمانەکەشدا نەبن، ناتوانن کات ببەخشن و، لە فرمانێکیشدا دووکات پێکەوە کۆنابنەوە، وەک رابردووی تەواو+ کاتی ئێستا، چونکە لە رابردوودا، رووداوەکە رووی داوەو تەواویش بووە، ئیتر ئەم کاتی ئێستایە، لە کوێوە هات و قۆزرایەوە، با بڕوانینە ئەم رستەیە:

– زاگرۆس ئیشەکەی تەواو کردووە.

– زەردەشت چەند جارێک هاتووە بۆ لامان.

بە هەمان شێوە ئەگەر بڕوانینە ئەم رستەیەی کە فرمانەکەی ئیلزامییە دەبینین

کاتەکەی رابردووەو کاتی ئێستای تێدا نییە، وەک:

ئەگەر کارەکەی بکردایە وانابوو.

## ئایا مۆرفیمی (ە)ی (هەیە) راناوە یا بۆکاتە

پێش ئەوەی هیچ بریارێک بدەین، پێویستە (هە) کە واتای «بوون» هەڵدەگرێت لەگەڵ کۆمەڵەی دووەمی راناوە کەسییە لکاوەکاندا گەردانی دەکەین بزانین چی روودەدات، ئایا کات و روودانی تێدایە با نموونە بهێنینەوە:

من هەم  م  هەین/ین

تۆ هەیت  یت  هەن/ن

ئەو هەیە  ە  هەن/ن

پێش هەموو شتێک فرمان، ئەوەیە لە گەردانکردندا رووداوێک لە لایەن، کەسێکەوە لە کاتێکی دیاری کراودا رابگەیەنێت، لەم رستانەی سەرەوە کات نییەو رووداو رووی نەداوە تەنیا ئەوە نەبێت، کە هەبوونی کەسێکە ئەو هەبوونە ئێستاو ئایندەو رابردووی تێدا بەدی ناکرێت، بۆیە (هە) فرمان نییە، شێوەکانی تریشی وەک (هەیە)، (هەن) هەمان شتەو وەک ئەوە وایە بڵێیت:

من قوتابیم ئەو قوتابییە، ئێمە قوتابین.

بۆیە ئەو رستانە بریتین لە: راناوی کەسی سەربەخۆ ئەرکی (نیهاد)ە و (هە) لەگەڵ راناوەکاندا گوزارە پێک دەهێنێت، ئەگەریش فرمان بێت چۆن دوو فرمان پێکەوە لە رستەیەکدا دەبن و فرمان لە شوێنی بکەر دەبێت.

بەڵام راستی مەسەلەکە، ئەوەیە رستەی فرماندارو رستەی بێ فرمان، بەبێ راناوی کەسی لکاو دروست نابن، واتە فرمان و گوزارە بەبێ راناوی کەسی لکاو، مەحاڵە ببنە فرمان و گوزارە، پاشان ئەگەر (ە) فرمان بێت ئەی چی لە راناوەکانی (م، یت، ...، ین، ن، ن) دەکەین دەبێت ئەوانیش فرمان بن، بەڵام

ئەوانە راناوی کەسی لکاون و زۆر چالاکن لە رستە دروستکردندا، تەنانەت فرمانی رانەبردوو، فرمانی داخوازی بەبێ راناو هەر دروست نابن و تەنیا رەگێکی بێ واتان وەک: نووسین: دە (نووس)، دە (کە)، دە (خۆ) مۆرفیمی بێ کەڵکن، بەڵام بەهۆی راناوەکانەوە دەبنە فرمان وەک: [دەنووسم، دەکەم، دەخۆم، بخۆ] راناوی فرمانی داخوازی، ئەگەر رەگەکەی کۆتایی بێت بە بزوێن ئەوا راناوەکەی کە (ە)یە تێدەچێت یا لەگەڵ بزوێنی (ە)دا یەکێکیان نامێنێت. وەک: بکە.

باشە ئەگەر (ە) کورتکراوەی فرمان و چاوگی (هەبوون) بێت ئەی بۆچی لەو مۆرفیمی (ە)یەی چاوگەکە دەمە جیاجیاکانی فرمان دروست نابن؟!. یان لەو رستانەی کە (ە)دەکەنە فرمان وەک لە رستەی [هەیە، نییە، چییە، کامەیە] کوا کات؟ رووداوەکانیان وەک رووداوی فرمانی بەهێز لە روودانی: [کڕین، فرۆشتن، چوون، کردن، نووستن، خەوتن....]؟ هەروەها کاتیشیان تێدا نییە، ئەمە بێجگە لەوەی ئەو گوزارانە کەسەکانی سێیەمی تاکن و بریتین لە راناوی (ە)ی تاک و لە گەردانکردندا دەبنە:

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| نیم | نیین | چیم | چین | کامەم | کامەین |
| نیت | نین | چیت | چین | کامەیت | کامەن |
| نییە | نین | چییە | چین | کامەی | کامەن |

دەبینین (ە) لەناو ئەو نموونانەدا، لە کەسی سێیەمدان و وەک کەسەکانی تر راناوی کەسین.

پاشان ئەگەر (هە) فرمان بێت، یا بەشێک بێت لە چاوگ و فرمانی [هەبوون، هەبوو] دەبێت بۆ هەموو دەمەکانی فرمان، لە رابردوو جۆرەکانی، رانەبردوو، داخوازی گەردان بکرێت، کەچی لە گەردان کردندا، بۆ دەمی رابردووی بەردەوام و رانەبردوو، داخوازی ئەو (هە)یەی لا دەچێت و ناتوانرێت لە گەڵیدا،

ئەو دەمـانەی بۆ گـەردان بکرێت، ئەمـە ئەوە دەگـەیەنێت، کـە [هە] وەک مۆرفیـمێک بۆ هەبوونە (تملک) و لە رانەبردوو و داخوازیدا دەگۆڕێت بە (دە)ی رانەبردوو، (ب)ی داخوازی، لە ناویشدا [نە]یە؛ وەک:

پارەم هەبوو ـــــ پارەم دەبوو پارەم نەبوو.

هەمبوو ـــــ دەمبوو

بارم هەڵگرت ـــــ هەڵم گرت

لەم نموونانەدا، بە ئاسانی دەردەکەوێت کە (هە) لە ڕووی واتاوە پێشگرە، بۆ [هەیی] وەک پێـشگرێک، چاوگ یا فـرمـانی دارێژراوی بۆ دەمی رابردوو لە چاوگی سادەی (بوون)ەوە دروست کـردووە، سەیر لەوە دایە، ئەم پێشگرە وەک مۆرفـیمێکی وشە دارێژ (derivational prefix) لە دەمەکانی رانەبردوو، داخوازی نامێنێت، لێرەوە شتێک سەر هەڵدەدات کە (هە) وەک نیشانەیەکی (هەیی) دەچێتە سەر بوون و لە کوردیدا، هەیی دەگەیەنێت وەک چۆن (دە) بۆ بەردەوامییـەو (ب) بۆ داخـوازییـە، بەڵام (هە) لێـرەدا دەردەکـەوێت، لە ڕووی واتاوە ناوی بنێین مـۆرفـیـمی یا پێـشگری (هە)ی هەیی، بۆ ئەوەی بە تەواو پیـشـانی بدەین (هە) دەگـۆڕێت بە (دە) لە رانـەبردووداو بە (نە)ش لـە دۆخی نەرێدا ئەم نموونانە گەردان دەکەین:

هەبوون:

من هەم ئێمە هەین

تۆ هەیت ئێوە هەن

ئەو هەیە ئەوان هەن

نەبوون:

من نیم ئێمە نین

تۆ نیت ئێوە نین

ئەو نییە    ئەوان نین

دەبم    دەبین

دەبیت    دەبن        رانەبردوو

دەبێت    دەبن

ئەگەر (هە) کاتدار بێت، وەک (دە)ی بەردەوامی هەر لەبەر ئەوەی چۆتە سەر فرمان، بەهەمان شێوە دەبێت بڵێین، ئاوەڵفرمانەکانی وەک (نە، نا، نی)یش فرمان بن چونکە بەڕیز (دەچنە سەر رابردووو وکاتی داخوازی نەرێ، رانەبردوو) بە هەڵەش ئەوە لاسایی کراوەتەوە کە (نی) بۆ نەرێکردنی (نەفی کردن)ی کاتی ئێستایە وەک لە نموونەکانی (نەڕۆیشت، نەکەی، ناچم، نییە) راستییەکەی ئەو ئاوەڵفرمانانە بێ کاتن بەڵام ئەوەی وایان لێ دەکات پەیوەند بن بەکاتەوە (قەد و رەگی فرمانەکانە)و (ە)ش لە رستەی (نییە) فرمان نییە بەڵکو بریتییە لە [ئاوەڵفرمانی نەفی+ نیمچە بزوێن+ راناوی لکاو= بەم شێوەیە: [نی+ی+ە] هەروەک پیشانمان دان بۆ کەسەکانی تر دەبێتە:

**روونکردنەوەی مۆرفیمی (ە) بەوەی راناوی لکاوە نەک فرمان**

| ژمارە | راناوی کەسی سەربەخۆ | ئاوەڵفرمانی نەرێ | راناوی کەسی لکاو | | تاک و کۆ راناوی لکاو |
|---|---|---|---|---|---|
| تاک | من<br>تۆ<br>ئەو | نی<br>نی<br>نی | م<br>یت<br>ـە | من نیم<br>تۆ نیت<br>ئەو نییە | م/ ین<br>یت/ ن<br>ە/ن |
| کۆ | ئێمە<br>ئێوە<br>ئەوان | نی<br>نی<br>نی | ین<br>ن<br>ن | ئێمە نین<br>ئێوە نین<br>ئەوان نین | |

**خشتەی ژمارە (٣)**

له سەرەوەش ئەو زیادانەی کە بەهۆی دەنگسازییەوە هاتوونەتە ناوەوە، وەک نیمچە بزوێنی (ی) لە (نییە) و، نەمانی دەنگی (ی) لە وشەی (نین)، چونکە هەردووکیان یەک دەنگن لەبەر ئەوە تووشی توانەوە بووە، ئیتر لە ناوو لەژێری ئەو راناوە لکاوانەوە هیچ شتێک وەک کەرەسەی رێزمانی خۆی حەشار نەداوە، ئەمە بێجگە لەوەی کە لەگەڵ (ناو، ئاوەڵناو، راناو، ئاوەڵفرمان) وەک لەمەو پێشەوە لەم وتارە خستمانە پێش چاو هەمان راناوەکانی (م، یت، ە، ین، ن، ن) دەردەکەونەوە.

دیاردەی بوونی مۆرفیمی (ە) لە کۆتایی رستەوە نابێت هەر لەگەڵ فرمان و ئەو دۆخانەی کە تێیدا دەردەکەون وەک رابردووی تەواو، فرمانی رابردووی ئیلزامی بخرێنە پێش چاو بەڵکو لەگەڵ بەشەکانی تری ئاخاوتنیشدا روونکردنەوەی پێویستە.

پاشان چی وادەکات، بەهەڵە راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک، کە دەچنە سەر فرمانی رابردووی تێنەپەڕ، لە گرووپەکەی خۆی کە بریتییە لە (م، یت، ە، ین، ن،ن) دەربهێنین (۱۱)و بە ئارەزوو لە شوێنی کاتی دابنێین وەک نموونەکانی:

| | |
|---|---|
| من کەوتووم ـــــ م | ئێمە کەوتووین ـــــ ین |
| تۆ کەوتوویت ـــــ یت | ئێوە کەوتوون ـــــ ن |
| ئەو کەوتووە ـــــ ە | ئەوان کەوتوون ـــــ ن |

بە چی بەڵگە راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک دەتوانرێت، لە ریزی راناوەکانی سەرەوە جیا بکرێنەوە، کوا ئەو بەڵگە سەلمێنەرو دیارە، چی شتێک هەیە لە کەرەسەیەکی دەنگسازییەوە تاوشەسازی و رستە سازیش لەو شوێنەدا دیار و ئاشکرا بێت و ئەوە بسەلمێنێت کە (ە) لە [ئەوکەوتووە] مۆرفیمی کاتی ئێستا بێت، باشە ئەگەر (ە) کات بێت ئەی کوا راناوە لکاوەکەی کەسی

سێیەم، ئەگەر زۆریش نابەجێ و دووره لە راستییەوە بڵێین راناوەکە بۆشە (٥) چونکە ئەم راناوی (ە) بە لەگەڵ بەشەکانی تری ئاخاوتندا دەردەکەوێت و لە شێوەی کرمانجی سەروو بادینانی لێ دەرچێت ئەم راناوە بە ئاشکرا دیارە:

ئەز دچم ئەز کوردم

تو دچی تو کوردی

ئەو دچە ئەو کوردە

لە رابردووشدا دەرناچێت وەک: [ئەو کەوت] ئەوە دەگەیەنێت کە (ە)ی مۆرفیمی کاتی ئێستا بوونی نییە لە کوردیداو رستەکانی (مطلق)ن و خاسیەت و سیفەت و نەسەب دەگەیەنێت وەک ئەم نموونانە:

ئەو کوردە ـــــ خاسیەت ـــــ ئەو خەڵکی شارە

ئەو جوانە ـــــ سیفەت ـــــ زاگرۆس ئازایە

ئەو شوانییە ـــــ نەسەب ـــــ ئەو کەرکووکییە .

دارستان سامانی وڵاتە. دیاردەیەکی (مطلق)ە، لە حاڵەتی نادیاردایە.

ئێستاو ئایندەو رابردووی ئەو جۆرە رستانە هەریەکن و هەموو کاتێک دەگرنەوە، چونکە کاتی دیاری کراویان تێدا نییەو، بێ کاتن و کەسی قسەکەر (المتکلم) باسی کەس و حاڵەت و دیاردەیەکی نادیار (غائب) دەکات کە کەسی سێیەمەو یا باشتر بڵێین ریزی ئەو باسکردنانە، پلەی سێیەمی قسەکردن دەگرێتەوە، بۆیە (ە) راناوی کەسی لکاوە بۆ سێیەمی تاکی نادیار (غائب).

پاشان بە چ مافێک (ی) راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی فرمانی تێپەڕ کە بریتین لە (م، ت، ی، مان، تان، یان) تایبەتن بە چوونە سەر فرمانی تێپەڕو بۆ هەییش (تملک- Possessive) لەگەڵ ناوو ئاوەڵناو و ژمارەدا بەکاردێن، لە ریزەکەی خۆی دەربهێنرێتە دەرەوە وەک: (١٢)

من ناردوو(م)- ە ئێمە ناردوو(مان)- ە

تۆ ناردوو(ت)- ە ئێوە ناردوو(تان)- ە

ئەو ناردوو (-)- ە تی ئەوان ناردوو(یان)- ە

ئەم نەخشەیەی سەرەوە، هەڵەیەکی زەقی تێدا کراوە، ئەویش ئەوەیە مۆرفیمی (ە)، بەبێ بەڵگەی سەلمێنەر، لە ریزی راناوە لکاوەکاندا دەرهێنراوەو، خاسیەتی کاتی ئێستای دراوەتە پاڵ و، ناکرێت و ناشێت، ئەم راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکە، لەو ریزە دەربهێنرێت، بە بیانووی ئەوەی کەسی سێیەم بۆشە (٥)، ئێمە لەمەوپێشەوە نموونەمان بۆ بوونی ئەو راناوە لە نموونەی جۆربەجۆری نافرمانیدا هێنایەوەو، بۆ (ە)ش لێرەدا بەشێکە لە نیشانەی کاتی رابردووی تەواو، کە بریتییە لە [ووە/وە] ناکرێت بەجیا پیشان بدرێت، ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی تریشەوە تەنیا حاڵەتی گەردان کردنی فرمانەکە، لەگەڵ راناوە لکاوەکاندا گۆڕانی بەسەردا دێنێت، ئەویش بەشێکی نەپچڕاوە، لەو نیشانە تەواوەی {ووە} و لەلایەکی تریشەوە نابێت ئەوە لە بیر بکەین، کە راناوی کەسی سێیەمی تاک لەگەڵ فرمانی تێپەڕدا بریتییە لە (ی) وەک نموونەی [ئەو ناردوویەتی] نەک [ئەو ناردووەتی] کە هەڵەیەکی زەقی دەنگسازی تێدا کراوە، ئەویش ئەوەیە کە (ی) راناوی لکاو ناتوانێت یەکسەر بەبێ ناوبژیوانی نیمچە بزوێنی (ی) بچێتە سەر، نیشانەی {ووە} بۆیە نیمچە بزوێن (ی) لە نێوان دەنگی (وو)ی درێژ (کەلێرەدا بەشێکی نیشانەی کاتە) لە نێوان (٥) نیشانەکە تەواوە، کە کە {ووە/وە} پەیدا دەبێت و، پاشان جارێکی تر نەبزوێنی (Consonant) (ت) نێوانی بزوێنی (ە) و (ی) راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک دەکات کە لەو جۆرە شوێنانەدا دەردەکەوێت و ناکرێت بە مۆرفیمێکی بۆش (Empty Morphem) دابنرێت چونکە بۆش نییەو (١٣) مەبەستی خۆی لەوێدا ئاشکرایە، کە هۆیەکی دەنگسازی ئەو راناوەی کەسی سێیەمی تاکی خستۆتە دواوەی فرمانەکە، لە تێپەڕدا (١٤) بەڵگەش بۆ

بوونی ئەم راناوە کەسییەی سێیەمی تاکی (ی)، لەگەڵ فرمانی تێپەڕدا (ی)یە نەک بۆش، کە بریتییە لە (م، ن، ی، مان، تان، یان).

لێرەدا بۆ بوونی پێویستی (ی) نیمچە بزوێن، لە ناومۆرفیمی (ێتی)نەک (ووەتی) ئەم نموونەو دیاردەیە لە کوردیدا، کە بێجگە لە دەنگی نیمچە بزوێنی (و،ی) بۆ نێوان کردنی دوو بزوێن، دەنگی (ر)ی فلاپ (سووک) و دەنگی (ت)ی نەبزوێنە:

بیدورەرەوە، بیخۆرەرەوە.

با پێکەوە سەیری دەنگی (ر)ی نێوان بزوێنی (و،ە)ەو، نێوانی بزوێنی (ە،ە) لە وشە یەکەمداو دەنگی (ر) نەبزوێن لە نێوان بزوێنی (و،ە)ەو (ە،ە) بکەین، ئەمە ئەوەی سەلماند، کە دەنگی (ت) و (ر) دەوری جیاکردنەوەی بزوێن دەبینن لە زمانی کوردیدا، بە هەمان شێوەی نەبزوێنی (و،ی)، کە لە نموونەی وەک لە نموونەکانی: ئەو رۆیشتووەتەوە، ئەو سووتاوەتەوە دەردەکەوێت، با پێکەوە ئەم نموونانە بۆ کەسەکانیتری هەمان کۆمەڵی راناوی لکاو بهێنینەوە کە (ە)لە بنەڕەتدا (ەت) نییە بەڵکو دیاردەیەکی دەنگسازییە کە (ە)ی کردۆتە (ەت)، لە تێنەپەڕیشدا (ە)ی لکاو دەرناچێت:

من رۆیشتوومەتەوە

تۆ رۆیشتوویتەتەوە

ئەو رۆیشتووەتەوە یان ئەو رۆیشتۆتەوە

پاشگری دووەمی ئەو نموونانەی سەرەوە کە بریتی لە (ەوە) بۆ دووبارە کردنەوەی کردەوەی رووداوەکەیە، وەک: رۆیشتنەوە، سووتانەوە، کردنەوە... تاد.

# ئەنجام

١- (ە) وەک مۆرفیمێک لە رستەسازیدا لە ناوەندی رستەوە دەبێتە جێگری ناو، ئامرازی پێوەندی، پاشکۆی ئامرازی پێوەندی وەک: من خەڵکی ئەم شارە نیم، هەروەها لە کۆتایی رستەوە، دەبێتە راناوی کەسی لکاوی کۆمەڵەی (م،یت،ە،ین،ن،ن)و هەروەها دەبێتە دروستکەری رستەی هەیی، وەک: سەرم بەرز(ە).

٢- (ە) لە کۆتایی رستەوە، رستەی ناوی دروست دەکات و، بە تەنیا هەر خۆی کات پیشان نادات و بەشێکە لە مۆرفیمی کات وەک (ووە/وە، ایە) لە فرمانی رابردووی تەواو و فرمانی رابردووی ئیلزامیدا، لە گەردانکردندا نەبێت تووشی کەرت بوون نابێن.

٣- فرمان خۆی بەبێ راناوی لکاو، تێنەپەڕەکانی لێ دەرچێت، بۆ کەسی سێیەمی تاک دروست نابێت، ئیتر (ە) خۆی چۆن دەبێتە فرمان، بۆیە راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکە.

٤- کۆمەڵەی دووەمی راناوە لکاوەکانی (م، یت، ە، ین، ن، ن) لەگەڵ وشەی نافرمانیشدا رستە دروست دەکەن وەک لەگەڵ ناو، راناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان، ژمارە.

٥- کۆمەڵەی یەکەمی راناوە لکاوەکان، تەنیا لەگەڵ فرمانی رابردووی تێپەڕدا رستە دروست دەکەن، کەچی لەگەڵ بەشەکانی تری ئاخاوتندا، بە تایبەتی ناو، راناو، ئاوەڵناو، ژمارە هەیی پێکدەهێنن نەک رستە.

٦- (هە)ی چاوگی (هەبوون)، کە واتای (بوون) هەڵدەگرێت، نیشانەی هەبوونە (تملک) لە زمانی کوردیدا و پێوەندی بەکاتەوە نییە، چونکە لەگەردانکردنی کاتە جیاجیاکانی فرمانی (بوون)دا بزر دەبێت، چونکە (هە) بە

تەنیا کات و ڕووداوی تێدا نییە.

٧- زۆربەی وشە لێکدراوەکانی زمانی کوردی، بەتایبەتی ئەوانەی کە بەبێ ناوگـر دروست دەبن وەک: سـەربەرز بەهۆی ڕاناوە لکاوەکـانی کـۆمـەڵەی دووەمەوە، ڕستە دروست دەکەن و بوونی ڕستەی ناوی دەسەلمێنن.

٨- هەمـان وشـەکـانی زنجـیرە (٧) ئەگـەر لەناوەندی وشـەکـەوە، کـۆمـەڵەی یەکەمی ڕاناوەکان دەربکەون لە کۆتاییەوە (ە)ی ڕستەی هەیی دەردەکەوێت.

٩- (ە) لە مۆرفیـمی (هەیە)دا بریتـییە لە (ە) بۆ کەسی سێـیەمی تاک و (ی) نەبزوێنە نێوانی هەردوو (ە، ە)ی کردووە.

١٠- هیچ بەڵگەیەک نیـیە، ئەوە بسـەلمێنێت کە لە ژێر کـۆمـەڵەی ڕاناوە لکاوەکـانی (م، یت، ە، ین، ن، ن)ەوە کـاتی ئێسـتـا هەبێت، دەرنەکـەوتنی ئەم (ە)یە لە تێنەپەڕی کـەسی سێـیـەمدا، نابێـتـە هۆی ئەوەی لە کـەسی سێـیـەمی جۆرەکانی تری ڕابردوودا دەربکەوێت، بۆ بوونی نیشـانەی کات وەک لە نموونەی (ئەوهاتووە)، مۆرفیـمی (ووە)ی کات لەگەڵ (ە) لکاودا، چونکە لە یەک دەچن بوونەتە یەک، ئەگینا نیشانەی کات نییە.

١١- (ت) لەگەڵ (ە)دا یەک مۆرفیم پێک ناهێنن بە شێوەی (ەت)، بەڵکو دەنگی (ت) نەبزوێن ئەرکی دەنگسـازی بینیـوەو هەردوو (ە)یەکـان لە یەکـتـر جودا دەکاتـەوەو دەوری نیـمچە بزوێنی (و،ی) بینیوە، وەک دەنـگی (ر) ڤلاپ (سوک) کە دوو بزوێن لەیەکتر جودا دەکاتەوە.

١٢- مۆرفیـمی (یەتی) بۆش نییە، بەڵکو هۆی دەنگسـازی وای لێکردووە، کە (ی) ڕاناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاک بکەوێتە دواوەی وشەکە.. ❖

## پەراوێز و سەرچاوە

(١) سەعید صدقی کابان، مختصر صرف و نحوی کوردی، بەغدا، ١٩٢٨، ل ٦٥.

(٢) أ- بیروڕای نوری عەلی ئەمین، ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ١٩٧٦، ل ١٨٢.

ب- صادق بهادین، ڕێزمانا کوردی، بەغدا، ١٩٨٧، ل ٤٤٨-٤٥٠.

(٣) ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، بیروڕای مەسعوود محەمەد، ل ١٨٢.

(٤) أ/ صالح حوسێن پشدەری، کورتەیەک لەڕێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٧١.

ب/ د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، جێناو، بەغدا، ١٩٨٧، ل ١٤٧.

(٥) د. شێرکۆبابان، گۆڤاری (رامان) ژمارە (٢٠) ڕێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ە)، ١٩٩٨، ل ١٧٢-١٧٥ نابێت دکتۆر شێرکۆ لەم بۆچوونەم زویر بێت، چونکە مەبەستم مەبەستێکی زانستانەیەو بەس من دەس خۆشی لێ دەکەم بۆ بەرهەمەکانی، ئەگەرچی بیروڕای خۆم هەیە لەبارەیانەوە بەتایبەتی لە کتێبی (رستەسازی و شیتەڵ کاری زانستی، ١٩٩٦، بەلای منەوە نرخی لەوەدایە، کە ڕێزمانی کوردی خستۆتە سەرزمانی بیسک، چونکە زانیارییەکانی هی نووسەرانی ترە).

(٦) رەفیق محەمەد شوانی، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دکتۆرا کۆلیجی پەروەردەی زانکۆی بەغدا، ١٩٩٧، ل٧٤.

(٧) بڕوانە محەمەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە تای تەرازووی بەراورددا، بەغدا ١٩٨١، ل ١٦٧.

(٨) بڕوانە بیروڕای مەسعوود محەمەد، سوڕێکی خامە بەدەوری راناودا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردی، ژ (١) بەغدا، ١٩٧٤، ل ١١١.

(٩) بڕوانە: رەفیق محەمەد، چاوگ و فرمان کامیان سەرچاوەو بنەڕەتن، وتارێکی دەسنووسە، بەڵام بەهۆیەوە لە مامۆستای یاریدەرەوە بوومە مامۆستا.

(١٠) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، جێناو، بەغدا، ١٩٨٧، ل ١٤٧.

(١١) صالح حوسێن پشدەری، کورتەیەک لە رێزمانی کوردی، بەغدا، ١٩٨٥، ل ٧٢.

(١٢) د. شێرکۆ بابان، رێزمانی مۆرفیمی ئێستایی (ە)، گۆڤاری رامان، ژمارە (٢٠)، ١٩٩٨، ل ١٧٢- ١٧٥.

(١٣) بڕوانە سەرچاوەی (١١).

(١٤) وریا عومەر ئەمین، یاسایەکی فۆنۆلۆجی، کاروان، ژمارە (٢٠)،ل ١٩٨.

# سەرنج و تێبینی دەربارەی چەند وتارێکی مامۆستا وریا عومەر ئەمین

بێگومان لێکۆڵینەوە کارێکی بەسوودو خزمەتی زانستە، دیواری ئەم زانستە رۆژ بەرۆژ لەبەرز بووندایە، لێکۆڵینەوەی نووسەرانیش کەموکوڕی دەگرێتە خۆی، واتە بە هیچ شتێک یا بۆچوونێک ناتوانین بڵێین تەواو راست وبێ کەم وکوڕییە، بەم پێشەکی یە کورتە دێمە ناو باسەکەمەوە کە بۆ نەهێشتنی کەم و کوڕی و ناتەواویی هەندێک وتاری مامۆستا وریا عومەر ئەمینە. لەبارەی «ئامرازەکانی بەستن»و ، کە لە گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە (٦٧)ی ١٩٨٤ لەلاپەڕە (٢٨-٣١) بڵاوکراوەتەوە.

مامۆستا وریا لەم وتارەدا هاتووە یاسای بەکارهێنانی ئامرازەکانی بەستنەوەی لەرستەدا دەست نیشان کردووە بەلایەوە (لەزمانی کوردیدا سێ ئامرازی بەستن ( (Conjunction هەیە (ناوو ناو) و (ناوو ئاوەڵناو) لەناو چوارچێوەی ڕستەدا لەیەک دەدەن کە ئەمانەن (و-ی-ە) هەریەکە ئەرکی تایبەتی خۆی هەیەو لە حاڵەتێکی تایبەتیدا دەرئەکەوێ» (بڕوانە ل٢٨) ئامرازی بەستنەوەن، بەڵام ژمارەی ئامرازی بەستنەوە، لە زمانی کوردیدا هەر ئەم سیانە نین، بەڵکو هەموو ئەو ئامرازانە دەگرنەوە، کە دوو کەرەسەی زمان لەیەکتر دەدەن و ، بەیەکتریان دەبەستنەوەو، کەرەسەی تازە پێکدەهێنن و دەوری جیاجیای ناو

ڕستە دەبێن لە بکەر و بەرکار و بەرکاری ناڕاستەوخۆو تەواوکەری بەیاریدە، کە ئەم ئەرکەی دواوەشیان لای مامۆستا وریا دەست نیشان نەکراوە، ئەمجا بۆیە ئەم ئامرازانە دەکەونە نێوان دووکەرەسەوە، واتە دوو شت بەیەکترەوە دەبەستن هەموو ئامرازی پەیوەندی یەکان دەگرێتەوە وەک (و،ی،ە،بۆ،بە،لە،تا،ش/یش، لەگەڵ،لەتەک) کە هەر هەموو ئەم ئامرازانە، دەکەونە نێوان کەرەسەی جیاوازا و، بەیەکتریان دەبەستنەوەو گرێی ناویان لێ پێکدەهێنێ و هەندێکجار کەرەسەی تریش وەک (گرێی ئاوەڵناوی، گرێی ئاوەڵفرمانی) پێک دەهێنن، جۆری دووەم ئامرازی لێکدەرە کە ئەمانەن (و،ش،یش، یان،یان،بەڵام، کەچی،ئەگینا،ئەمجا، هەم،هەم،نە-نە،ش--ش،چ-چ) کە ئەمانەش دوورستەی سادە لەبواری ڕستە دروست کردندا، بەیەکتری دەبەستنەوەو، ڕستەی لێکدراو پێکدەهێنن بۆ مەبەستی جیاجیا. جۆری سێهەمیش ئامرازی گەیەنەرە، کە ئەمانەن (کە،کەی،کاتێک کە ، هەکە،هەرکە،هەرکەس، هەرکێ،هەرجار،چونکە،ئەگەر،بۆیە تا،هەرچی،هەرچەندە،کەواتە،لەگەڵ ئەوەشا،پاش ئەوەی،لەوەتەی (لەوەتی) ،ئەوەندەی کە، زیادلەوەی کە...)(١) کەئەم جۆرە ئامرازانەش دەکەونە تەک ڕستەی سادەوەو دەیان کەن بە لاڕستەو (الجملە التابعە Subordinateclause بەشارستە بۆ مەبەستی جۆر بەجۆر دەیان بەستنەوە، واتە ئەمانەش کارکردنیان لە زمانی کوردیدا بە تەنهانین. ئێمە لێرەدا باسی جۆری دووەم و سێیەم ناکەین، کە ئامرازی لێکدەرو ئامرازی گەیەنەرن، بەڵکو تەنها باسی جۆری یەکەمیان کە ئامرازی پەیوەندییە دەکەین، ئەم ئامرازە پەیوەندییانە هەموویان دەوری بەستانەوەی دووکەرەسەی ناو ڕستەیان هەیە.

لەپاشاندا ناوبراو، یاسای ئەو سێ ئامرازەی بە ناتەواوی خستۆتەڕوو، چونکە بێجگە لەبەستانەوەی (ناوو ناو)، (ناوو ئاوەڵناو) ئامرازی (و)ی

پەیوەندی (ناوو ڕاناو)یش بۆ پێکهاتنی گرێی ناوی لە دەوری جیاجیای ناورستەدا دروست دەکات وەک:

من و ئارام هاتین (بکەر)

من و ئالآی دیت (بەرکاری ڕاستەوخۆ)

بە من و ئالآی وت... (بەرکاری ناراستەوخۆ) کە ناکرێ دەوری (ڕاناو) لەم یاسای بەستانەوەی ئامرازی (و)ە بۆ بەشداری فەرامۆش بکرێت،چونکە ناوو ڕاناو دوو شتی جیاوازن و دوو بەشە ئاخاوتنی سەربەخۆن و ناکرێ یاسای دووەمیان پشت گوێ بخرێت و بوترێت پێویستە بە نیشاندان و باسکردنی ڕاناو لەم یاسایەدا ناکرێت، چونکە ناوو ڕاناو وەکو یەکن راستێکەی وانییە دووکەرەسەی جیاوازی ئاخاوتنن.

پاشان مامۆستا وریا دەبوایە هێمای بۆ بەستانەوەی (ڕاناو+ڕاناو) بەهۆی ئامرازی (و)ی بەشدارییەوە بکردایە وەک ئەم نموونانە:

راناو+ئاپ (و)+ڕاناو (ئاپ: ئامرازی پەیوەندی)

-من و تۆ هاتین (بکەر)

-من و تۆیان دیت. (بەرکاری ڕاستەوخۆ)

-بە من و تۆیان وت. (بەکاری ناڕاستەوخۆ)

مامۆستا وریا لە خستنە پێش چاوی یاسای دووەمیدا نموونەی بۆ (ناو+ئاوەڵناو)بە هۆی ئامرازی (و) نەهێناوەتەوە وەک:

ئاغاو بۆرە پیاو هاتن. (بکەر)

لە ئاغاو بۆرە پیاو مەپرسە (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

ئاغاو بۆرە پیاوم بینی. (بەر کاری راستەوخۆ)

هەروەها ئامرازی بەستنەوەی (و)ی پەیوەندی گرێی ناوی لە (ئاوڵناو+ئاوەڵناو) لە دەوری جیاجیادا پێکدەهێنێت، وەک)

ئاوەڵناو+و+ئاوەڵناو=ڕستە

-پاک و پیس هاتن. (بکەر)

- بە پاک وپیسم وت. (بەرکاری ناڕاستەوخۆ)

-پاک وپیس بگرە. (بەرکاری ڕاستەوخۆ)

یاسایەکی تری ئامرازی (و)ی بەشداری لە بەستانەوەی کەرەسەکانی ناو ڕستەدا بریتییە لە:

ئاوەڵفرمان+(و)+ئاوەڵفرمان(٢)

-بان و بنی خواربۆتەوە. (بکەر)

-بان و بنیم بەست. (بەرکاری ڕاستەوخۆ)

-بە بان وبنیدا ڕۆیشتم. (گرێی ئاوەڵفرمانی شوێن).

-سەروو خواریم بەست. (گرێی ناوی شوێن (بەرکاری راستەوخۆ)

مامۆستا وریا لە باسی ئامرازی بەستنەوەی (ی) دا دەڵێ: لە لایەکی ترەوە ئەو ناوانەی بە (ی) لێک ئەدرێن پەیوەندی یانم لەگەڵ یەکتردا لەسەر بناغەی هەیی دایە ((Possessive ... بڕوانە لاپەرە: (٢٨) ڕاستە (ی) هەیی پێشان دەدا، لە بەستانەوەی دووکەرەسەدا، بەڵام بێجگە لە دەوری هەیی دەوری چۆنیەتی و جۆریش لەوێدا دەبینێ، نموونەکەی مامۆستا وریا بەم جۆرەیە:

-برای مامۆستای کوڕی خوشکم هات.

-من برای مامۆستای کوری خوشکم ئەبینم.

-من نامە بۆ برای مامۆستای کوڕی خوشکم ئەنێرم.

ڕاستە لێرەدا ئامرازی بەستنەوەی پەیوەندی(ی) دەوری هەیی بینیوە، بەڵام مامۆستا وریا ئەوەی ڕوون نەکردۆتەوە لە کوێدا ئەم دەورەی هەیە، یا باشتر بڵێین هەستی بە جۆرەکانی تری ئەم ئامرازە لەو ئەرکانەیدا نەکردووە کە لەزمانەکەدا دەیبینێ وەک: لەلێکدانی ناوی بەرجەستە (شت) دەوری چۆنیەتی

و جۆر دەبینێ وەک:

-بازنی زێرم کڕی . بۆ (جۆر)ە.

-مەسینەی نایلۆنم کڕی (جۆرو چۆنیەتی) لە لێکدانی ناو+ئاوەڵناو ئەم (ئامرازی (ی) یە دەوری وەسفی هەیە لە بەستانەوەی کەرەسەکانیدا وەک:

- کچی جوانم دیت. (وەسف)یە.

-شەوی تاریک ناخۆشە (وەسف)یە.

کەچی ناوبراو تەنها (هەیی) خستۆتە ڕوو. کەدەبوایە ئەمەش ڕوون بکرێتەوە ئەگەر ناو خرایە سەر ناوو ڕاناوی کەس و شوێن ئەوا ئەوسا دەوری بەستانەوەی (هەیی) دەبنییێت وەک: نموونەکەی خۆی لە سەرەوەدایە، بەڵام من ئەم نموونەیە دەهێنمەوە وەک:

ناو+ئامرازی (ی) +ناوی کەس وشوێن و ئەندامی لەش وەک: شیعری گۆران بەرزە. (هەیی) گرێی ناوییە: دایکی ئاریان هات.

چیای خاڵخاڵان و پیازی عەودالان بەناوبانگن.

هەمان یاسا لەگەڵ ڕاناودا، هەیی دەبەخشێت، کە مامۆستا وریا ناوی نەبردووە، وەک: ناو+ڕاناو=رستە

سۆزی من سۆزێکی نیشتمانی یە. (گرێی ناوی)

تیشکی چاوی تۆ ئارامی گیانە. (گرێی ناوی)

کە ئەم گرێ ناوی یە وەڵامی پرسیارێکە بە هۆی جێناوی پرسی (کێ) بۆکەس و (کوێ)ی شوێن و (چی) یەوە دەکرێت و، تەنها هەیی یەکە بۆکەس و شوێن دەبێت (٣).

لەناوو ئاوەڵفرمان، گرێی ئاوەڵفرمانی دروست دەکات و، چۆنیەتی ڕوودانی فرمانەکە دیاری دەکات وەک:

-کاری بەپەلەو خێرا ئەنجامی باش نابێت.

-کاری بەپەلەی خێرا باش نییە.

لە کۆتایی لاپەڕە (٢٨)دا ئەوەی ڕاگەیاندووە کە ئەگەر (ناوەکە ئامرازی پێناسینی (ەکە)ی لەگەڵا بێ ناوەکە بە ئاوەڵناوی یەکەم و ئاوەڵناوی تر بە هۆی ئامرازی (ە) بەستنی (ە)ەوە لێک دەدرێن، ئەمەڕاستە وەک نموونەکانی خۆی:

درەختە سەوزە بەرزەکە...

بەوەی (ەکە) ناسراوی دەچێتە کۆتایی یەوە، بەڵام یاساکەی (ناتەواوی) گرتۆتە خۆی بەوەی (ناو+ئاوەڵناو+ەکە)، کەچی دەبینین ئەم ئامرازی بەستنی (ە) پەیوەندی یە یاسای لێکدانی تریشی هەیە وەک:(٤)

ناو+(ە)+ئاوەڵناو+نیشانەی ناسراوی+ئاوەڵناوی تر.

-گوڵە سوورەکە جوانە

ناو+(ە)+ناو+ەکە=

-کتێبە مێژووە کوردییەکەم بینی (بەرکاری ڕاستەوخۆ)

-بە جلە کوردییەکەوە هەڵپەریم. (بەرکاری ناراستەوخۆ)

-کتێبە مێژووە کوردییەکە کەوتە بازاڕەوە. (بکەر)

مامۆستا وریا لە کۆتایی لاپەڕە (٢٩)دا دەڵێ: «ئامرازی پێناسینی (ەکە) و نەناسین (ێک) و (ڕاناو نیشاندان)... هەرگیز هیچ کامێکیان لەگەڵ ئەوانیترا دەرناکەوێ(٥) ڕاستی بۆچوون ئەوەیە دوانیان پێکەوە وەک لەم نموونانەدا دەردەکەن: وەک کۆبوونەوەی (ڕاناوی نیشانە) و (نیشانەی ناسراوی) (یەک) و (ەکە):

-ئەوە کوڕێکی چاکە.

-ئەوە کوڕە باشەکەی باوکێتی.

دوای ئەمە دێمە سەر ئەوەی، کە هەروەکو لە سەرەتاوە، وتمان ئامرازی بەستنەوەی هەر ئەو سیانە نین، واتە (و،ی،ە) بەڵکو

(بۆ،بە،لە،تا،ش/یش،لەگەڵ،لەتەک)(٦) یش ئامرازی بەستنەوەن و هەمان دەوری ئەو سێ ئامرازەی (و،ی،ە) دەبینن وا لە خوارەوە دوای پێناسە کردنی ئامرازی بەستنەوە دەورو یاسایان دەخەینە ڕوو.

ئامرازی بەستنەوە هەموو ئەو ئامرازانە دەگرێتەوە، کە دەکەونە نێوان دوو کەرەسەی وەک یەک و جیاوازی بەشەکانی ئاخاوتنەوەو بەیەکیانەوە دەبەستن و کەرەسەی تازەی لێوەپێکدێت، لە گرێی ناوی، گرێی ئاوەڵناوی، گرێی ئاوەڵفرمانی و تەنانەت گرێی فرمانیش دروست دەکەن و وەکو ئامێرێک چۆن جێبەجێ کردنی کارێکی پێ ئاسان دەکرێت و یا بەهۆیەوە کار ئەنجام دەدرێت ئەم ئامرازانەش کاری ئاخاوتن بەهۆیانەوە ئەنجام دەدرێت و ڕستەی زمانی پێ ڕێکدەخرێت و دەبنە هۆی لێکدانی بەشەکانی ڕستەو جۆرەکانی ڕستە.

ئامرازی بەستنەوەی «تا» و، یاسای لێکدانی.

١- أ. ناوی کات+ئاپ+ناوێکی تری کات=گرێی ئاوەڵفرمانی ماوەی کات وەک: من شەو تا بەیان ناخەوم.

ڕۆژ تا ئێوارە دەسووڕێمەوە/ (ماوەی کات).

ب. ناوی شوێن+ئاب(تا)+ناوێکی تری شوێن=گرێیە ئاوەڵفرمانی شوێن.

-چیای خاڵخاڵان تا کەرکوک هەواری لەبیرنەکراوی ئێمەیە-ماوەی شوێن

-سلێمانی تا کەرکوک ١١٠ کیلۆمەترە.

-شار تا شار جیاوازی هەیە. (بەراورد دەگەیەنێ لە نێوان دوو شوێن) ئەم ئامرازە بە ئامرازی پەیوەندی (بە)ی پەرگر(٧) فراوان دەکرێت وەک:

-بە شەو تا بەیانی دەخوێنمەوە.

-سمکۆ لە شنۆوە تا سەلماس چالاکی دەکرد.

لێرەوە تا مەککە سۆفی سەربەڵەکە.

ئامرازی (ش/یش)ی پەیوەندی: ئەم ئامرازە ناوو ڕاناو یا ڕووداوێکی

نادیار بە بەشی دووەمی ڕستەکەوە، کە گرێی فرمانی یە دەبەستێتەوە، ئەمجا ئەو شتە نادیارە، بەڵام ڕاستێکەی هەست بەبوونی ڕووداوەکەی، یا هەواڵەکەی دەکرێت بۆ نموونە کەوەتمان:

زاگرۆسیش هات.

زەردەشتیش ڕۆیی.

مانای وایە بێجگە لە زاگرۆس، کەسێکی تریش هاتووەو ڕۆیشتووە.

لێرەدا هەواڵ وکەسە دیارەکەی بە نادیارەکەوە بەستۆتەوە، نموونەی تر:

-قالەش پیاوە. واتە قالەش لە ڕیزی پیاوەکانی تر دادەنرێت.

- بە خۆڕایی لێکیش دەبین. واتە من و تۆ لەیەکتر دەبین.

بۆ ڕاناو: -ئەویش هاتەوە

-تو خوا تۆش پیاوی.

یاسای تر: ناو+ئاپ(ش/یش)+ئاپ(و)+ناوو دۆخی دووەم

-نوێژیش و دزیش دەکات(دوو شتی نەگونجاون).

-کاسبیش و خوێندنیش دەکات.

ئامرازی پەیوەندی (بە): ئەم ئامرازە چۆن دەکەوێتە پەڕی ناوو ئاوەڵفرمانی ناو ڕستەکانەوە ئاواش دەکەوێتە نێوان دوو کەرەسە پێکەوە دەیان بەستێتەوە.

ناو+ئاپ(بە) وەکو ناوگر+ئاوەڵفرمان(گرێی ئاوەڵفرمانی چۆنیەتی):

-قسە بە درۆ ناکرێت

-ماڵ بە ماڵدەگەڕێم. (بەردەوامی شوێن دەگەیەنێت)

-شار بە شار هاتەوە. (بۆ بەراوودی دوو شوێنە)

-منداڵی بە گوڕم خوشدەوێت. (گرێی ئاوەڵناوی یە).

ئامرازی (لە)ی پەیوەندی بۆبەستنەوە.

هەمان یاسای (بە) کە لەسەرەوە خستمانەڕوو:

ناو+ئاپ (له) وەکو ناوگر+ئاوەڵفرمان (گرێی ئاوەڵفرمانی کاتی).
-تاریکایی مانگ له ئێوارەوه دیاره. (گ ئاک=گرێی ئاوەڵفرمانی کات)
-زۆر لەکەم باشتره (بەراورده)
ئامرازی(بۆ) بۆ بەستانەوەی دوو کەرەسه:
ناو+ئاپ(بۆ) وەکو ناوگر+ناوی تر
-نان بۆ نانەوا چاکه. (گرێی ناوییه)
-گوشت بۆ قەساب دانراوه. (گرێی ناوییه).
-شتەکان بەمن بوون. (گرێی فرمانییه)
-بزمارەکەم به چەکوش هەڵکیشا. (بۆهۆیه)
دیاردەیەک هەیه، ئەگەر ئامرازی پەیوەندی (بۆ)ی بەستنەوه هێڵی خرایه سەر له ڕستەی فرمان تێپەڕا، دەبێته جێناوی پرس، یا باشتر بڵێین وەکو جێناوی پرسی لێدێت نموونه:
-کتێبی بۆ کڕی؟ (بۆ-جێناوی پرسه بۆ هۆ)
-کتێبی بۆ کڕی. (بۆ-ئامرازی پەیوەندی یه کەپێناو، ڕستەی هەواڵییه)
دەگەیەنێت و هێزی دەربڕینی ڕستەکه ((intonation کەوتۆته ئەم لاو ئەولای تێکڕای ڕستەکەو بۆ-بۆته ئامرازی پەیوەندی (لأجل-لەپێناو).
بەکار هێنانی ئامرازی بەستنەوەی پەیوەندی (بۆ.به.له) لەگەڵ جێناودا، واته دەتوانن دووجێناو وەکو ناو ببەستنەوه، نموونەو یاسا:
جێناو+ئاپ+جێناوی تر:
-تۆ بۆمن باشیت.
-تۆ به من ناوێریت.
-تۆ له من چاکتری.
ئامرازی (لەگەڵ) ئەتوانێ دەوری ئامرازی (و) له پێکهاتنی گرێدا ببینێت،

کە بەشداری دەگەیەنێت و، وەک (و) بەڵام هەرچی ئامرازی (لەگەڵ)ە بە پێچەوانەی ئامرازی (و)وە ئەو گرێ پەیوەندییەی (Phrase Preposition-al) دروستی دەکات، لە رووی کەس و ژمارەوە، بەپێی دەربڕینی رێکەوتن (Agreement, Concord) بکەری رستەکەی لەگەڵ فرمانەکەیدا رێک ناکەون(٦) نموونە:

- زاگرۆسی برام لەگەڵ زەردەشتی هاوڕێیدا هات. (رێک ناکەوێت)
- زاگرۆسی برام و زەردەشتی هاوڕێی هاتن. (رێکەوتوون)
- زاگرۆس لەگەڵ زەردەشت هات.
- زاگرۆس و زەردەشت هاتن.

پاشان پێویستە ئەوە بوترێت، مامۆستا وریا سێ وتاری ناوەڕۆک نزیکی، بە سێ ناونیشانی جیاواز بڵاوکردۆتەوە، وەک ئامرازەکانی بەستن، بناغەی سادەترین رستەی کوردی رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١) ساڵی ١٩٨٦، لێکدانی وشەکان رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٨) ١٩٨٨ ئەم سێ وتارە، زۆربەی باسەکانی تیایە، دووبارە کراونەتەوە بە تایبەتی لە بارەی بەکارهێنانی ئامرازی بەستنی، (و، ی، ە)ەوە، کە ئەمە شتێکی نازانستییە، یان دەکرا لەژێر ناونیشانێکی تر پێکەوە بڵاوبکرێتەوە، یا ئەو یاسایانەی دووبارەن توخنی نەکەوتایە، بەتایبەتی وتاری لێکدانی وشەکان و ئامرازەکانی بەستن یەک باسن (بڕوانە وتارەکان خۆیان) ئەگەر جیان، دەبوایە باسەکەیان هەریەکەی لەمەودای خۆی بڕونایە، یا دەکرا یەکێکیان، بۆ ئەرکی ئامرازی بەستنەوەی (و، ی، ە) بوایە لە بارەی وشەسازییەوە بەناوی لێکدانی وشەکان و دووەمیانیش وەکو باسەکەی خۆی بۆ رستەسازی بێت.

(بڕوانە وتاری ئامرازەکانی بەستن)

پاش ئەمە لە لاپەڕە (١١٧)ی وتاری بناغەی سادەترین رستەی کوردی

رۆشنبیری (١١١)دا هەڵەیەکی زەق و دیاری تۆمارکردووەو دەڵێ «دە پیاوێکی زۆر ئازا لەگەڵ..» لێرەدا نەدەبوو ئەم هەڵەیە بەتێکەڵ کردنی ناوی ژمارە لەگەڵ ناوێک بەکاربهێنێت، کە نیشانەی نەناسراوی لەگەڵدا بەکارهێنرا بێت وەک (دە پیاوێکی) چونکە لە زمانی کوردیدا، دوو جار ناو دیاری ناکرێ و ناناسرێت، چونکە ژمارە بکەوێتە تەک ناوەوە مانای وایە ناوەکە دیارکراوە واتە چەند پیاوە؟ لە وەڵامدا دەڵێی (دە پیاو) ئەگەر وتت (دە پیاوێکە) واتە دوو جار دیاری کرا کە ئەمە لەگەڵ یاساو دەستووری رێزمانی کوردی ناگونجێت، راستێکەی دەشێ و دەکرێ بڵێین:

- دە پیاوی زۆر ئازای لەگەڵ خۆی هێنا. یا - هەشت نۆ پیاوێکی زۆر ئازای ... ئەم رستەیەی دواوە راستترە چونکە ژمارەکان (هەشت و نۆ) دیاری نەکراون بۆیە نیشانەی نەناسراوی (یەک «ێک»)ی لەگەڵدا بەکاردێت، بەڵام چونکە هێشتا نەزانراوە (هەشت پیاو یا نۆ پیاو)ن کە دیار کراون، ئەوسا کە لەگەڵ نیشانەی ناسراوی یەک دەشێ بەکاربهێنرێ بەڵام ئێستا هەڵەیە هەردووکیان پێکەوە واتە(ناوی ژمارە)، (نیشانەی نەناسراوی) لەگەڵ ناوێکدا پێکەوە بەکاربێن. چونک نەزانراوە ژمارەکە هەشتە یا نۆیە، بۆیە لەگەڵ (یەک)دا، بەکاردێ، بۆ ئەوەی راستی رێزمانی و ناڕێزمانی ئەو بەکارهێنانە روون بێتەوە ئەم نموونانە دەهێنینەوە:

دەشێ بڵێین: نۆ منداڵی هەیە.

هەشت سەرمەڕی کڕی.

بیست ویەک کتێبی هەیە.

ژمارە ناوەکانیان دیاری کردووە بێ نیشانەی ناسراوی.

ناشێ بڵێین: نۆ منداڵێکی هەیە.

هەشت سەڕ مەڕێکی کڕی.

بیست ویەک کتێبێکی هەیە.

ناکرێ دووجار دیاری بکرێن، جارێک بەهۆی نیشانەی (یەک)ەوە هەروەها بەهۆی ژمارەکەشەوە. کەپێکەوە بێن واتە ژمارەو نیشانەی نەناسراوی.

لە کۆتایی ئەم سەرنجانەمدا کە دەربارەی ئەو سێ وتارەی سەرەوە بوو دەکرا بە یەک وتار، هەرسێکیان باسکرانایە، نەک بە سێ وتاری ناونیشان جیاواز، ئەگەرچی (لێکدان و بەستن)، لە رێزماندا تا رادەیەک یەک شت و واتان، ئەمجا بەهۆی ئامرازەوە بێت یا بێ ئامراز، ئەگەرچی لێکدانەوەکەش، جاری وا هەیە، بەهۆی کەرەسەکەیەوە دەبێت و کەرەسەیەکی تازە دێتە کایەوە.

پاشان لە زۆربەی وتارەکانیدا، مامۆستا وریا، تەنها بە زۆری وتارەکانی خۆی دەکاتە سەرچاوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێت، کە بڕوای بە لێکۆڵینەوەی کەسانی تر نەبێت، ئەمەش شتێکی نازانستییە، سەیر ئەوەشە ئەو زۆر باوەڕی بە زانستی زمان و (نامطلق) هەیە. بۆ ئەم بۆچوونەم.

هەموو سەرچاوەی وتارەکانی خۆی دەکەمە بەڵگەی بۆچوونەکانم کە لە کۆتایی وتارەکانیەوە دیارن بۆ نموونە: (بڕوانە: وتاری لێکدانی وشەکان ل٣٧، بناغەی سادەترین رستەی کوردی، ل١٨٩ی) رۆشنبیری نوێ.

ناوبراو لە وتاری «پاشبەندەکان» کە لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد ژمارە (١٥)ی ساڵی ١٩٨٦ بلاوی کردۆتەوە باسی ئەو ئامرازە پەیوەندییانەی کردووەو خۆشی کە پاشکۆیان بەدوادا دێت و ئەوەشی رایگەیاندووە، کە نووسەران و خۆشی لەسەر ئەو رایەن کە (بۆ، بە، لە، تا، وەک، بێ) بە واتە: پاشبەندەکان - (١٨٤) ئامرازی پەیوەندین، راستی مەسەلەکە، ژمارەی ئامرازە پەیوەندییەکان، لە زمانی کوردیدا ئەمانەن (بۆ، بە، لە، تا، و، ی، ە، ش/یش، لەگەڵ، لەتەک)(٤)و (وەک، بێ) ئامرازی پەیوەندی نین وەکو مامۆستا وریا بۆی چووە، یەکەمیان «وەک» ئامرازی

لێکچوواندنەو دوەمیان کە «بێ» یا «بەبێ»یە ئامرازی بێجگەن، واتە «ادوات الاستثناء». پاشان لە وتارەکەیدا ئەوەی ڕاگەیاندووە،کە ئەم وتارەی تەنیا توخنی ئەو ئامرازە پەیوەندییانە دەکەوێت کە پاشبەندی post position یان بەدوادێت و بەلایەوە (بۆ،بە،لە)ن.

ئەمە ڕاستە کە ئەو سێ ئامرازە پاشکۆیان هەن، بەڵام نەک وەکو مامۆستا وریا، تەنها ئەو پاشکۆیانەی خستۆتە ڕوو کە دەکەونە دوای فرمانەوە بۆیە لەم ڕووەوە، دەڵێ «هەموو ئەو پێشبەندانەی کە لەگەڵ ئەو جۆرە فرمانانە دەردەکەون، کە چەمکی گوێزانەوە دەگەیەنن pativecase وەک چوون بۆ... دان بە... هتد) دەشێ پێشبەندەکە، بە پاشبەندی فرمانی (ـە) جێگیر بکرێ» بڕوانە: ل(١٨٢) وەک:ئێوە هاتن بۆ سلێمانی-ئێوە هاتنە سلێمانی».

ئەم بۆچوونەی بۆشایی تێکەوتووە، چونکە یا دەبوایە بیوایە ئەم وتارە تەنها ئەو پێشبەندانە دەگرێتەوە کە دەکەونە دوای فرمانەوەو وتارەکەی «هەوڵدانە بۆدەست نیشان کردنی یاساکانی دەرکەوتنی ئەم پاشبەندەو، قاڵبە جیاوازانە، کە ڕێزمانی کوردی هێشتا چارەسەری نەکردوون) (بڕوانە:ل١٨٢:٢) دەبوایە بیوتایە ئەوانەی دەکەونە دوای فرمانەوە، چونکە دۆخی تریشیان هەن، کە چارەسەرنەکراون و لەگەڵ فرمانیشدا نایەن، کەواتە بۆیە وتارەکەی، جێگای سەرنج و تێبینی دەربڕینە، بۆ ئەوەی وەکو خۆی دەڵێ کەم و کوڕی نەهێڵێن.

ئەم نموونانە دەهێنمەوە بۆپاشکۆی ئەوسێ ئامرازەی (بۆ،بە،لە) کە دەکەونە دوای وشەی تری بێجگە لەفرمانەوە؛ وەک:

-بۆ لاوە بڕوانە بۆ-وە (بزوێنی(٥) بە هۆی (١)ەو قرتاوە.

-بۆ بانەوە دەچم... بۆ- ەوە، لێرەدا کەوتۆتە دوای ئاوەڵفرمانەوە، ڕاستێکەشی ئەوەیە پاشکۆی ئامرازی (بۆ تەنها لەگەڵ ئاوەڵفرماندادێت کە بەزۆری شوێن دەگرێتەوە.

بە-ەوە: بە مامۆستاوە وەرن.

بە توێکڵەوە بیخۆ

بە بارەوە هاتەوە.

بۆ لەگەڵبوون وچۆنیەتی یە.

تاریکایی مانگ بە ئێوارەوە دیارە.

بەدەستییەوە دەگرێت.

بە-دا: بە ناخی زەویدا دەڕۆمە خوارەوە.

بەخۆدا دێمەوە. پێوەبوون و نووسان بۆهۆی دیاری کردنی شوێن.

لە-ەوە:لە ئێوارەوە دەخوێنم/سەرەتای کات

لە دڵمەوە خۆشم دەوێت،/شوێن

لە کەرکوکەوە هاتووم،/سەرەتای شوێن

لە-دا: لە قوتابخانەدا دەخوێنم/دیاری کردنی شوێن

لە شەودا دەبینم/دیاری کردن کات

دەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە، کە ئامرازی پەیوەندی (بۆ،بە،لە) کاتێک بەرکارە ڕاستەوخۆکەی فرمانی ڕستەکە جێگیر بکرێت، بە ڕاناو ئەو کاتە شێوەکەیان دەگۆڕێت بە (پێ.تێ،لێ) و دیسانەوە پاشکۆیان لەدواوە دەردەکەوێت، کە لای مامۆستا وریا ئەمە باسی لێ نەکراوە، نموونەی ئامرازەکانی (بۆ،بە،لە) دوای جێگیر کردنی بەرکاری ڕاستەوخۆی ڕستەی فرمان تێپەڕ:

بە-بێ پاشکۆ: بە ئازادم وت. بەپارە کڕیم-پێم کڕی

پێ-بێ پاشکۆ: پێم وت.

بە-ەوە پێ-وە: بە ئالآدا ناردم- پێمدا نارد- بێدا نارد.

وێنەکەم پێوە هەڵواسی.

لە-دا لێ-داتێ-دا: لە-لێم دا. تێیدابوو.

لە-ەوە لێ-وە: پارەکەم لێیانەوە وەرگرت.

لە-دا-لەناو بەلەمدا بینیم-تێیدا (تیادا) بینیم.

لە-بێ پاشکۆ: وەک:کتێبەکەم لە زاگرۆس سەند.

لێ-بێ پاشکو: کتێبەکەم لێ سەند.

تێ: چاکەم تێکرد- تێمکرد.

بۆ: ئامرازێکە تەنها لەگەڵ ئاوەڵفرمانی شوێنیدا، پاشکۆ وەردەگرێت و، شێوەی وەکوخۆی دەمێنێتەوەو ناگۆڕێت تەنها لەگەڵ ناوی شوێندا، دەگورێت بە (ە): دەچم بۆکەرکووک-دەچمە کەرکووک.

بۆ-ە: بۆ لاوە هات-بۆ تەنیشتەوە هات.

دەبێت ئەوە بزانین ئەم ئامرازە جێگیر کراوانە ئەگەر واتای وشەکەیان گۆڕی ئەوە دەچنە خانەی وشەسازییەوەو وەکو پێشگریان لێ دێت و ئامراز نین، بەڵام ئەگەر واتای وشەکەیان نەگۆڕی، ئەوا ئامرازی پەیوەندی جێگر کراون، بە هۆی نەمانی بەرکارە ڕاستەوخۆکەیانەوە.

مامۆستا وریا لە وتاری (داڕشتنی فرمان) لە ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٩)ی ١٩٨٦(٨) لەڕووی داڕێشتنی فرمانەوە، بۆ دیاری کردنی کاتە جیاجیاکانی، لە لاپەڕە (٢٥٩)دا دەڵێ «بۆ دیاری کردنی ئەم سێ چەمکە لە حاڵەتی یەکەمدا ئاوەڵکارێکی وەک (بەیانی) و لە دووەمدا (هەموو ڕۆژ)و لەسێ یەم دا (وا) ئەشێ بەکار بهێنرێت.

-بەیانی دەچمەقوتابخانە (داهاتوو)

-هەموو ڕۆژ دەچمە قوتابخانە (سادە)

-وا دەچمە قوتابخانە: (بەردەوامی)

پێشەکی وشەی «داڕشتنی» هەڵەیە راستێکە چونکە ڕەگی چاوگەکەی

بریتــیـیــه له (ڕێژ) نەدەبوو، بە تایبــەتی لێــرەدا، کــە وتارەکــەی پەیوەندی بـەڕەگــــــەوەیـە، ئـەم هـەڵـەیـە بـکـات، چـونـکـە لـە ڕانـەبـردوودا دەڵـێـن: (دەڕێژم،ئاودەڕێژم،بناغەی خانووەکەی جوان داڕێشتووە). هەروەها کاتێ فرمانی رسـتـەی دووەمی بریتــیـیــە لە (ڕانەبردووی بەردەوامی) کـە بە هۆی وشــەی (هەموو)ەوە دروست بووە، نەک سادە وەکو ئەو دەڵێت: کاتی فرمانی رستەکەی سـێـیـەمی مـامـۆسـتـا وریا کـە بەهۆی (وا)ەوە پێکهـاتوو وەک ئەو دەڵێ (بەردەوامی) نیـیـە، بەڵکو ئەو وشـەیە واتە (وا) شـێـوەی تری هەیە، وەکـو (ئەوا،ئەوە)، ئێستا بریتییە لە ئاوەڵفرمانی کاتی ئێستا، نەک بەردەوامی وەکو ئەو هێمای بۆکردووە، لە کوردەواریدا، کە زمانی ڕێزمانییە دەڵێن:

-ئەوا دێم مەڕۆ.

-ئەوە دێم.-هەموو کاتی ئێستا و قسەکردن.

-مەڕۆ وا دێم.-دەبەخشن کە لە حاڵەت.

-ئارامت بێت ئێستا وا دێم-دۆخی ئاخاوتندایە نەک بەردەوامی.

ئێمە نابێت لەخۆمانەوە بێین وشت دروست بکەین، پێویستە لەبەر ڕۆشنایی بەکار هێنانی زمانەکەدا، ڕێزمانی بۆ بدۆزینەوە:

مـامـۆسـتـا وریا عـومـەر لە وەرگـرتنی ڕەگی چاوگی ئەلـفـیا هێـمـای بۆ ئەوە کردووە ئەلفەکەی لە ئایندەدا دەبێ بە(ی)(بڕوانە خاڵی ب-٤ أ لاپەڕە ٢٦٠)دا پەراوێزدا هێما بۆ بیروڕای لێژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ یابیروڕای مامۆستا مەسعوود محەمەد لە لاپەڕە (٢٠٢،٢٠٧،٢٠٨،٢١٢،٢١٥،...) بکات چونکە ئەو سەرچاوەیە دەساڵ پێش وتارەکەی مـامـۆسـتـا وریا کەوتووە، ئەمە بێـجگە لەوەی کە ئەمەی لە گۆڤاری کاروان ژمارە (تایبەتی) ساڵی ١٩٩١دا بە ناوی (ڕەگ و نیشانەی کات) دووبارە کردۆتەوەو، خۆی داناوە، بە داهێنەری ئەم بیر و بۆ چوونە، کە ئەمە کارێکی دوور لە لێکۆڵینەوەی ئەکادیمی یە.

هەروەها مامۆستا لەبارەی ئەوەی فرمانی ئایندەهەمووی یەک دەستووری نییە بۆ دۆزینەوەی ڕەگ ئەمە کە بیروڕای لیژنەی کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕی زانیاری کوردییەکە لە لاپەڕە (١٩٩. ٢٠٠) دەریان بڕیوە بەهی خۆی دەزانێت وەکو لە بۆچوونەکانی وتاری چەندیاسایەکی مۆرفۆلۆجی دارشتنی فەرمان) باس کردووە، هەروەها لە گۆڕینی ڕەگی فرمانی ڕوودان (مطاوعە) (ل٢٠١-٢٠٢)ی کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی هەروەها بیروڕای لە بارەی ئەو چاوگانە کە بە (اندن) کۆتاییان دێت و (أ) ئەلفەکەیان دەگۆڕێت بە (ێ) (لاپەڕە: ٢١٠) یا لە گۆڕینی (أ) چاوگ (هاتن) بۆ (ێ) (لاپەڕە: ٢٠٧ی ر ئاک کۆڕی زانیاری) هەروەها لە دۆزینەوەی ڕەگی چاوگی (واوی) (لاپەڕە: ٢١٠/٢١١) و لە دۆزینەوەی ڕەگی ئەو چاوگانەی کە پیتی پێش نوونی چاوگییان (د)ەیەو «کە تاقمێکیان بەر دەستووری دەکەون،ئەو تاقمەش ئەو چاوگانەن کە بە (اردن) کۆتاییان دێ (...) وەک (بژاردن،ژماردن... لە مضارعەتدا ئەلفەکەی دەبێت بە (ێ) و دال ونوونەکەی دەقرتێن، نیشانە: دەبژێرم،دەژمێرم ...ناردم-دەنێرم» ئەمە بریتییە لە بیروڕای مەسعوود محەمەد لە لاپەڕە (٢١١-٢١٢)ی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی کۆڕ، هەروەها لە بارەی ڕەگی چاوەگی (کردن) لە لاپەڕە (٢١٣) کە بیروڕای مسعوود محەمەدە لە هەردوو وتاری (داڕێشتنی فەرمان) و (ڕەگ ونیشانەی کات)، لە کوردیدا مامۆستا وریا ئەمانەی بە بۆچوونی دەزانێت و هێما لەو دوو سەرچاوەیەدا، بۆ بیروڕای مامۆستا مەسعوود محەمەد نەکردووە کە ئەمە کارێکی نابەجێ و نەشیاوە لە لێکۆڵینەوەدا.

هەروەها مامۆستا وریا لە دۆزینەوەی ڕەگی ئەو چاوگانەی کەلە بە (ۆ،ە) کۆتاییان دێت، دیسانەوە هێمای بۆ بیروڕای لیژنەی کتێبی ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی نەکردووە، تەنها کتێبەکەی بە سەرچاوە داناوەو بەس، بەڵام پێویستە

وەکو مافێکی زانستی، لە پەراوێزدا، هێما بۆ بۆچوونی نووسەران بکردایە (بروانە: ل ٢١٥-٢١٦).

مامۆستا وریا لە لاپەڕە (٢٦١) وتاری (داڕشتنی فەرمان)ە کەیدا بە هەڵە رەگی چاوگی «هەڵسان،هاویشتی» بە «س،هاوێ» دەزانێت راستێکەی بریتییە لە (سێ،هاوێژ) واتە (هەڵسێ).

وەکو: هەڵدەسێم.

هەڵدەسێین.

دەهاوێژم. دەهاوێژین.

## پەراوێز:

(١) بڕوانە: ڕەفیق محەمەد محێدین، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا،. نامەی دوکتۆرا، کۆلیجی پەروەردەی ئیبنی روشد،١٩٩٧،ل ٤٧.

(٢) بۆ ئەم باسانەو کەوا لە پێشەوە خرانە ڕوو، بڕوانە: ڕەفیق محەمەد شوانی ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دوکتۆرا، کۆلیجی پەروەردەی ئیبنی روشد، زانکۆی بەغدا، ١٩٩٧، ل ٦٣-٦٨.

(٣) بڕوانە، ڕەفیق شوانی،سەرچاوی (٢).

(٤) بڕوانە: ڕەفیق محەمەد شوانی، نامەی دوکتۆرا، ل ٧٠.

(٥) وریا عومەر ئەمین، ئامرازەکانی بەستنی، گۆڤاری کوردستان، ژمارە (٦٧)، ل ٢٨-٣١. هەمان شتی لە وتاری «بیناغەی سادەترین ڕستەی کوردی، ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١١)، ١٩٨٦، ل ١٨٦/١٨٨ دووبارە کردۆتەوە.

(٦) بڕوانە: ڕەفیق محەمەد شوانی، سەرچاوەی ژمارە ١١، ل٣٦، ٤٣، ٤٧).

(٧) بڕوانە: سەرچاوەی ژمارە (٦).

(٨) بەداخەوە، کاروانی ژمارەی تایبەتی، ساڵی ١٩٩١ لەبەر دەست نییە دەستیش ناوکەوێت چونکە بڵاونەکرایەوە.

## سەرچاوەکان:


١. ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، کۆڕی زانیاری، بەغدا، ١٩٧٦.

٢. ڕەفیق محەمەد محێدین شوانی، ئامرازی بەستنەوە لە زمانی کوردیدا، نامەی دوکتۆرا، کولیجی پەروەردە ئیبنی روشد، زانکۆی بەغدا ١٩٩٧.

٣. سالّح حوسێن پشدەری کورتەیەک لە ڕێزمانی کوردی، بەغدا ١٩٨٥.

٤. وریا ،عومەر ئەمین أ/وتاری،ئامرازەکانی بەستن، گۆڤاری رۆژی کوردستان، ژمارە (٦٧)ی ١٩٨٤، ل ٢٨-٣١ .

ب/وتاری بیناغەی سادەترین رستەی کوردی، ڕۆشنبیری نوێ (١١١)ی ١٩٨٦، ل ١٨٦٦-١٨٨.

ج. چەند یاسایەکی مۆرفۆلوجی «دارشتنی فەرمان، رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٠٩)ی ١٩٨٦، ل ٢٥٨-٢٦٤ .

د. وریا عومەر ئەمین، لێکدانی وشەکان، رۆشنبیری نوێ (١١٨)ی ١٩٨٨، ل.

# زاری ناوچەی شوان
# بەبەراورد لەگەڵ زمانی ستاندەردا

نووسین و لێکۆڵینەوە کارێکی ئاسان نییە، ئەمە بێجگە لەوەی لێکۆڵینەوەو نووسین لەسەر بابەتی ئەکادیمی و زانستی، کە خزمەتی زانستی و نەتەوە بکات و، بتوانێت لەدوارۆژدا ببێتە سەرچاوە بۆ لێکۆڵینەوەی ئایندە، پێویستیی بە سەرچاوە هەیە، ئەگەر دەست بکەوێت، بەڵام هەندێک باس، دەربارەی هەندێک بابەت، سەرچاوەی زۆر کەم یادەگمەنە، یا بەو شێوەیە نییە کە بتگەیەنێتە ئەنجام.

من ئەم بارەم لەنووسینی وتاری دەربارەی ناوچەی «شوان»دا بینی کەلەگۆڤاری هاواری کەرکووک، ژمارە(٤)دا بڵاوکرایەوە. نووسین دەربارەی هەندێک ناوچە یابابەت یا هەندێک زاری زمانی کوردی زۆرکەمە، بەتایبەتی دەربارەی مێژووی هەندێک ناوچەی کەرکووک وەکو شوان و چەمچەماڵ و ئاغجەلەر و سەنگاو وقەرەحەسەن... هتد بەتایبەتی لەمێژووی کۆندا، دەتوانم بڵێم هەر نییەو«١» ، لەمێژووی نوێ و هاوچەرخیشدا دیسان زۆرکەمە و دەگمەنە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ باری نالەباری نەخوێندەواری، یا کەم خوێندەواری ناوچەکە، لەلایەک و باری سیاسی ئەو ناوچانەی کەرکووک، کەلە کۆنەوە خەریکی گۆڕینی رووماى ناوچەکەن تا لە کوردەواری بیسڕنەوە«٢» ، یا

فەرامۆشکردنی ئەم جۆرە باسانە لەلای ئێمەی کورد خۆمان، لەلایەکی ترەوە بوەستێ.

لێرەوە حەزدەکەم راستییەک دەرببڕم، باسی هەندێک ناوچەو شوێن هەروەکو وتمان لەلای نووسەرانی کوردیش پشت گوێ خراوە. بۆ نموونە ئەو ناوچانەی لەسەرەوە ناومان بردن، باسیان زۆربەکەمی لەمێژووی نوێدا کراوە، یا ناوچەیەکی فراوانی وەکو پارێزگای کەرکووک کە شوێن و مەڵبەندی چەندین شێوەزاری جیاوازی زمانی کوردییە و هەریەکەی ناوچەیەکی کارگێری وەکو (ناحیە و قەزا) دەگرێتەوە، کەچی لەلێکۆڵینەوەی باس و دیاری کردنی زارەکانی زمانی کوردیدا، بێجگە لەهەندێک نووسەری بە ئاگاو هوشیار نەبێت، باس لەپارێزگای کەرکووک هەر نابینرێت«٣».

ئەمجا ئەم باسە بەبیروڕای من کەوتۆتە سەرشانی نووسەرانی خەڵکی ناوچەکە تا پێکەوە، هەرکەس لەئاستی خۆیەوە، قۆڵی لێ هەڵماڵێت و بەپێی توانا ئەم ئەرکە پیرۆزە وکوردانەیە، ئەنجام بدەین و یا ئەوەی هەیە فراوانی بکەین.

ئەم باسە پێویستە لێرەدا بکرێت، یا بەبیری بهێنینەوە، چونکە خەڵکی ئەم ناوچانە بێ نازو دڵشکاو و لێ قەوماون، تامەزرۆی ئەو باسانەن تا بتوانرێ لەکەسایەتیان بەرز بکرێتەوە، چونکە ناسنامەی کۆمەلایەتی و مێژووییان لەکۆندا فەرامۆش و ئێستاش راگوێزراون، ئەگەر فریای نەکەوین ون دەکرێت. لێرەوە، دێمەوە سەر باسی زاری ناوچەی شوان، وەکو دیاری کردنی ناوچەی زارەکەی و، جیاوازی نێوان زاری ناوچەی شوان، بەوەی کە بەدوو شێوە زار قسەدەکەن و، ئایا ئەم زارانەی ناوچەکە، سەربەکام زارو دیالێکتی گەورەی زمانی کوردین؟ لەگەڵ ئەوەی ئایە ئەم زارانەی ناوچەکە، سەر بەزاری گەورەی پارێزگای کەرکووکن، یا سەر بەزارێکی ترن؟ لەم باسەدا بەپێی ئەوەی خەڵکی

ناوچەکەم و شارەزایی و پسپۆری من لەبارەی زمانی کوردییەوەیە، هەوڵ دەدەین پێناسەی راستی بدەینە ئەم زارە و شوێن و مەڵبەندی لەناو نەخشەی زمانی کوردیدا دیاری بکەین، کە ئەمە بێگومان کەڵکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و زمانەوانی خۆی دەبێت و لەکەڵک و سوودمەندی بەدوور نابێت.

خەڵکی ناوچەی شوان کە بریتییە لە(٧٦) دێ زیاتر،بە دوو شێوەی جیاواز لەیەکتر قسە دەکەن، هەر شێوەیەکی پەیوەندی بەدیالێکتێکی گەورەی زمانی کوردییەوە هەیەو، لەیەکتریش زۆر جیاوازن، زارێکیان کەزۆربەی خەڵکی ناوچەکە قسەی پێدەکەن و لەزاری سلێمانی یا باشتر بڵێین لەپوختەی زاری کرمانجی ناوەڕاستەوە زۆر نزیکە، یا زۆرکەم جیاوازە، جیاوازییەکەش پەیوەندە، بەهەندێک نموونەی کەمی دەنگسازی(phonology) و وشە سازی و رستەسازی(syntax)(٥)، کە لەم وتارەدا هەوڵی روونکردنەوەو دیاریکردنیان دەدەین. زاری دووەمیان قسەپێکەرانی کەمترە، لەزاری ناوچەکە و دەوروبەری ناکات و لەزاری خانەقینی، سنەیی، فەیلی، گەڕووسی لە(پارێزگای سنە)، دەربەندی و لوڕییەوە نزیکەو من لەم باسەدا زیاتر بایەخ بەزاری ناوچەی شوانی کێشک دەدەم، لەبەر ئەوەی جیاوازترە، لەزارەکانی کرمانجی ناوەڕاست و ناوچەکەی، تا ئێستاش لەسەری نەنووسراوەو کەم کەس مەگەر ئەوانەی ناوچەکەیان دیبێ، بیستوویانە. زاری شوانی کێشک، بەپێی دەربڕینی قسەکردن و بوونی هەندێک دەنگی هاوبەش، بەتایبەتی لەدەنگە بزوێنەکانداو، نەبوونی ئەم دەنگانە، لەزارەکانی تر داو، بوونیان لەزاری شوانی کێشک و، هەروەها لەزاری فەیلی و خانەقینی ولوڕی...هتد

لەگەڵ بوونی وشەی هاوبەش لەنێوانیاندا، زاری شوانی کێشک دەچێتەوە، سەر زاری فەیلی و خانەقینی ولوڕی و سەر بە دیالێکتی کرمانجی باشوورین، کە لەزاری(لوڕی)دا خۆی دەنوێنێ و دیارە. بۆیە گومان لەوەدا نییە، کە زاری

شوانی کێشک دەچێتەوە سەر قسەکردنی مەڵبەندی باشووری زمانی کوردی، کەبەگشتی ناوچەیەکی گەورەی لەباشووری کوردستانی رۆژهەلات(ئێران) تادەگاتە سەر ئاوی کەنداو لەناوچەکانی: لوڕستان، کرماشان، دینەوەر، ناوچەی (سونغور)«×»، مەندەلی، بەدرە، جەسان، خانەقین دەگرێتەوە.

مامۆستا گیوموکریانی نەمر دەڵێت« ئامرازی گەل[مەبەستی لەکۆیە-نووسەری ئەم باسە] لە ئەردەلان، لوڕستاندا بە فەیلی و لوڕو بەختیاری و شوان و کەڵهوڕەوە ئەمانەن: (ان، یان، ل، یەل، گەل)«٦».

مامۆستا گیو راستی پێکاوە، بەوەی ئەم زارانەی سەرەوە کە ناویان براون، نیشانەی کۆیان وایە و بەزۆریش نیشانەی(یەل، ەل، گەل) بەکاردێن و لەزاری شوانی کێشکیشدا بەکاری دێن وەک لەم نموونانەدا:

مێگەل، کوڕەل، برایەل، براگەل، کچەل، سەگەل، گایەل، مامۆستایەل، چاڵ خانگەل (واتە ناوی شوێنە بۆ شوێنێک کە خانووی لێیە و بۆتە ناوی). هەروەکو وتمان، ناوبراو زاری شوانی لەگەڵ ئەو زارە کوردییانەی باشووری لەقەڵەم داوە.

مامۆستا گیو لەکتێبەکەی دیکەیدا، کە فەرهەنگی مهابادە، ناوی شوانی، لەگەڵ زۆشبیران و نووسەرانی هەمان نووسەری ئەو زارانەی کە لە سەرەوە ناومان بردن، هێناوەودەڵێت:«لەبەغدا نێو برا فەیلی و لوڕو کەڵهوڕو شواناندا زۆر کەسی وەکو دکتۆر جعفرو... یارمەتیەکی زۆریان دام«٧».

ئەمەش بەڵگەیەکی ترە بەوەی کە شوان سەر بەزاری کرمانجی باشوورییە. بۆ هەمان مەبەست، کەزاری شوانی کێشک، سەر بەکۆمەڵە زاری کرمانجی باشورییە، بەڕێز حەمیدی ئیزەد پەناه لەفەرهەنگی لەک ولوڕدا، دەڵێت تا ئێستاش، لەناو فەیلییەکانی ناوچەی لوڕستانی بچووکدا، گەلێ خێڵ و هۆزی پەراگەندەی وەکو: مەهکی، هلیلان، شوان هەن و ماونەتەوە. ئەمەش بەڵگەیەکی تری بەهێزتر، کە زاری شوان و لەک ولوڕ لەیەکترەوە نزیکن و، سەر

بەیەکترین و زاری شوانی کێشکیش، زارێکی بچووکی دیالێکتی کوردی باشوورییە. بۆ هەمان باس مەلا جەمیلی رۆژبەیانی هۆزی شوانی ناوچەی کەرکووک لەبنەڕەت و بنچینەدا دەباتەوەسەر هۆزی گەورەی شوانکارە، کە لە لوڕستان نیشتەجێ بوونە«٩».

مامۆستا عەبدولڕەحمانی ئەمین زەبیحی نەمر خاوەنی فەرهەنگی«قامووسی زمانی کوردی» لەبارەی دابەشکردنی زارەکانی زمانی کوردییەوە، لەسەر بنچینەو بناغەیەکی دابەشکردنی جوگرافییەوە زارەکانی زمانی کوردی کردووە بەسێ هێڵ و شوێنی جوگرافییەوە، وەکو زاری باکووری، زاری ناوەندی، زاری باشووری و، زاری شوانیشی لەبەشی زارە ناوەندییەکانی زمانی کوردی داناوە«١٠».

ئەمە هەروەکو وتمان دابەشکردنێکی جوگرافی زارەکانە لەشوێنەکانیاندا کراوە، لەم رووەوە راستە، بەڵام دابەشکردن و دیاریکردنی زاری زمان لەمەڕ بنچینە و بناغەی لێکچوون و جیاوازی نێوان زار ئەنجام دەدرێت، لەرووی جیاوازی رێزمانییەوە (دەنگسازی، وشەسازی، رستەسازی)یەوە لەیەکتر جیاواز دەبن یا لەیەکتر دەچن، چونکە زۆرجار دوو زاری وەک یەک و دوور لەیەکتر، رێکدەکەوێت، لەیەکترەوە زۆر نزیکبن، وەکو زاری هەورامانی لەرۆژهەڵاتی کوردستان و زازاکی ناوچەی دەرسیم لەوپەڕی رۆژئاوای کوردستان، یا بەپێچەوانە دوانی نزیک لەیەک جیاوازن. ئەمجا، زاری شوان لەرووی رێزمانییەوە، سەر بەدیالێکتی باشووری زمانی کوردییە، هەرچەندە مامۆستا زەبیحی زاری شوانی لەریزی سنەیی و گەڕووسیش داناوە، کەسەر بەزاری باشوورین.

شتێکی گرنگ کەپەیوەندیی بەم باسەوە هەیە، ئەوەیە ناکرێت زار بەگشتی و زارەکانی زمانی کوردی، هەمووی یان زیاتریان، لەسەر بنچینەی زاری گەرمیان

وزاری کوێستان، باس و بەراورد بکرێت، راستێکەی ئەمە کارێکی نازانستییە، لەرووی بەراوردییەوە نالێم، بەڵکو وەکو دوو زاری جیاواز چونکە زاری گەرمیان ئەگەر ئەو زارانە بن، کە لەسنووری پارێزگای ناوچەی گەرمیان(گەرمەسێر)بن، ئەوا لەوسنوورەدا یا لەسنووری پارێزگای کەرکووکدا، چەند زارێکی زۆر جیاواز لەیەکتر هەن، وەکو زاری کاکەیی و زەنگەنەسەر بەزاری گۆرانن(هەورامانی)، لەگەڵ زارەکانی دیکەی ئەو هەرێمەدا، وەکو شوان، زاری داودەو تاڵەبانی جیاوازن، بێجگە لەزاری دیکەی وەکو شێخانی، زاری کوێستانیش ئەگەر مەبەست لەزاری ئەدەبیی و ستاندەری کرمانجی ناوەڕاست بێت، بەوەی کە لەهەرێمی کوێستاندایە، ئەوا دیسان هەڵەیەکی زۆرگەورەی زمانەوانی و زانستییە، چونکە لەو هەرێمەشدا و لەناو ئەم زارەی کرمانجی ناوەڕاستدا، دیسان زاری جیاواز لەیەکتر وەکو: (موکریانی، سۆرانی، سلێمانی) هەن ، ئیتر چۆن دەبێت، ئەم دابەشکردن و بەراوردە بەناونیشانی زاری(گەرمیان)و زاری (کوێستان) بکرێت!، چونکە ئەو دوو ناوە ناوچەی فراوانی جوگرافین و هەروەکو وتمان هەریەکەیان لەچەندین زاری جیاوازی لەیەکتر پێکهاتوون و لەناوزارێکی (دیالێکت) گەورەتر دان.

ئەم کارو دەربڕینە لەکتێبی «رستەسازی و شیتەڵکاریی زانستی» د. شێرکۆ بابان دەبینرێت و زۆر پەلەی لەم دیاردەیە کردووە«١١». چونکە ئەوەی ئەو باسی کردووە، بەم دوو ناوە، مەبەستی دیاریکردن و جیاوازی کردنی نێوان ئەو دوو زارە، لەناو هەریەکێکیان زاری جیاواز هەیە و ناکرێت کۆبکرێنەوە بەناوی زاری«گەرمیان وکوێستانەوە».

لەرووی دیاریکردنی زاری شوانەوە، دەگەینەسەر ئەوەی بڵێین زاری شوانی بەگشتی، بێجگە لەزاری شوانی کێشک، سەر بە زاری کرمانجی ناوەڕاستە، چ لەرووی رێزمانی و چ لەرووی جوگرافییەوە، بێجگە لەهەندێک جیاوازی کەمی

دەنگسازی و وشەسازی ڕستەسازی، بەڵام زاری شوانی کێشک لەو ڕووانەوە دەچێتەوە سەر زاری کرمانجی باشووری(لوڕی). لەپیاوە تەمەندارەکانی ناوشوانم بیستووە گوایە شێوەی قسەکردنی زاری شوانی کێشک دەچێتەوە سەر زاری گەڕووسی باکوری ڕۆژهەڵاتی شاری سنە«١٢».

ئەمجا لێرەوە ڕێزمانی پێویستی ئەم زارە دەخەینە ڕوو، لە کوێشدا پێویستی بەنموونە ولێدوانی بەراوردی هەبێت، لەگەڵ زمانی ستاندەرو ئەدەبییەکەدا، دەیخەینەڕوو.

**سنووری زاری شوانی کێشک:** هەروەکو وتمان ئەم زارە لەهەمووئاستەکانی زماندا جیاوازی تیا بەدی دەکرێ، زاری شوانی کێشک لەم دێهاتانە بەکاردەهێنرێت، کە لەباشوورو ڕۆژئاوای چەمی شیوەسوورەوە دەست پێدەکات کەدەکەوێتە بناری کەلی سمایل بەگی و بان شوانەوە: ناڕوجەی گەورە«١٣» ناڕوجەی ئەحمەد ڕەجەب، ناروجەی حاجی جەرجیس، سمایل بەگی، خدرشرین، حاجی بەیخانی سەروو، حاجی بەیخانی خواروو، جانقز، ڕێدار، قولی بەگ، قەرەبلاغ«١٤». گەنیاک، کەرەدێ، مەمان، گورزەیی.. ئەم دێهاتانە، دەکەونە ڕۆژئاوای ناوچەی شوانەوە، کاریگەری ئەم زارە بەقسەکردنی دێهاتی دیکەی شوانی کێشکەوە، دیارە وەکو دێی: جەوەجەوە، عەلی بەیان، تۆراغ حەسارتەها...هتد.لەسنووری شواندا بەگشتی زاری ناوچەکە وەکو ناوچەی زاری سلێمانی بەهەندێک جیاوازییەوە قسەدەکەن، یا وەکو پوختەی کرمانجی خواروو.

تیرەی(ورام) وەکو دێهاتی (مۆرد، توورکە، هەردوو تەپەکوڕەی سەروو، تەپەکوڕەی خواروو، تەرەقە، دوو شینوان، تورکمانباخ، برایم زانە، کارێزەی خاڵخاڵان، تارادەیەک عەلی موسا و مامڕەش و ناسرومیسرو دێی کلاوقوتیش)«١٥» شێوەی قسەکردنیان هەروەکو زارە گشتێکەی شوانە،



## نەخشەی ناوچەی شوان

ب

ەهەردوو بەشی کێشک وشوانی خاسەوە بێجگە لەم زارە، جیاوازییەکی کەمی چۆنیەتی دەربڕین و-گۆ کردن

(تلفظ-phonetic) ڕێزمانی هەیە، کەبەرادەیەکی زۆرکەمە لەم وتارەدا ڕوون دەکرێتەوە.

## زاری شوان لەڕووی دەنگسازییەوە:

زاری شوان هەروەکو بەشێک لەزمانی کوردی، دەنگەکانی وەکو دەنگی زاری کرمانجی ناوەڕاستن، چونکە زاری شوان بێجگە لەزاری شوانی کێشک، یەکێکە لەزارەکانی کرمانجی ناوەڕاست، جیاوازی لەبوون و ژمارەی دەنگە بزوێنەکانی، لەگەڵ زمانی ئەدەبی و(ستاندەرد)دانییە و، هەشت بزوێنی هەیە و ئەوانی دیکە نەبزوێنەکانن.بەڵام دەنگەکانی زاری شوانی کێشک بەتایبەتی بزوێنەکانی دەچێتەوە، سەر زاری کرمانجی باشووری(لوڕی) لەڕووی ژمارەوە(نۆدەنگن، بەم شێوەیە دەردەکەون:

١-ه(ـە): سەر، دەربەدەر، وەتم.

٢- ا : سەرا، خودا، باران، هەندێک جار دەگۆڕێت بە(ێ) وەکو: ژمارە (ژمێرە)

٣- و : کورد، کول، گول

٤- ۆ : کەم بەکاردێت و دەگۆڕێت بەدەنگی (واوی)کورت یا دەبێتە دەنگی درێژ بەم شێوەیە(وو) وەکو: مورد ــــ مۆرد، زوور ــــ واتە زۆر، دو ــــ دۆ، بوور ــــ بۆر، یا هەندێک جار و لەهەندێک وشەدا دەبێتە دەنگی(وێ)

ۆ ــــ وێ وەکو : خوێ ــــ خۆ، رۆن ــــ روین، کەچی لەهەندێک نموونەدا

(ۆ) دەبینرێت وەکو: خۆر، ئیمرۆ، دشۆم، نۆک،
چۆک. لەهەندێک وشەدا دەگۆرێ بە(و) وەک:
رۆژ ـــــ روژ، زۆر ـــــ زور.
٥- وو : ئەم دەنگە کەمە و زۆر دەگمەنە و لەقسەکردنی شوانی کێشکدا
دەبێتە(وی) وەکو: دوور ـــــ دویر، شوو ـــــ شوی
ژوور ـــــ ژویر، ژوێر
مەحموود ـــــ مەحموید- مەحمید
موو ـــــ می- موی
موسڵ ـــــ مویسڵ(میسڵ)
بەروو ـــــ بەڕوی
بەکەمیش هەیە وەک: دوو بوور، بووک .... هتد.
لەهەندێک وشـەدا دەنگی (وو) واوی درێژ. لەم زارەدا دەگـورێت بەدەنگی
(وێ) وەکو:
سوور ـــــ سوێر یا هەر دەبێتەوە
سویر. شوو ـــــ شوی، چوون ـــــ چوین.
٦- وێ : سوێر ـــــ سوور ، بوون ـــــ بین
٧- وی : خوین(خوێن)،
٨- ی : هەنجیر، شیر
٩- ێ : زێ، چێ، دێ، رێ، سێ، هێش، هێس، هێلکە.
١٠-(ـ)بزرۆکە: دکەم، دشۆم،
کەواتە دەنگە بزوێنەکانی زاری شوانی کێشـک بریتین لە(٥، ١، و، ۆ، وو، وێ، وی، ی، ێ، (ـ) ( بزرۆکـە ) هەروەها (و)ی زۆر کـورتی، کـەلەئەنجـامی گۆرینی دەنگی (ۆ)ی کراوە بۆ ئەم دەنگە یا بوونی ئەم جۆرە واوە کورتە لەزاری

شوانی کێشکدا وەکو نموونەکەی سەرەوە: [مورد ـــ مۆرد،زور ـــ زۆر]. کەواتە ژمارەی دەنگە بزوێنەکانی ئەم زارە(٩) دەنگە بزوێنە.

## دەنگە نەبزوێنەکانی زاری شوان:(کێشک)

بریتیبە لە(٢٩) دەنگ بەهەردوو دەنگە نیمچە بزوێنەکەی(و،ی)یەوە، وەک ئەم دەنگانە:

ء: ئەیرە(ئێرە)، ئاسیاو، ب: بەور، بێرە، بنە(مرکز)بنەوبارگە. بەیخەندین(پێکەنین)؛ پ: پۆکلە(بەری دارو رووەک وەکو شێوەی پاقلە کە چەند دەنکێکی تیایە)، پڕمە(دەنگی پێکەنین)، پارین(واتە گولکە سەنگۆی ماڵ).

پەرەناو، پاساری(چۆلەکە).

ت:تاتک(خوشکی گەورە)، تاس، ترپ (توور) ، تەوازوو(المواساة)

ج: جاجگ(بنێشت)، جون(تصنیف) جونکردن).

چ: چیلکە، چەورە، چەپەر، چەقوو، چۆ(چی)، چرادان(چرا).

ح: حەوا(ئاسمان)، حەوشە، حەتحەتۆتە(ملوانکەی منداڵ)، حەوەجە(پێویستی).

خ: خوا، خۆر، خارچک. خۆیشک.

د: دوێت(کچ)، دامە، داسوویلکە(داسولکە)، دویپشتک(دووپشک)

ر: نسار(شوێنێک خۆر لێی نەدات)، تاریک.

ڕ:ڕوشنا(ڕوناک)، ڕێدار، ڕەوەز.

ز: زوور، زەردەلوی(قەیسی).

ژ: ژویژک(ژووژک)، ژەک.

س: سەنگیا(سەرین)، ئاسیاو، سەربیر.

ش: شەوەڕەشە، ئاشنا ،ناشتا (نانی خواردنی بەیانی)، شاکانی(حەسودی).

ع: عاسمان(ئاسمان)، عەرد (زەوی).

غ: غاردان(ڕاکردن)، غەور(غضب)، غایلە.

ف: فەریک، زەریف، زلفنج(وەکو بلێی بەزەهرت بێ)

ڤ: گڤەگڤ، ڤرەڤر

ق: قاقڕ(عەردی خراپ)، قاقز، قۆشمە(سباق)

ک: کەمچک(کەوچک)و کۆپری، کەوڕێ(عەردوڕێگای لێژ)، کاوڕ.
کەڵەشاخ.

گ: گەند، گەندە، گەڕیدە، گەندیاگ، ماڵەلگەڕ(ماڵانگەڕ)،
گاوس(مەشکەی گەورە)

ل: لەڕ(لاواز)، کەل(شوێنێک کەل بێت و لێی پەڕی بێت)، لەلە(خان
خان).

ڵ: گاڵە(دەنگەدەنگ)، دەڵ(مایەی(مێینەی سەگ)، گەماڵ(نێرەی سەگ).

م: میمک، مامش(هیچ، بێ ئەنجام و بێ بەر)، مامر(مریشک).

ن:نەردەوان(قادرمە، پلیکانی دار)، بە فارسی(نەردوبان: نردبان)، نەرگز.

و: وازی(یاری)، شەوەکی(بەیانی زۆر زوو)، مراوی.

ه: هەیدەر، هەردە(وعر)، هەراش

ئەم دەنگانەی سەرەوە، نموونەکانی لێدەرچێت لەزارە گشتێکەی شوان و زمانی ئەدەبی (ستاندەرد)دا بەکار دەهێنرێن و هەندێک نموونەشیان هاوبەشە. بەکورتی دەنگی بزوێنی(ۆ) واوی کراوە، لەزاری شوانی کێشکدا، زۆرکەم و دەگمەنە، دەنگی(وو) واوی درێژیش دیسان زۆرکەمەو دەگۆرێت بە دەنگی (وی)یا بەکەمی بۆ دەنگی (ی) لەوشەی(مەحموود ـــــ مەحمويد- مەحميد)،

دەنگی (وو) دەبێتە(ی)، وەک: پووز ـــــ پیز،

هەروەها دەنگی(وێ) دەبێتە(وی) وەکو وشەی[خوێن ـــــ خوین].

تێبینی: (٣٨) دەنگی بزوێن ونەبزوێن لەم زارەدا هەیە، ئەگەر دوو دەنگی (وی، وێ)

بەدەنگ دابنێین، نەک وەکو برگە، بەڵکو وەکو بزوێنێک.

**زاری شوانی کێشک لەرووی وشە سازییەوە: MORPHOLOGY**

ئاستی وشە سازی لەزماندا، ئاستێکی تابڵێی فراوانەو، هەر بەشێکی ئاخاوتن بگریت شێوەی جیاوازی پێکهاتنی هەیە و هەر شێوەیەکی یاسای وشەسازی تایبەت بەخۆی هەیە، بەتایبەتی، ئەو بەشانەی کەلەئاستی و شەدان، وەکو ئامراز، دیسانەوە شێوەی جۆراوجۆری هەیە.

ئێمە لەم باسەدا تەنها بەشێوەیەکی کورت، باس لەجۆرەکانی وشە، لەرووی دارشتنەوە دەکەین و لایەنی جیاواز بەنموونەوە، دەست نیشان دەکەین.

## جۆرەکانی وشە لەرووی پێکهاتنەوە:

**١-وشەی سادە:** وەکو پەناح، جاجگ، وازی، شرین(شیرین)، بوهار، گێژنە(ئەم وشەیە لەلای پیرەکانی ئەم زارە بەکار دەهات و لەگەڵ گۆڕانی زمان و زەماندا بوو بە] . (جێژنە)، ناشتا، کور(کوێر)، شوی، بوور، حێل(گەورە)، زل، تروزی(ترۆزی)، چەڵتویل(چەڵتویک)، چەپاڵە، زوور(بەزۆر)، پەندیر، ڕوین، کێرت، گووشت، سەکوی(سەکۆ)،وڵست(مواشی، حەیواناتی وەک مانگا و گا، گوێدرێژ)، سەنگۆ، چەقێلە، باشوکە، چەقوو، جفت(جووت)، دویر، خوێن، جامتا(جانتا)، تەیمان. تویرە، کوانک(کوانوو)، دلاقە(دەلاقە)، شامی. توی. زاخێر، پارین. لەتیرەی (ورام)دا، وەکو: جۆخین، بەست(شیو)، ئاش(ئاسیاو).

**٢-وشەی دارێژراو:** ئەو وشانەن کە لەوشەیەکی سادەی واتادارو پێشگرێک

یا پاشگرێک پێکدێت، وەکو: زلە، شەوەکی، جفتیار، بۆرە، سێکوان دوژمین(جوێن، جنێو،دژنێو)، جامیلکە، زەردەلوی، کوندەلآن، سەرشۆرک،(حمام)، زیخمەلآن، سپیاتی(البان)، ریچیاگ(دەم وپل سارد)، چەورە. نموونە بۆ وشەی(ورام) وەکو: پایزێ(کاتی پایز)، چلەی زستانێ، دەچم، دەینووسم.

**٣- وشەی لێکدراو:** لەدوو وشەی سادەی سەربەخۆ یا دوو مۆرفێمی سەربەخۆ بەهۆی ئامراز یا بێ ئامراز پێک دێت، نموونە:

هاولف، تەندویربان، گوڵ گەنم/ گوڵەگەنم، سیلاوکە، ئاورووگە، چاومار، جێخەرمان، مالآنگەڕ، شەواژوو، تێلەکێش، کوندەبی، خمخۆرک، سەرڕەش. دویرە پەرێز، ناوڕوان، گۆلکەسەنگۆ(گۆلکی نێر)، کەڕەواڵە، کەپەنگ هەڵگر(باڵندەیەکی گەورەیە). خاڵوژن. لەتیرەی (ورام)ی شواندا وشەکانی تایبەت بەخۆیان، وەکو: فرێ مالآن، فرەبەش، گەردن زەرد، دووپشکە.

دوای ئەم باسەی سەرەوە، هەندێک جۆری ناو، کەرواڵەتی جیاوازی ئەم زارە، لەگەڵ زارەگشتێکەی شوان وکرمانجی ناوەڕاستدا پیشان دەدات، بۆیە بەپێویستی نازانم هەموو جۆرەکانی ناو بخەمەڕوو، **جۆری ناوەکانیش ئەمانەن:**

+ **ناوی گشتی:** ئەوانەن کە بۆ کۆمەڵ و جۆرە رەگەزە ناوێک بەکاردێن وتاکێکی نموونەی ژمارەو کۆمەڵێک لەهەمان ناونیشاندەدات،

وەکو:رووما(شکل-ملامح)، کەستەک(تۆپەڵی قوڕوخۆڵ)، خانگ(خانوو)، بوستان (بێستان)، چەڵتویک، تایە، گەلەباوش، جوگە(جوگا)، هۆڵ. بەرخەوان، کارەوان، ژمێرە(ژماردن)، دامیش(استقرار).

+ **ناوی بەرجەستە:** گاوەسن، زریسک(آسلاک شائکە)،بێڵەقان، گاشە بەردی زل، هێرک(هەمان واتای بەرد)، دارتوی، شەغرە، لاپیتە، چیغ، بەڕوی، ترپ، تویرک، جوێ، شام، لەمپە(لالە-چرا). لیم(لم).

+ **ناوی ڕەگەز:**

**١-بۆنێرە:** خاڵە(برای دایک) سەنگۆ(گۆلکە نێر)، کاوڕ، نێری، تەگە، جوانەگا، پاڵە، سەپان، شەکەنێر، گەماڵ.

**٢-ناوی مێیە:مێمک**، ئاموژن، دوێت، تاتک، نەنگوین(گولکی گەورەی مێ)، تێلەکێش، مامر، باڕوک(باڕۆک)، جاشماکەر، قسر(مەڕەقسر، بزنەقسر)، شەکەمێ،دەڵ، کابان، خۆیشک، خوچە، خوچم(خوشکە، خوشکم).

ئاوەڵناو: هەراش، زل، حێل، گەندیاک، بوور، کەوو(خۆڵەمێشی)، چەرمگ(سپی)، مەندەمووڕ(کەم قسەو لەبنەوەبێت)،لەناوبەشەکانی ئاخاوتندا، ئەو بەشانە پیشاندەدەین، کەزیاتر جیاوازی و وشە ونموونەی دیارو زەقی تیادا دەردەکەوێت، وەک: جێناو، ئاوەڵناو، ئاوەڵفرمان، ئامراز بەگشتی.

جێناوی کەسی سەربەخۆی زاری شوان، بەگشتی بێجگە لەزاری کێشک، هەرهەمان شێوەی زمانە ئەدەبیەکەی کرمانجی ناوەڕاستە، لێرەدا هەرودووکیان پیشان دەدەین:

جێناوی کەسی سەربەخۆ لەزاری کرمانجی ناوەڕاست بریتیە لە(من، تۆ،ئەو، ئێوە، ئەوان) بەڵام لەزاری شوانی کێشکدا بریتییە لە(من، تو، ئەو، ئیمە، ئیوە، ئەوان)،

ڕاناوی کەسی سەربەخۆ

| ڕاناوی ستاندەر وشوان | | زاری شوانی کێشک | |
|---|---|---|---|
| ١-من | ئێمە | من | ئیمە |
| ٢-تۆ | ئێوە | تو | ئیوە |
| ٣-ئەو | ئەوان | ئەو | ئەوان |

من چوویم ــــــ ئیمه چووین

من چووم ــــــ ئێمه چووین

-تۆ چوویت ــــــ ئێوه چوون.

-تو چوویت ــــــ ئیوه چوین

-ئەو چوی ــــــ ئەوان چوین

جێناوی خۆیی زاری شوانی کێشک بریتییە لە(خۆم ، خۆت، خۆی، خومان،خۆتان، خۆیان) لەکەسی یەکەمی تاک و کۆ جیاواز دەردەکەوێت بەتایبەتی لەهەندێک دێهاتی وەکو: رێدار، قولی بەگ، جەوەجەوە، بەڵام لەزارە گشتێکەدا هەمان شێوەی زمانە ئەدەبییەکەیە.

نموونە: خوم هاتم، خومان هاتین. خۆت چویگی، خۆی چویە، خۆتان چویگن.

جێناوی پرس: لەزاری شوانی کێشکدا جیاوازە لەهەردوو زارەکەی دیکەدا(زمانی ئەدەبی و شوان بەگشتی) و بەم شێوەیە دەردەکەون، وەک :(کی، کەی، کورە، چوین، کامە، کامەیان، کوا، کانی، کوانی، کانێ ، چەند، چۆ، دبوک(ئایە) ئەرێ، چوینکی، ئاخۆ، چلۆن، بۆچۆ، بۆ، لەسەرچۆ، ئەڕا، ئەڕاچۆ، بۆ، بۆچۆ،.....)

ئەم جێناوانەی سەرەوە، بەرامبەر ئەمانە دەوەستن وەک:(کێ، کەی ، کوێ، چۆم، کام/کامە، کامەیان، کوا/کوانێ،کانێ، کەینێ، چەند، چی، داخوا، ئایە، ئەرێ، بۆچی...) ئەم نموونانەی دواوە لەدوو شێوەکەی دیکەدان.

نموونە:

-کی هاتە؟ کی چوی ــــــ کێ هات؟ کێ چوو؟

-ئەڕا(ڕا) واکەی؟ ــــــ بۆچی وا ئەکەیت(وادەکەیت)؟

-کەی نان خواردیت؟ ــــــ کەی نانت خوارد؟

- کورە گەڕیای؟ ــــــ کوێ گەڕایت؟

- کەینێ چی بۆ ڕیدار؟ــــ کەی ئەچیت(دەچین) بۆ ڕێدار؟

- چوین توانیت بەشەوەکی نان بخۆیت؟ــــ چۆن توانیت بەیانی زوو نان بخۆیت؟

-کامە/کام کەراس کریت؟ــــ کامە کراست کڕی؟

کامەیان واتیت؟ ــــــ کامیانت دەوێ(ئەوێ)؟

- کوانی زەردەشت؟ ــــ کوا زەردەشت(کوانێ)؟

- چەند نان دخۆیت؟ ــــــ چەند نان دەخۆیت؟

-چۆدفرۆشیت؟ ــــ چی ئەفرۆشیت(دەفرۆشیت)

- بۆ کورەچی؟ ــــــ بۆ کوێ ئەچیت(دەچیت).

**جێناوی نیشانە:** جێناوی نیشانە، بەگشتی لەقسەکردنی ناوچەی شوان و زمانی نووسیندا، بەزۆری وەکو یەکن، مەگەر بەکەمی نەبێت، بەڵام لەزارە قسەکردنی شوانی کێشکدا ، دیسان جێناوی هاوبەش وەکو ئەوان هەیە، بەڵام هی تایبەت بەخۆی هەیە، وەکو:[ئەیە، ئەی، ئەو، ئەوە، ئەیان، ئەیانە، ئەوان، ئەوانە، ئەمەتە، ئەیەتە، ئەمەتانی، ئەوەتانی، هۆوە، هۆوەتا، ئەیەتانە، ئەیەتان]،

بەڵام لەزاری تیرەی (ورام)دا[ئەمە/ئەم ، ئەوە/ئەو، ئەمانە، ئەمان/، هۆوەتا، هۆوەتانی، هۆوەتانێ،هۆوانە]کەچی لەشواندا بەگشتی(ئەم/ئەمە، ئەو/ئەوە، ئەمان/ئەمانە، ئەوان/ئەوانە....)

بەکاردێت. نموونە:

| جێناوی نیشانەی مانی نووسین و شوان | جێناوی نیشانەی | شوانی کێشک |
|---|---|---|
| بۆنزیک | ئەمە/ئەم- ئەمانە/ئەمان | ئەیە/ئەی- ئەیان/ئەیانە، ئەیەتان/ە |
| بۆدوور | ئەوە/ئەو- ئەوانە/ئەوان | ئەوە/ئەو- ئەوانە/ئەوان، ئەوەتان)ە |

١-ئەیە چۆیە؟ ئەی پیاوە چۆیە؟ ٢-ئەیان کوردن، ئەیانە کوردن، ئەمانە کوردن.

-ئەو مامۆستایە،ئەوە ژنە، - ئەیان خەڵک کورەن. ئەمانە خەڵکی کوێن.

-ئەی کچە جوانە-ئەیە جوانە، - ئەیانە دیتم.ئەمانەم دیت

- ئەی کچانەجوانن- ئەیانە جوانن -ئەمە تانی والێرە خەفتە.

لەرستەی یەکەمدا جیاوازی لەنێوان جێناوەکان دیارە، یەکەمیان بۆ نیشانەی تاکی نزیک و دووەمیان بۆ جێناوی پرسە(چییە، چۆیە) لەرستەی دووەمدا جێناوە نیشانەکان جیاوازن لەیەکەمیاندا(ئەیانە)و لەویتردا(ئەمانە)یەو رستەیی زاری یەکەم ئامرازی پەیوەندی وەرنەگرتووە، وەک وشەی خەڵک و لەدووەمدا بۆتە(خەڵکی)ئامرازدارە کە بریتییە لە(ی).

لەرستەی سێیەمیشدا بێجگە لە جیاوازی جێناوە نیشانەکان، راناوی لکاوی رستەی یەکەم چۆتە کۆتایی رستەکەوە، کەچی لەزارە ئەدەبییەکەدا کەوتۆتە نێوان جێناوەکەو فرمانەکەوە، ئەم دیاردەیە، لەشوێنی خۆیدا، لەگەڵ گەردانی فرماندا دەخەینەڕوو. نموونەی دیکە:

- ئەی پیاوە خەڵک کورەیە؟ ـــــــ ئەم پیاوە خەڵکی کوێیە؟

-ئەیە خەڵک کورەیە؟ ـــــــ ئەمە خەڵکی کوێیە؟

-ئەیانە چۆ واتن؟ ـــــــ ئەمانە چییان دەوێت؟

لەم رستانەی سەرەوە لەیەکەمدا پاشکۆی جێناوەکە کە(٥)یە بەهۆی بەکارهێنانی ناوە دەست نیشان کراوەکەوە، دەرکەوتووە، بەڵام لە رستەی دووەمدا، بەهۆی لادانییەوە، کەوتۆتە سەر جێناوەکەوە.

**گەردانکردنی جێناوی نیشانە، لەگەڵ راناوی لکاودا:**

| زاری شوانی کێشک | زمانی نووسین و شوان |
|---|---|
| من ئەیە دیتم ـــ ئیمە ئەیانە دیتین | من ئەمەم دیت-ئێمە ئەمەمان دیت |
| تو ئەیە دیتی ـــ ئیوە ئەیانە دیتن | تۆ ئەمەت دیت- ئێوە ئەمانتان دیت |
| ئەو ئەیە دیت ـــ ئەوان ئەیانە دیتن | ئەو ئەمەی دیت-ئەوان ئەمەیان دیت |
| ئەوان ئەیان دیتن | ئەوان ئەمانیان دیت |

لەم نموونانەی سەرەوە راناوە لکاوەکانی زاری (شوانی کێشک)، کەوتوونەتە کوتایی فرمانەکەوە، ئەمە بەپێچەوانەی نموونەی لایەکەی دیکەوە، کە لەناوەندەوە هاتوون. نموونە بۆ شێوەی (ورام):- هۆوە برای منە. هۆوەتانێ، لەو یانە دانیشتووە،هۆوەتا واهات، هۆوەتان وا رۆیشت. دیاردەیەکی دیکەی بەکارهێنانی جێناوی نیشانە لەزاری شواندا، بۆسەلماندنی کەبریتییە لە(ئەی/ئەیە) بەتایبەتی کەدەکەوێتە تەک وشەی کات وەکو ئاوەڵفرمان یا ناوی کات،وەک:

| | |
|---|---|
| -ئیمساڵ باران کەم بارییە. | ئەمساڵ باران کەم باریووە. |
| -ئیمرۆ چویم را مەکتەب | ئەمرۆ چووم بۆ قوتابخانە. |
| -ئیمشەو تاوەکی بەیانی نەخەفتم- | ئەمشەو تاکو بەیانی نەخەوتم. |

جێناوی چەندێتی: (رادە)ئەم جێناوانە رادەی ناو بەشێوەیەکی نادیار پیشان ئەدات،کە ژمارەکەی بەتەواوی دەست نیشان ناکرێت، وەکو: ئەوەندە، ئەیەندە،

هەند، هەندە، چەندی، چەندە،چەندیک، هەندیک،توزیک، زوو، زۆر، کـەم/ کەمیک، گەلیک، قلیک نەختیک، قەیاسی.هەرچۆ.

-ئەیەندە قسەی خۆشە لەی عاجز نێبیت.

-ئەوەندە هارە، رەحەت دانێنیشیک.

-ئەوەندە باشە، خراپ بییە.

| | |
|---|---|
| -هەند خۆیک نەخۆش کەفیک. | هەند دەخوات نەخۆش دەکەوێت. |
| -توزیک ئاو رام بیارە. | تۆزێک ئاوم بۆ بێنە. |
| -ئەمەندە حێلە جێی نێبووکەوە. | ئەمەندە زلە جێی نابێتەوە. |
| -چندی بەت بکریک چاکە بکە. | چەندی پێت بکرێت چاکە بکەی. |
| -قەیاسی کیلۆیک بابەی. | بەقەدەرکیلۆیەکی بدەرێ. |
| -زورهات قەبالە بەتالە. | زۆرهات قەوالە بەتالە. |
| -چەندیک توانی ئاو بخۆرەوە. | چەنێک ئەتوانی ئاو بخۆرەوە. |
| -هەر چۆ واتیک بابەی | هەرچییەکی دەوێت بیدەرێ. |

جێناوی هەیی: لەزاری شوان، جێناوی هەیی لەجیاتی کەس و شتی نادیار بەکاردەهێنرێت و بریتییە لە(هی، هین) ،بەلاّم لەزاری شوانی کێشکدا، جێناوی (هین)بۆخاوەنێتی بەکاردێت، وەک

ئەم نموونانە کـە بۆ نادیاری و هەندێکیـان بۆ (هەیی-تملک-possessive)ە:-

-راستە هین کوژیاگە ـــ راستە هین کوژراوە.

-لەناوشوان هین دیتم ـــ لەناوشوان هینم دیت(دی).

هین کریم ـــ هینم کری.

لەشوان (هی) بەکاردێت، وەک (هین)جیاوازییان ناکرێت وەک:

-هی کێیە؟ هین کێیە؟ هین مەحمیدە.

جێناوی(هین) لەگەڵ ئامرازی پەیوەندی( ش/ یش)دا بەکاردێت، وەک:

هینیش لەدەستمان چووی ـــــ هینیش لەدەستمان چوو.

دیسان جێناوی لکاو، لەگەڵ ئەم جێناوەشدا دەکەوێتە کۆتایی فرمانەکەوە، وەکو لەرستەکانی سەرەوە پێشانمان دا.

**ئامرازی نەرێ (نەفی)**

جێناوی نەفی لەزاری شواندا(هیچ، قەت) بۆ نەفی کردنە، نموونە:

وەک: هیچ بەقسەیان ناکەم.          قەت پێیان ناڵیم

**لەزاری شوانی کێشکدا :**

قەت ناوشوان لەبیرم نێچوکەوە.

-هیچ بەی نێوشم ـــ هیچی پێ ناڵێم.

-قەت کفر وانێکەم ـــ قەت کفری واناکەم.

**جێناوی نادیار:** لەزاری شوان بەگشتی، ولەشوانی کێشکدا ئەم جێناوە نادیارانە بەکاردێت، شوێنی کەس وشت دەگرنەوە، یا لە قسەکردندا، لەجیاتییان بەکاردێن، بۆیە پێیان دەوترێت نادیار نازانرێ چ کەسی وەیا چ شتێک، نموونە: (کەس، گشت، هەموو/ حەموو، فلان، فیسار، کابرا، هین[نەک وەکو خۆیەتی و هەیی-تملک] . هەرکەس، هەرشت(هەرتشتیک)،

نموونە:

-کەس دیتی؟ ـــــ کەست دیت؟

-کەسیک هاتە؟ ـــ کەسێک هاتووە؟

-حەمووی خواردم ـــ هەموویم خوارد.

-هەرکەس هات بەی بیشە ـــ هەرکەس هات پێی بڵێ.

لەناویاندا جێناوی(کەسێک، حەموو، هین)لەزاری شوانی کێشکدا

زۆربەکارە، هەروەها راناوی فرمانە تێپەڕەکەی(خوارد) چۆتە کۆتاییەوە، بەپێچەوانەی زمانی ئەدەبییەوە.

لێرەوە دێمە سەر بەکارهێنانی جێناوی لکاو، کەلەگەڵ گەردانکردنی جۆروکاتی فرماندا، پیشانیان ئەدەین و لەبەر درێژی خرایە دوای جێناوەکانەوە:

لەپێشەوە گەردانکردنی جێناوە لکاوەکان، لەگەڵ جێناوە کەسییەسەربەخۆکاندا بەکاردێنین وەکو:

| شوانی کێشک | شوان و زمانی ستاندەر |
|---|---|
| منم ـــــ ئیمەین | منم ـــــ ئێمەین |
| تویت ـــــ ئیوەن | تۆیت ـــــ ئێوەن |
| ئەوە ـــــ ئەوانن | ئەوە ـــــ ئەوانن |

**فرمانی رابردوو لەگەڵ راناوی لکاودا:**

**١-فرمانی رابردووی نزیک:** من چوویم ئیمە چوین

[چویین ە]

یاساکەی: قەدی رابردوو+راناوی لکاو تو چویت ئیوە چوین

چوین: چوی+م ئەو چوی/چی ئەوان

چوین/چین

لەکەسی یەکەمی کۆدا دوو (ی)کۆبۆتەوە، یەکەمیان هی قەدی چاوگەکەیە و دووەمیان توشی کرتاندن (elision)«١٦» بووە، چونکە هەردووکیان، یەک دەنگن و یەک شێوەن.

یەک دوو دێ دەڵێن: من چیم، تو چیت، ئەو چی، ئیمەچین [واتە من چووم ... هتد].

**٢- فرمانی رابردووی تەواو:** یاساکەی: چاووگ: قەد+نیشانەی تەواو+راناو

کەفتن: کەفت+گ + م: من کەفتگم ـــــــ کەفتگین(ئیمە)

تو کەفتگیت ـــــــ کەفتگن (ئیوە)

ئەو کەفتە/کەفتگە ـــــــ کەفتگن(ئەوان)

لەزمانە ئەدەبیەکەو شوانی بەگشتیدا دەبێتە: کەوتوومە، کەوتوویتە...هتد

بۆ تێپەڕ وەک: کردگم، کردگیت، کردگە(کردە)، کردگین،کردگن.

**٣- فرمانی رابردووی بەردەوام:** نیشانەی بەردەوام+قەد+راناو

بۆ تێپەڕ:دکردم، دکردی،دکرد، دکردین...

بۆ تێنەپەڕ: کەفتن: د+کەفتن+م: من دکە فتم/م ـــــــ دکەفتین (ئیمە)

تۆ دکەفتیت/یت ـــــــ دکەفتن ئیوە

بۆتێنەپەڕ د کەفت/ ـــــــ د کەفتن (ئەوان)

تیرەی (ورام)لەشواندا نە(د) و نە(ئە) بەکارناهێنن بۆ نیشانەی کاتی بەردەوامی فرمان، کە لەهەموو شواندا بەزۆری(ئە) بەکاردێنن، بەڵکو[دە] بەکاردێنن.

نموونە: دەکەوتم، دەکەوتیت، دەکەوت، دەکەوتین، دەکەوتن...

بەڵام شوان بەگشتی (ئە) بەکاردێنن وەک:

ئەکەوتم.، ئەکەوتیت/ئەکەوتی، ئەکەوتین، ئەچووین، ئەچوون...

کەواتەلێرەدا دەرکەوت سێ نیشانەی بەردەوامی لەناوچەی شواندا بەکاردێت وەکو(د، دە،ئە) لەشوانی کێشک و تیرەی(ورام)و شوان بەگشتی.

**٤-فرمانی رابردووی دوور:**

قەدی چاووگ+ قەدی چاووگی بوین(بی)+ڕاناو

کەفت+بی+م

کەفتن: من کە فتبیم/م ـــــ ئیمەکەفتبین/ین

تو کەفتبیت/یت/ە ـــــ ئێوە کە فتبین/ن

ئەو کە فتبی/ە ـــــ ئەوان کە فتبین/ن

لەکەسی دووەمی تاک و یەکەمی کۆ دا، (ی) راناوە لکاوەکەی (یت)و (ین)، تووشی یاسای کرتاندن (حذف-elision) هاتووەو ئەو (ی)یەی دیارە هی قەدی(بوون)ە کە لەشوانی کێشکدا دەبێتە(بین).

**فرمانی رانەبردوو:** بنووسرێت لەرەگی چاوگەوە بەهۆی لکاندنی نیشانەی بەردەوامی(د)لەسەرەتای فرمانەکەوە لەگەڵ راناوی لکاو لەکۆتاییەوە، ئەمە لەشواندا وەکو زمانی ئەدەبیەکە وایە، نموونە بۆ تێنەپەڕ لەرانەبردوودا دەمێنێتەوە.

چاوگ: نیشانەی بەردەوامی+ رەگ+راناو

نوویسین: د+نوسین+م=دنویسم

| تێنەپەڕە | تێپەڕ |
| --- | --- |
| من دچم-دچین | من دنویسم/م ـــــ ئیمە دنویسین/ین |
| تو دچیت/ی-دچن | تو دنویسیت/یت ـــــ ئیوە دنویسن/ن |
| ئەو دچوک-دچن | ئەو دنویسیک/یک ـــــ ئەوان دنویسن/ن |

لەزاری شواندا وەکو زارە ئەدەبیەکە دەبێتە:[من ئەنووسم، تۆ ئەنووسیت، ئەو ئەنووسێت، ئێمە ئەنووسین، ئێوە ئەنووسن،ئەوان ئەنووسن]، کەچی لەتیرەی(ورام) شواندا، دەبێتە: من دەنووسم، تۆ دەنووسیت، ئەو دەنووسێت، ئێمە دەنووسین، ئێوە دەنووسن،ئەوان دەنووسن.

دەچم- تۆ دەچیت/ی، ئێمە دەچین، ئێوە دەچن، ئەوان دەچن، ئەو دەچێت.

ئەمە یاسای کاتی رانەبردووە، بەگشتی، بەڵام بەهۆی بەکارهێنانی

ئاوەڵفرمانی کاتەوە، دەکرێتە کاتی ئێستاو ئاینده، لەزاری شواندا، ئاوەڵفرمانی کاتی ئێستا وەکو(وا، ئەوا، ئەوە، ئێستا، هێمە). بەگشتی وەکو زمانە ئەدەبییەکە وایە. بەڵام ئاوەڵفرمانی کاتی ئێستا لەشوانی کێشکدا وشەی تایبەت بەخۆی هەیە، وەکو(هێمە) واتە(ئێستا) یان ئاوەڵفرمانی(ئێستاکە، ئێستاکانە، ئێستەرەم، عەلعان، سارەزوی ·ئێستا )ش بەکاردێت. نموونە:

- هێمە چم ڕاشار ـــــ ئێستا ئەچم بۆشار (وا، ئەوا، ئەوە)

- ئیستەرەم واتمەی ـــــ هەر ئێستا ئەمەویت (دەمەوێت)

- ئێستاکە شکات لەی کەم ـــــ ئێستا شکاتی لێدەکەم(لێئەکەم)

- ئێستاکانە دبەمەوەی ـــــ ئێستا دەیبەمەوە (ئەیبەمەوە)

- عەلعان یارمەوەی ـــــ ئێستا/وا/ئەوا دەیهێنمەوە(ئەیهێنمەوە)

عەلعانەکی چم لەگەڵیا ـــــ هەر ئێستا ئەچم لەگەڵیدا.

لەئایندەدا بەهۆی ئاوەڵفرەمانی کاتی ئایندەوە، کەهەر ناوێکی کاتی بۆ بەکاردێت: سارەزوی زەردەشت یاکەوە-بەیانی زوو زەردەشت دێتەوە.

-خوایار بووک سبەینێ خۆشی وگەشی ڕوی لەمان کەیک.

-ساڵیکە خانک کەم(دکەم) ـــــ ساڵێکە خانوو دەکەم

-دوایی بەی دویشم ـــــ دوایی/ لەپاشانا پێی دەڵێم.

- مانگیکە دەس کەم بەعیش ـــــ مانگێکە دەست دەکەم بەئیش.

لەم رستانەی سەرەوەدا دیاردەیەک هەیە، پێویستە دیاری بکرێت، ئەویش کرتاندنی نیشانەی بەردەوامی(د) لەزاری شوانی کێشکدا، بەئارەزوو سەلیقە، دەتوانین وەکو نیشانەی(بـ)ی داخوازی لە فرمانی دارێژراوو لێکدراودا بەکاری نەهێنین، کەبەر یاسای زمانەوانی (lingustic) بەئارەزوو (optional)«١٧»دەکەوێت، کە لەزارە ئەدەبییەکە و زاری گشتی شواندا وانییە، هەرچەندە لەفرمانی داخوازی و لێکدراودا لەزمانی کوردیدا وایە.

## فرمانی داخوازی:

فرمانی داخوازی وەکو یاسای پێکهاتن هەروەکو زارە ئەدەبییەکەو زارە گشتێکەی شوان وایە، تەنها وشەکانی جیاوازن، نموونە:

نیشانەی داخوازی+رەگی چاوگ+راناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاک و کۆ.

نوویسین: بـ + نویس- ٥ /ن= بنویسە / بۆتاک-بنووسە.

بنویسن/ بۆ کۆ - بنوسن.

دابنیشە- دانیشە بەریاسای ئارەزوو کەوتووە، (بـ) نامێنێ، چونکە فرمانێکی دارێژراوە یان لێکدراویش هەمان شتە، وەک : نان بخۆ ـــــ نان خۆ، عیش بکە ـــــ عیش کە: ئیش بکە، ئیشکەن.

تا ئیرە یاسای بەکارهێنانی راناوی لکاوە لەگەڵ فرمانی رانەبردووی تێنەپەڕو رانەبردووی تێپەڕ، بێجگەلەناوێزەیی کەسی سێیەمی تاک جیاوازی هەیە، ئەویش بۆ رانەبردووی تەواو راناوەکە دەبێتە(ە)و لەرانەبردووی تێپەڕدا بۆتە (یک)، بەڵام لەرانەبردووی تێنەپەڕدا بۆتە(وک).کە ئەمە پێچەوانەی زارە گشتییەکەی شوان وزمانە ئەدەبییەکەیە. وا لەخشتەیەکدا دەیانخەینەڕوو، راناوی بۆ رابردووی تێنەپەڕ و تێپەڕ لەزاری شوانی کێشکدا:

| رابردووی تێنەپەڕی کێشک | راناوەکانی | رابردووی تێنەپەڕ لەشوان وزمانی ئەدەبی | |
|---|---|---|---|
| من کەفتم- ئیمە کەفتین | م-ین | من کەوتم - ئێمە کەوتین | م-ین |
| تو کەفتیت/ی ئیوە کەفتن | ی/یت-ن | تۆ کەوتیت/ی -ئێوە کەوتن | ی/یت-ن |
| ئەو کەفتە/ە-ئەوان کەفتن | ە-ن | ئەوکەوت ە-ئەوان کەوتن | ە-ن |

**هەمان یاساکەی زمانی ئەدەبییەکەیە.**

| بۆ رابردووی تێپەڕی کێشک | راناوەکانی | رابردووی تێپەڕی شوان و زمانی ئەدەبی | |
|---|---|---|---|
| -من خواردم-ئیمە خواردین | م-ین | من خواردم -ئێمە خوادمان | م-مان |
| -تو خواردیت/ی-ئیوە خواردن | یت/ی-ن | تۆ خواردت-ئێوە خواردتان | ت-تان |
| -ئەو خوارد ە-ئەوان خواردن | ە-ن | ئەو خواردی-ئەوان خواردیان | ی-یان |

**لەراناوی لکاو لەگەڵ دەمی رانەبردووی تێنەپەڕ لەهەردوو زارەکەدا:**

| رانەبردووی تێنەپەڕی شوانی کێشک | راناوەکانی | رانەبردووی تێنەپەڕی شوان و زمانی ئەدەبی | |
|---|---|---|---|
| -من دکەفم-ئیمە دکەفین | م-ین | من ئەکەوم- ئێمە ئەکەوین | م-ین |
| -تو دکەفیت-ئیوە دکەفن | یت/ی-ن | تۆ ئەکەویت/ی-ئێوە ئەکەون | یت/ی-ن |
| -ئەو دکە فیک- ئەوان دکەفن | یک-ن | ئەو ئەکەوێت- ئەوان ئەکەون | ێت-ن |
| | | ئەخوات | |

ات

لەتیرەی (ورام)یشدا هەمان یاسای زمانە ئەدەبییەکەو زاری گشتی شوانە، تەنها ئەوەنەبێت بۆ نیشانەی بەردەوامی[دە] بەکاردێنن، نەک (ئە)، وەک دەکەوم و دەخۆم و، دەچم.

شتێکی دیکەی گرنگ و ناویزە لەم زارەدا ئەوەیە، بەپێی یاسای ئارەزوو(optional) دەتوانی یانیشانەی بەردەوامی[د] بەکارنایەت یا دەتوانی بەکاری نەهێنی، بەڵکو تەنها رەگی فرمان و راناوە لکاوەکانی بەکاردێت، وەک:

من چم، توچیت، لەبری من دچم، تو دچیت..

رانەبردووی تێپەڕ لەهەردوو زارەکەداک

| رانەبردوو تێپەڕ لەزاری شوانی کێشک | راناوەکانی | رانەبردووی تێپەڕ لەزمانی ئەدەبی و شوان بەگشتی | |
|---|---|---|---|
| من دخۆم-ئیمە دخۆین | م-ین | من ئەخۆم - ئێمە ئەخۆین | م-ین |
| -تو دخۆیت/ی-ئیوە دخۆن | یت/ی-ن | تۆ ئەخۆیت/ی-ئێوە ئەخۆن | یت/ی-ن |
| ئەو دنویسیک، ئەو د چوک | وک { | ئەو دەنوسێت | |

لەم یاسایانەی سەرەوەدا شتی و دیاردەی زەق ودیار، کەجیاواز بێت لە زمانە ئەدەبیەکەو زاری شوان بەگشتی، ئەوەیە راناوی لکاوی (م،ت،ی،ما،تان،یان) لەگەڵ فرمانی رابردووی تێپەڕی زاری شوانی کێشکدا بەکارنایەت و، ئەوەی لەگەڵیدا بەکاردێت هەمان راناوی لکاوی دەمی رابردوو ورانەبردوو فرمانی تێنەپەڕ و رانەبردووی تێپەڕەو، راناوی لکاوی کەسی سێیەمی ئەم زارە هەروەکو زارە ئەدەبییەکە ناوێزەیە (شاذ)، لەرابردوو تێنەپەڕەو تێپەڕدا دەرنەکەوتووە، کەچی لە زمانی ئەدەبییدا بۆکەسی سێیەمی رابردووی تێپەڕ دەبێتە(ی) لێرەدا دەرنەکەوتووە[ە] و لەنەخشەکەدا نیشانەی دەرنەکەوتنمان بۆی بەکارهێناوە، هەروەها ئەم راناوە لەگەڵ فرمانی رانەبردووی تێنەپەڕو تێپەڕدا لەزاری ئەدەبیماندا(زمانی نووسین) بریتییە لە(ێت،و ات) لەزاری شوانی کێشکدا بووە بە(یک،وک)، ئەوەی لێرەدا، سەرنج راکێشەرە، راناوی لکاوی کەسی سێیەمی تاکی شوانی کێشک تەنها لەگەڵ فرمانی رانەبردووی چاوگی(چوین-بوین)واتە(چوون-بوون)

دەبێتە(وک)وەکوو: ئەو دچوک، ئەو دبوک، ئیمە چین،..

لەجیاتی[ئەو دەچیت، ئەو دەبێت، ئیمە دەچین].

شتێکی دیارەکەپێویستە بوترێت، ئەوەیە راناوی لکاو کە لە گەڵ فرمانی رابردووی تێپەڕدا نایەت، کە بریتییە لە(م، ت، ی، مان، تان ،یان) کەچی لەگەڵ ناوو ئاوەڵناودا، بۆهەیی(تملک-possessive) بەکاردێت وەکو:

ماڵم خۆشە-ماڵمان خۆشە،

ماڵت خۆشە- ماڵتان خۆشە، ماڵیان خۆشە.

لەگەڵ ئاوەڵناویشدا:

-من گوڵ جوانم هەیە-ئێمە گوڵ جوانمان هەیە

-تۆ گوڵ جوانت هەیە- ئێوە گوڵ جوانتان هەیە.

دیاردەیەکی دیکەی فرمانی تێپەڕ، لەزاری شوانی کێشکدا، ئەوەیە، ئەگەر هاتوو فرمانەکە، دارێژراو یا لێکدراو بێت، یا بەکاری لەگەڵدا بەکاربێت، ئەوا بەپێچەوانەی زارە ئەدەبییەکەوە، راناوە لکاوەکانی،کۆمەڵەی دووەم(م، یت، ە، ین ، ن ، ن)ی لەگەڵدا، لە کۆتاییەوە بەکاردێت، نەک بچێتە نێوانیانەوە، وەکو:

-من راکردم ــــــــ من رامکرد (زاری ئەدەبی و شوان)

-ئیمە نان خواردین ــــــ ئێمە نانمان خوارد(= = = )

-تو کتێب کڕیت ــــــ تۆ کتێبت کڕی.

لێرەدا دوو دیاردەی جیاواز لەیەکترەوە دەبینرێت، راناوە لکاوەکان جیاوازن لەدەستووری رێزمانی زمانی ئەدەبی و کەوتوونەتە کۆتاییەوە. ئەم زارەش یەکێکە لەزارەکانی ناوچەی گەرمیان و لەدەستووری زارە ئەدەبییەکە لایداوە«١٨»

**فرمانی بکەرنادیار:**

(مبنی للمجهول- Passive Voice)

ئەم جۆرە فـرمـانە، لەزاری شـوان وەکـو زمـانە ئەدەبییـەکـەیە، بەڵام لەزاری شـوانی کـێـشکدا جیـاوازەو، دەچێـتـەوە، سـەرزارەکـانی کـرمـانجی باشـووری وەکو:لوڕی و خانەقینی، لێرەدا یاسای پێکهاتنی دەخەینە

ڕوو: ڕەگی چاوگ+نیشـانەی نادیاری+نیشانەی کات=فـرمانی بکەرنادیار بۆ ڕابردوو.

خۆ + ر + یاک= خواردن: خو+ر+یاگ = خورياگ

نووسین: نویس+یاگ ـــــ نویسیاگ ـــــ نوێسریاگ

منداڵەکە نانەکە خوارد ـــــ نانەکە خورياگە ـــــ نانەکە خوراوە

مامۆستا کتێب کڕی ـــــ کتێب کریاگە ـــــ کتێب کڕاوە

پیاوەکە گورگە کە کوشتە ـــــ گورگەکە کوژیاگە ـــــ گورگەکە کوژاوە.

**بکەرنادیار لەدەمی ڕانەبردوودا بەم جۆرە پێکدێت:**

چاوگ:نیشانەی بەردەوامی + ڕەگی فرمان+ نیشانەی ڕانەبردووی نادیاری+ نیشانەی کات

نوسین: د+نویس+ر+یک=دنویسریگ

مامۆستاکە ناوقوتابێکە دنوویسیک/ ناو قوتابییەکە د نوویسریک

+منداڵ نان دخۆیک ـــــ نان د خوریک

گەردانکردنی فرمانی بکەر نادیار لەگەڵ ڕاناوەلکاوەکاندا: بۆ ڕابردوو

| | |
|---|---|
| -من کوژیاگم«١٩»م | -من کوژرام/م |
| -تۆ کوژیاگیت/ی | - تۆ کوژرایت/یت |
| -ئەو کوژیاگە (کوژیاگ)/ە | - ئەو کوژراوە/ە |
| -ئێمە کوژیاگین/ین | -ئێمە کوژراین/ین |

-ئیوه کوژیاگن/ن - ئێوه کوژران/ن

-ئەوان کوژیاگن/ن - ئەوان کوژران/ن

راناوەکانی (م،ی،ە) دەرناکەوێت، (ین، ن، ن )لەگەڵ زمانی ستاندەردو زاری شوان بەگشتی جیاوازی نییە، بەڵام جیاوازی لەیاسای پێکهاتنی کەرەسەکانی فرمانی بکەر نادیارە، کەنیشانەی کاتی نادیاری بۆ رابردوو بریتییە لە(یاگ)، بەڵام لەرانەبردوودا دەبێتە(یگ) کەبەرامبەر بە(ا،ی)ی زمانی ئەدەبییە. هەندێک جار نیشانەی(ر)ی نادیاری لەدەمی فرمانی رابردووی ئەم زارە دا، لە هەندێک فرماندا توشی لەناوچوون و کرتان (حذف elison) دێت وەک نموونەکانی سەرەوە لەفرمانی(کوژیاگ،...)دا بەڵام راستێکەی دەستوورەکەی دەبێت(ڕ)تێدا بێت، وەکو:

من کوژریاگم، توکوژر یاگیت، ئەو کوژریاکە، ئیمە کوژریاگین، ئیوه کوژریاگن، ئەوان کوژریاگن.

فومانی رابردووی مەرجی(ئیلزامی)

ئەم فرمانانەش شێوەی دروستبوونی خۆی هەیە لەزاری شوانی کێشکدا، بەڵام لەزارە گشتییەکەی شواندا، هەروەکو زمانە ئەدەبییەکە وایە لەرووی دەستوورەوە لێرەشدا یەکن، نموونە: بکوشتاگام، بنوویسیاگا، بچوویاگا... هتد.

چاوگ:نیشانەی مەرجی(ئیلزامی)+ قەدی چاوگ(steem)+ راناو

ب+کوشت+اگا+م=بکوشتاگام

کەفتن: بـ + کەفت + نیشانەی ڕێژەی مەرجی(ئیلزامی/ئینشائی)(اگا)= بکەفتاگا

**لەگەڵ راناوی لکاودا:**

-من بکەفتاگام ـــــ ئیمە بکەفتاگاین ـــــ بکەوتایەم

-تو بکەفتاگایت ـــــ ئیوه بکەفتاگان ـــــ بکەوتایەیت

- ئەو بکەفتاگا ـــــــــ ئەوان بکەفتاگان ـــــــــ بکەوتایە

**بۆ رانەبردووی مەرجی(ئیلزامی):**

یاساکەی: نیشانەی مەرجی+ رەگی چاووگ+ راناوی لکاو=فرمانەکەی

کەفتن: بـ +کەف +م=من بکەفم-ئیمەبکەفین

تو بکەفیت - ئیوە بکەفن

ئەو بکەفیک ئەوان بکەفن

**لەزارە گشتییەکەی شوان و زمانی ئەدەبیدا:**

من بکەوم، تۆ بکەویت، ئەو بکەوێت، ئیـمـەبکەوین، ئێـوە بکەون، ئەوان بکەون

بۆ تێپەڕ وەکو: من بکەم، تو بکەیت، ئەو بکەیک، ئیمەبکەین....

**بۆ رابردووی دووری مەرجی(ئیلزامی) بەمجۆرەیە:**

**چاووگ:** قەدی چاوگ + قەدی چاوگی بین(بوون)+ پاشکۆی رێژەی مەرجی +راناو

کەفتن: کەفت +بیـ + اگا + م = کەفتتبیا گایت، کەفتبیاگا، کەفتبیاگاین، کەفتبیاگان. بۆ تێپەڕ

وەک: کوشتبیاگام، کوشتبیاگایت، کوشتبیاگا....

لەزاری شـوان و زمـانە ئەدەبیـیـەکـەدا دەبێـتـە: من کـەوتبـوومـایە، تۆ کەوتبوویتایە، ئێمە کەوتبووینایە، کەتبوونایە.

**نیشانەی کۆ:** نیشانەی کۆ لەزاری شواندا جیاوازی ئەوتۆی نییە لەگەڵ زمانە ئەدەبییەکەدا و بریتییە لە(ان، گەل) وەکو: پیاوان، مێگەل، مامۆستایان،... بۆ ناسراوی کۆش: پیـاوەکان،مامۆستاکان، بەڵام لەزاری شوانی کێشکدا بریتییە لە(گەل، ەل، یەل، ان)وەک: کورگەل، پیاوگەل، سەگەل، مامۆستایەل، پیاوەل، منداڵەل، ژنەل، کچەل/ کچێل، برایەل، زستانان...هتد).

لەم رووەوە مامۆستا گیوموکریانی نەمر دەڵێت:«ئامرازی گەل لە ئەردەلان، لوڕستاندا بەفەیلی و لوڕو بەختیاری و شووان و کەلهوڕەوە،ئەمانەن: (ان،یان، ل، یەل، گەل) باوکان، برایان، برایەل، براگەل، کوڕەل، کوڕەل،گایەل...«٢٠»، راستێکەی بۆچوونەکەی مامۆستا گیو راستە، بەڵام نیشانەی(ان، یان) یەکن، تەنها جیاوازی دەنگسازییە شێوەیان گۆڕاوە و نیشانەی (ل) یش بەتەنها بەکارنایەت و بریتییە لە(ەل) مەگەر مەسەلەی دەنسگازی لەوشەیەکی کۆتایی هاتوو بە(ە)بیکات بە(ل)، کەلەئەنجامی یاسای کرتاندنەوەیە ئەم شێوەیە وەردەگرێت.

نیشانەی ناسراوی(ەکە) و نەناسراوی(یک)

نیشانەی ناسراوی لەزاری شوان بەگشتی و، لەزمانی نووسینماندا، بریتییە لە(ەکە، یەکە/کە) وەک : کوڕەکە، گوڵەکە، مامۆستاکە، گایەکە، لەشوانی کێشکدا هەرهەمان شتە، وەک: دوێتەکە، گایەکە، مامۆستاکە.

نیشانەی نەناسراویش لەهەردوو زاری یەکەم وپێشەوەدا بریتییە لە(ێک، یەک)، وەکو:کچێک، مامۆستایەک بۆ کورتکردنەوە دەبنە ·کچێ، مامۆستایێ، کوڕێ...) لەزاری شوانی کێشکدا نیشانەکەدەگۆڕێت بۆ (یک) وەکو: دوێتیک، پیاویک، مامۆستایک)داریک).

**نیشانەی ناوی بکەرو بەرکاری:** لەزمانی نووسینی وشواندا بریتییە لە (وو/و)وەک: (هاتوو، کەوتوو، سووتاو، بڕاو) بەڵام لەم زارەی کێشکدا دەبێتە(گ)وەکو: هاتگ، کەفتگ، سووتیاگ بڕیاگ، خەفتگ، بڕیاگ،.... هتد.

**نیشانەی ناوی بکەر:** لەزمانی ئەدەبی کرمانجی خواروو شواندا(ب) ندە،یار، چی، ۆک،ەر/یدە، ..هتد)، وەک: (بکڕ، بفرۆش دڕندە، جووتیار، پینەچی، گەڕۆک، نووسەر، بخۆر..) لەشوانی کێشکدا هەمان شت هەن وەکو: (ببڕو

بکوژ، جفتیار، کارگەچی، گەڕۆک، بخۆر).
تەریدە، دڕندە، هوشیار، دانا، کڕیار، لێکدراویش وەکو: خۆکوژ، خۆگر، می سین(مووسێن)، نانکەر، راوکەر.
**نیشانەی بچووککردنەوە:** وەکو(ۆک، ەڵە، ۆکە، چە، ە، کە، ویلکە، یلە، ەلە... هتد) نموونە: برایمۆک، سمایلۆک، یاسینۆک، گۆزەڵە،
داسویلکە، ەلانە: گچکەلانە/بیچکەلانە،
ترپۆکە، خزمۆکە، باخچە، سمە، بیچکە، بیچکەلە، خڕیلە، خدە)...
[رستەسازی(سینتاکسی-syntax)]
لەبەشی رستە سازیدا، ئەوەی گرنگەوزیاتر جیاوازی نێوان زاری گشتی شوان و زمانی ئەدەبی، لەلایەک و زاری شوانی کێشک لە لایەکی دیکە پیشان ئەدین، کە جیاوازن لەیەکتر، یەکێک لەو بابەتانە(گرێ-phraze)یە، کە لەرووی پێکهاتنەوە، جیاوازەو گرێ لەم زارە دا، ئامرازی پەیوەندی کەدەچێتە نێوان وشەوە وەرناگرێت، کەئەمە پێچەوانەی زمانی ستانداردە، ئەم دیاردەیە بەگشتی لەگەرمیاندا بەدی دەکرێت . نموونە:
ماڵ براکەم، میللەت کورد، ماڵ کاکەم، پرد خاسە، شیوکانیسارد، گوڵ گەنم، شارکەر کویک، کەل سمایل بەگی، شەوزستان، ڕووژدرێژ، شارکۆیە، سەرساڵ، سەر ساڵ نو، چاومار، سەگ هار،
نموونە لەرستەدا: من چم راماڵ براکەم ـــــ من ئەچم بۆ ماڵی براکەم.
-میللەت کورد بێ خاوەندە ـــــ میللەتی کورد بێ خاوەنە.
-پردخاسە گەلیک کۆنە ـــــــ پردی خاسە گەلێک کۆنە.
-شەوزمستان نێبرپاکەوە ـــــــ شەوی زستان نابڕێتەوە.
شارکەرکویک ماڵ کوردە ـــــ شاری کەرکووک ماڵی کوردە.
-من سەرساڵ چم بۆ زیارەت ئومەرمەندان ـــــ من سەری ساڵ دەچم بۆ

زیارەتی ئۆمـەرمـەنـدان.بەڵام لەم زارەدا ئامـرازی (ڕا، بۆ، لە، بە)گـرێ دروست ئەکـەن و لەرستـەدا دەوری جۆراوجۆری رستـەسازی لە بکەروبەرکـارو تـەواوکـەر دەبینین، وەکو:

-من سەر خۆم دخورنم ——— من سەری خۆم ئەخورێنم.

-من چم ڕا شار ——— من ئەچم بۆشار.

خەناوکە بۆت یارم ——— ملوانەکەت بۆدەهێنم.

-ساڵە بەعسێکە قـەت لەبیـرم نێچـووکەوە. ساڵ بەعـسێکە قـەت لەبیـرم ناچێتەوە.

ماڵ باوک دیدار برادەرم خەڵک ناوشوانن(گرێکە فراوان کراوەتەوە).

-دوایی بەی دویشم-پاشان پێی ئەڵێم.

-رەسمەکە بەدیوارەوە داکوتم-وێنەکە بەدیوارە وە داکوتم.

لەم زارەدا پاشکۆی ئامـرازی پەیوەندی کـەمـتـر بەکـاردەهێنرێت، کـەدەکـەونە دوای ناوەوە،یا کـورت دەکـرێتـەوە وەکـو(دا) دەبیـتـە(ا)، پاشکۆی (ەوە)ش بەکاردێت، نموونە:

-من لەشارەوە هاتم ——— من لەشار هاتمەوە (زاری کێشک).

- زاگرۆس چوێوە بۆماڵ ——— زاگرۆس چۆوە بۆ ماڵ

-لەو ژوورەوەهاتم ——— لەی ژوێرەوە هاتم.

## ئاوەڵفرمانی نەرێ (نەفی- ناکردن)

ئاوەڵفرمـانی نەرێ کـەبریتـییـە لە(نە، نا، نـی، مە)لەزاری شوانی کـێشکدا دەبێتـەوە(نە، نێ، نی، مـە) بۆ دۆخی نەکـردن لەدەمـە جیـاوازەکـانی فـرمـاندا بەکاری دەهێنین وەکو: (نە) بۆ نەکردنی کاتی رابردوو نموونە:

نەچوی، نەخەفت، نەخوارد، لەرستەدا:

من نەچویم ڕا شار ـــــ من نەچووم بۆشار.

(مه) بۆ نەرێکردنی فرمانی داخوازییه، وەکو: مەچو بۆ بازار:

نێ: ئاوەڵفرمانی نەرێ بۆ کاتی ڕانەبردوو، نموونه: (نێچم، نێخەفم، نێکەم نێبەم) لەجیاتی (نا)بەکاردێت و گۆڕانی دەنگی(ا ـــــ ی)وەکو: ناچم نێچم. نموونه: - بەیانیان زوی نان بەی نێخوریک ـــــ بەیانیان زوو نانی پێ ناخورێت.

ناوی نێنویسم ـــــ ناوی نانووسم.

**(نی) بۆنەرێکردنی:** بوون و نەبوون.

نان نییه.

پارەم نییه.

جیاوازی لەگەڵ زاری شوان و زمانە ئەدەبییەکەدا ئەوەیە(نای) ڕانەبردوو دەبێتە(نێ)، ئەمەش دیاردەیەکی ڕێزمانییه وەکو: (ه،ا)، لەکرمانجی سەرووشدا دەبنە(ی-ێ)وەکو:

[دەرسیم ـــ دێرسم، ماردین ـــ مێردین)«٢١». هەروەها (ان،ات)ی کۆ لە سەروودا دەبنە (ێن،ێت: کوڕێن، کوڕێت)

**ئامراز:** لەبەشی ڕستەسازیدا، بەپێویستی دەزانین،کەنموونەی ئەو ئامرازانەی کەلەم زارەدا بەکاردەهێنرێت جیاوازن لەئامرازی زارە گشتێکەی شوان و زمانی ئەدەبی، بەنموونەوە، بیان خەینەڕوو:

ئامرازی سەرسوڕمان: وەکو: (پەکوف، پەکوح، هیزە، ئەیەڕۆ، کەسەر، کەسەرڕوداخ، مخابن، حەیف ومخابن، ئاخ، حەیف، وای، ئەی لەیە، دەک دەک) ئەمە لەم زارەدا، بەڵام لەزاری شوان و ئەدەبییەکەدا، وەکویەکن و نموونەی تریش هەن هاوبەشن و لەزاری کێشکدا بەکاردێن، بەڵام ئەمانە تایبەتن، وەک:

-پەکوف لەوغەدرە! پەکو لەم غەدرە!

-پەکوح ئەیە بۆ واکەیک!          پەکوح ئەمە بۆ وائەکات!

-هیزە واز لەیبیارە!          هیزە وازی لێ بهێنە!

-ئەیەڕۆ قالە شێت هاتەتەوە!

-ئەی لەیە، دبووک چۆ بووک!     ئەی لەمە ئەبێ چی بێت!

-دەک دەک خەریکە بایگ لەی!  دەک دەک خەریکە لێیبدات!.

-حەک لەسەگە بۆرە!

ئامرازی تریش هەن، بەڵام بەزۆری هاوبەشن وپێویست بەنموونەی ناکات.

**ئامرازی وەڵام:** تا رادەیەک لەزمانی نووسین وزاری شواندا، وەکو یەکن بەڵام ئەمانە تایبەتن بەم زارە، وەکو: ئێ، ئا، ها، هۆو، با، ئێی، بەڵێ، بەدی، هۆی، هۆی بەڵێ. نەء، نا، نە، نەخێر(کەمترە).

-ئێ وادیام.          هاکاکە.          ئێ باشەوایە.

-ئا وایە.          هۆو بەڵێ.          با وایە.

-بەڵێ واتمەی          بەدی هات.

-نەء نیاک.   نەنایەت. (نە، نا) بۆ وەڵامی نەرێن.

**ئامرازی بانگکردن:** وەکو: (هۆ، ئەرێ، هێی، هۆی، هۆهۆ) ئەمانە بە شێوەی وشەن، بەڵام بەشێوەی ئامرازی بانگ کردنی دەنگیش هەیە.

وەکو: (ە: خاڵە،ۆ: کاکۆ بۆنێر، ێ: کچێ، ی: میمی، ینە:کوڕینە)، [ ە: بۆنێرە، (ێ-ی: بۆمێیە]، [ینە: بۆ نێر ومێی کۆیە].

ئامرازی بانگ کردنی ئاژەڵیش هەیە، وەکو: ئۆحە، یخە، هڕە، تەس، گدی گدی، هێشە(هێش)، هسە(هس)،پشە(پش)، کوت کوت،...هتد.

بۆ پەلەوەریش، وەکو: جووجوو، کشە(کش)... هتد. ئامرازی تر هەن، بەڵام بۆئێرە بەسە.

**ئامرازی خۆزگە:** بۆ خۆزگە خواستن وەکو: خۆزگە، بریا خۆزگەم بەخۆت.

بریابهاتاگا لەگەڵمانا. خۆزگە بەی بۆتام.

**ئامرازی گومان:** بۆ گومان کردن لەرووداو و روونەدانی رووداو وەکو(بەشکی، بەشکو، دبوک، دبوکن، ئەگە، ڕەنگە، سا، بەشکوم، بەشکم، لەوانەیە.

-بەشکی بیاکەوە ـــــ بەڵکو بێتەوە

-دبووک بەقسەم بکەیک ـــــ دەبێ بەقسەم بکات.

-ئەگە یای لەگەڵما، خێراوەرە. ئەگەر دێیت لەگەڵمدا..

-سابۆخوا کەریمە. ـــــ دەسا(سا) وەرە خوا کەریمە.

-بەشکوم ئەیە خوایە پەشیمان ببووکەوە. بەڵکو خوا بکات پەشیمان بێتەوە.

**ئامرازی لێکچواندن:** ئامرازی ئەم جۆرە، لەم زارەدا، کە تایبەتە بەخۆی، بێجگە لەوانەی کەگشتین بۆ ناوچەکەو بۆ زمانی نووسین ئەمانەن: ئەمنی، دەمنی، شەپاندن، ئەڵەی، دویشی، کوتومت،

-زاگرۆس ئەمنی دایکێتی ـــــ زاگرۆس وەک دایکێتی.

دەمنی شێرە شەرکەیک. ئەڵێی شێرە شەڕئەکات.

-بەباوکی شەپاندمەی ـــــ بەباوکی شوبهاندم.

-دویشی باوکێتی ئازایە.

**ئامرازی بێجگە:** وەکو: (بێجگە، جگە، تەنیا، بێجگە لەوی، بەس، بێ، بەبێ.

**نموونە:**

-بێجگە لەدیدار کەس نیاک ـــــ بێجگە لەدیدار کەس نایەت.

-حەموویان هاتن تەنیا کاکەم نەبوک ـــــ هەموویان هاتن تەنیا(تەنها) کاکم نەبێت.

-بێجگە لەوی کەستر خۆش نێواتم ـــــ بێجگە لەوی کەسیترم خۆش ناوێت.

-بەس بەو بویشە ـــــــ بەس بەو بڵێ.

-بێ تونیام بۆ ئەورە ـــــــ بێ تۆ نایەم بۆ ئەوێ.

**ئامرازی تەئکید (جەختکردن):**

وەکو ئەم ئامرازانە(هەر، با، دە، کە، دەسا، جا، دەبا) ئەم ئامرازانە هەمان شێوەی ئامرازی جەختکردنن کە لەزاری شوان بەگشتی و لەزمانی نووسیندا بەکاردێت، وەکو:

-بوچکە بن دنیا هەر گرمەی ـــــــ بچێتە بن دنیا هەر ئەیگرم.

-قەینێکەیک با بیاک لەگەڵما ـــــ قەیناکات بابێت لەگەڵمدا

-دەساوایە، دەساواکردم ـــــــ دەسا وامکرد.

-دەی بەشەڕی خاڵخالانا گۆرانیک بیشە. دەی بەشەڕی خاڵخالاندا گۆرانییەک بڵێ

- دەبا حەموو ناوشوان ئاوەدان کەینەوە( لە سەرووشدا: [حەمی] بەکار دێت)..

**ئامرازی مەرج:** لەزاری شوانی کێشکدا ئەمانەن(شەرتە، شەرت بوک، حەتا، حەتاوەکی، حەتاکو، حەتاکونێ(حەتاکون)، هەتا(شێوەکانی تریشی) گەر،..).

نموونە: حەتا ئاو لەدوی بێڵم بیاک واز لەی نیارم.-شەرتە گۆڕەکەی کوێخا نەرگس شوانی هەڵگرم.

-شەرت پیاوبوک واز لەشارکەرکویک نیارم. شەرتی پیاوبێ واز لەشاری کەرکووک نەهێنم

-حەتاوەکی بەقسەی بکەیک خۆشی واتم ـــــ هەتا بەقسەی بکات خۆشم ئەوێ.

-گەر بەی بیشن(بویشن) دیاریکەی ـــــ ئەگەر پێی بڵێن ئەیهێنێ.

هەندێک جار بۆئارەزوو نیشانەی بەردەوامی {د} تێدەچێت و

دەبێتە (یاریکەی).

**ئامرزای ئاگادارکردنەوە(وریاکردنەوە):**

وەکو نموونەکانی(ئەهـ، ئەها، هێی، هەی، وا، ئەوا، ئەی) وەکو ئامراز هەرهەمان ئامرازی زمانی نووسینن، نموونە:

-ئەهـ وایی ــــــ ئەهـ رایکرد.

-ئەها قویچاندەی ــــــ ئەها قوچاندی.

-هێی سەر زل بۆ نێحەویتەوە ــــــ هێی سەر زل بۆ ناحەویتەوە.

- سەبرت بوک وا دیاک ــــــ سەبرت بێ وا دێت.

**ئامرازی سەر زەنشتکردن:** بۆ سوکایەتی وگاڵتە پێکردنە، وەکو (شیڕ، ترحێو، دۆیها، زەڕ، چش، تفو(تف)، جرت وفرت، حەی حەی، هۆیها!

نموونە:

-شیڕ ئیشیک تو بکەیتەی ــــــ شیڕ ئیشێک تۆ بیکەیت.

-ترحێو دیسان یاکەوە ــــــ ترحیو دیسان دێتەوە.

-حەی حەی لەدەس تو ــــــ هەیهەی لەدەست تۆ.

-جرت وفرت یاک و چوک ــــــ جرت و فرت دێت ودەچێت.

**ئاوەڵفرمان لەزاری شواندا: (الظرف)**

جیاوازی ئەوتۆ نابینرێت لەنێوان زاری شوان وزمانی نووسینی(کرمانجی ناوەڕاست)، بەڵام لەزاری شوانی کێشکدا، وشەو ئاوەڵفرمانی سەربەخۆی هەیەو هی واش هەیە هاوبەشە لەزاری ناوچەکەو لەزمانی

نووسین. نموونە:

**ئاوەڵفرمانی کاتی:** وەکو: (سارەزوی، سبەینێ، هێمە، عەلعان، عەلعانەکی(الأن)، ئیستەرەم، شەوەکی، کازیبی بەیان، دەمەوبەیان، پارشیم(پارشێو)، ماڵخەفتک(کاتی ماڵ خەوتن)، نیمە شەو، چێشتەنگاوە،

خۆر دەرچوین، پاش نیمەڕۆ(پێش...) خۆرکەفتن، بەچاوجویقانیک، خۆر لەزەردە، بەچاو توریکانیک، عەیام [عەیامێک] سالآنیک، سالآنیکە، رۆژگار/ رۆژگاریک، بوهار، بوهاران، زمستان، جارجار، جارێک، جار، حەفتەی تر، لەمەودویا، قەدەریکە.

**ئاوەڵفەرمانی شوێنی:** وەکو: (بان، بن، ناوقەد، پێش، دویا(ئەم وشەیە(وی)کەی بەیەک دەنگ دەخوێنرێتەوە)، پەڕ، پەڕگە، ناو، لا، لەلا، تەک، لەتەک، لەجێ، لەشوێن، لەژوێر،لەسەردا، لەسەرداوە، لەوخوارەوە.

بۆشوین:

-لەبان دیوارەکە دانیشتبیم ـــــــــ لەسەر دیوارەکە دانیشتبووم.

-ماڵ ئیمە لەو پەڕ ئاواییە ـــــــــ ماڵی ئێمە لەوپەڕی دێیە.

-لەپەڕگەی ئاواییەوە کانیک هەیە ـــــ لەپەرگەی دێیەکەوەکانییەک هەیە.

-تا ناوقەد ئاو هاتبی. هەتا ناوقەدی ئاو هاتبوو.

-ئاوەکە لەسەرداوە پاکی کردمەوە- ئاوەکەم لەسەرەوە پاک کردەوە.

**بۆکات:**

قەدەریکە هاتە ـــــــ ماوەیەکە هاتووە.

-جارجار سەر دەملەی ـــــ جار جار سەری لێ ئەدەم.

- تا ماڵخەفتک نیامەوە. ـــــ تا ماڵ خەوتن نایەمەوە.

-لەکازیب بەیانەوە هەڵسیاگم ـــــ لەکازیوەی بەیانەوە هەڵساوم.

**پەراوێزو سەرچاوە:**

(+) ئەم باسە، باسێکی وەسفی بەراوردییە، لەشوێنی پێویست باسە وەسفێکە، دەبێتە باسێکی لێکۆڵینەوەی بەراوردی، بۆ مەبەستی جیاوازی دەرخستنی نێوان زاری شوانی کێشک لەلایەک وزمانی ستاندەر و زاری شوان

بەگشتی لەلایەکی تر. وشە و رستە بەرامبەر نموونەکانی ئەم زارە بۆ بەراوردەکەیە.

١- د. زەنون پیریادی، سەرنجی بۆ ئەم باسە لەرەنگینی ژمارە(٩٨)ی ١٩٩٧

لەلاپەرە(١٢-١٣) راکێشاوە، کە تیایدا باس لەگەڕەکی پیریادی کەرکووک و پیریادی چەمچەماڵ دەکات.

٢- یەکێک لەم سیاسەت و دیاردانەی دژی شاری کەرکووکی کوردان، بەفەرمانی رەسمی کارگێری خۆجێیەتی(الادارة المحلية) پارێزگای کەرکووک لەساڵی ١٩٧٦ نوسراوێکی رەسمییان ئاراستەی کتێبخانەی گشتی کەرکووک کردبوو[ بەداخەوە ژمارەکم لانییە] تا کتێبە کوردیەکان بەتایبەتی گرنگەکان ببرێتەوە بۆ ئەو فەرمانگەیەو لە تۆماری کتێبەکاندا هێڵی سووریان بەسەر ناوی ئەو کتێبانەدا کێشا بوو لەسەری بەقەڵەمی سوور نوسرابوو «سحب بأمرالمحافظ الى الأدارة المحلية» ئەمەم بەچاوی خۆم دیوەو خوێندومەتەوە. ئەمە بێجگە لەوەی هیچ گۆڤارو رۆژنامەی کوردی و کتێبی نوێ لەساڵی ١٩٧٥ بەدواوە بۆ ئەم کتێبخانەی کەرکووکە نانێردرێت. هەموو کتێبە کوردییەکانی ناگەیشتە(٧٠) کتێب یا ئەوانەی بەتایبەتی لەسەر کوردن.

٣- بێجگە لەمامۆستای نەمر گیوموکریانی، عەبدولرەحمان زەبیحی، غازی فاتح وەیس باسی هەندێک زاری پارێزگای کەرکووکیان بەکورتی کردووە، ئیتر لەکوردەکان کەس بەلایدا نەڕۆیشتووەو ئەم ناوچە فراوانەی کەچەندین زاری وەکو: کاکەیی، زەنگنە،شوان، شێخانی لێیەو هەموو ناوچەکە، وەکو زار لەهەندێک نووسیندا، براوەتەوە سەر زاری سلێمانی، کەچی جیاوازییان هەیە لەگەڵ یەکتر.

٤- هێمام بۆ ئەم زارە لەوتاری (شوان) لەگۆڤاری هاواری کەرکووک ژ(٤)

کردووه.

٥- بۆ نموونە خەڵکی شاری سلێمانی دەنگی(ء) قوت ئەدەن و پاشگری(ەوانێ)ش لەکەرکووک بەکارنایەت و راناوەلکاوەکانیشی لەرستەدا شوێنیان پێچەوانەی زاری سلێمانییە، راستە لەیەکترەوە نزیکن، بەڵام جیاوازیشیان هەیە.

(×) د. کەمال فوئاد لەلاپەرە(٢٠)ی گۆڤاری زانیاری ژمارە(٤)ی ساڵی ١٩٧١ ئەمەی دیاری کردووە.

٦- گیوموکریانی، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بەپیتی لاتینی، هەولێر، ١٩٧٢ ، ل ١٣ .

٧- گیوموکریانی، فەرهەنگی مهاباد، هەولێر ١٩٦١ ، ل ٦ ، لەوتاری «شوان» لەگۆڤاری هاواری کەرکووک هێما بۆ ئەمە کراوە بروانە ل٣٥-٤٧ .

٨- بروانە: د. رەفیق شوانی،شوان، گۆڤاری هاواری کەرکووک، ژمارە(٤) ل ٣٥-٤٧ هێما بۆ سەرچاوەکەی حەمیدی ئیزەد پەناە کراوە، لە(فەرهەنگی لەک و لوڕ)، ل. ٢ .

٩- رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٢٧)، ل ١٤-١٧ .

١٠- عبدالرحمن ئەمین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم (د)، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧، ل ٤٢ ،ئەم نووسەرە خۆی لەکاتی ئاوارە بوون وکوردایەتیدا بەشداری لەگەڵ شۆڕشی کوردستانی باشووردا لەناوشوان بووە. لەوتاری (شوان)ی هاواری کەرکووک، ژ(٤) هێمام بۆ ئەمە کردووە.

١١- د. شێرکۆ بابان، رستەسازی شیتەلکاری زانستی، هەولێر، ١٩٩٦، ل أ، ٣٦، ٣٩،... هتد بێجگە لەوەش کارەکانی خۆی بەبڕیاری تەواوەوە بڕیاردراوە، کە ئەمە پێچەوانەی کاری ئەکادیمییە.

١٢- لەپیاوە پیرو بەساڵا چووەکانی لای خۆمانم بیستووەو نەوەی دوای ئەوانیش دەڵێن خەڵکی شوان لەناوچەی گەرووسی سەربەشاری سنەوە هاتوون و گوایە ئاخاوتنیانیش وەکو یەکە. د. کەمال فوئادیش لەگۆڤاری زانیاری، ژمارە(٤)ی ١٩٧١، ل(٢٣)دا.

دەڵێت«.. لەناوچەی(گەرووس) لەباکووری رۆژهەڵاتی (سنە) زاراوەیەکی تایبەتی قسەئەکەن زۆر جیاوازە لە(سنەیی) و(موکری)، دیسان ئەمە دڵنیامان ئەکاتەوە، کە زاری شوانی کێشک یەکێکە لەزارەکانی کوردی باشووری هەرچەندە نووسەر ناوی زاری شوانی نەهێناوە.

١٣-لەوتاری«شوان»گۆڤاری کەرکووک بەهەڵەدێی ناروجەی گەورەو ناروجەی حمەبلە کە هەردووکیان ناوێکن بۆ ئەم دێیە لەلایەن هەڵسەنگێنەری وتارەکەوە کراون بەدوو دێ، راستێکەی یەک دێن و لەکەوانەدا ناوی دووەمیان دانرابوو، بێجگە لە کەوتنی ناوی مام رۆستەم کە خۆی و پێشمەرگەکانی لەشیوەسوور تا مانگی کانونی دووەمی ١٩٨٩ مابوونەوە.

١٤-قەرەبڵاغ: دێیەکە کیلۆمەترێک لە(رێدار)ی مەڵبەندی شوانەوە دوورە لەوتاری(شوان) لەبیرکرابوو.

١٥-**بروانە:** د. رفیق شوانی، شوان، گۆڤاری کەرکوک، ژ(٤)، ل٣٥-٤٧ هێمامان بۆ ئەمە کردووە، کە(ورام)تیرەیەکی تایبەتی شوانەو لەو دێهاتانە پێکهاتووە، کەدەست نیشان کراون.

١٦-دیاردەیەکی زمانەوانییە وەکو یاسایەک هەندێک دەنگ تووشی نەمان و تێچوون دێت، کە(کرتاندن)ی پێدەوترێت و یەکێکە لەزاراوەکانی زمانەوانی(علم اللغة-lingustic) بروانە: قاموس علم اللغة الحديث، نخبة من اللغويين العرب،لبنان، ١٩٨٣، ل ٢٣ .

١٧-رەفیق محەمەد محێدین، مۆرفیمی«ب» لەرووی مۆرفۆلۆژییەوە،

گـۆڤـاری رۆشنبـیـری نوێ، ژ(١٣٨)، ١٩٩٦، ل ٢٢-٢٥ . لەزمـانـی ستانداردا نیشانەی «ب»ی داخوازی ئەگەر فرمانەکە داڕێژراو یا لێکدراو بێت بەپێ ئەم یاسایە (ئارەزوو-optional) توشی کـرتاندن (الاسقـاط) ئەبێت. وەکـو: هەڵبـڕێژە ـــــ هەڵڕێژە، هەڵبگرە ـــــ هەڵگرە، لەزاری تیرەی(ورام)دا (نان خۆ) لەجیاتی (نان بخۆ) بەکاردێت و لەشوانی کێشکدا هێمامان بۆ نەمانی (د) نیشانەی بەردەوامی کرد.

١٨- پێچەوانەی بیروڕای زاری کوێستان وگەرمیانی د. شێرکۆیە کە لە زمانی کوردیدا بابەت و زاری وا نییە.

١٩- نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کامەران، سلێمانی ١٩٦٠، ل ١٣٠ . لەپەراوێزدا شێوەی دروستبوونی ئەم جۆرە فرمان بکەرنادیارە کردووە لەهەندێک زاردا بێ ئەوەی دیاری بکات.

٢٠-گیوموکریانی، ئەلف وبێی کوردی وێنەدار ....، ل ١٣٠ .

٢١-لێرەدا مـەبەست لەگۆڕانی دەنگییـە، چونکە لەکرمـانجی سـەروودا، ئاوەڵفـرمـانی نەرێی(نێ) نییـە و بریتییـە لە(نا) بەڵام(نێ) لە دیالێکتی باشووردا زۆربەکاردێت.

**تێبینی:** خوایاربێت وتارێک لەبارەی زارەکانی سنووری پارێزگای کەرکووک و گەرمیانەوە، دەنووسم و چاوەڕێی ئەو هەلەم. هەروەها داوای لێبوردنیش ئەکەم بۆ لەبیـرچوونی ناوهێنان و یاداشت کـردنی هەندێک ناودارانی شـوان و لەوتاری(شوان)ی ژمـارە(٤) هاواری کەرکووک، وەکو: حەمەی مەلا عوبێدی کلاوقوتی، مەلا ئەحمەدی حەکیم (ئیمام و خوتبەخوێن لە کەرکووک)،حاجی خورشید تۆراغ(حەکیم و پزیشکی ناوچەکە بۆ چاکبوونەوەی دەیان دەردونەخۆشی کوشندە و شکستی، فەقێ محەمەدی عەلی بەیانی، ملازم شوان (عبدوئیلا لە مامڕەشی) شۆڕشگێڕویەکێک بوو لەسێکوچکەی سەرکردایەتی پاسۆک، کاک

سوبحی عەلی هەرزانی حاکمی استئنافی هەولێر وەکو فەرمانبەرێکی پلەبالا، عادل یادگار، مەلابەهادینی مامرەشی، بلەی گەندیاک، مەجیدی مەلامستەفا، حوسێن کوێخا رەجەب، هەروەها (گەرەکی شوانەکان) لە کەرکووک بەناوی هۆزی شوانەوەیە و هەر لەبەر ناوەکەی ئێستا تەخت کراوە و کراوەتە گەراجی ترومبیل بەرامبەر مەحکەمەی کەرکووک. حەزدەکەم ئەوە بڵێم، کە ئەم وتارە، بابەتی تری سەربەم زارە هەیە، کە لێرەدا من باسم نەکردووە، لەبەر درێژە دان و من مەبەستم لێرەداو لەم وتارە نیشاندانی جیاوازی و بوونی ئەم زارەیە لەناوچەی کەرکووک، ئەگینا بابەتی دیکە هەیە و بەونیازەی لەدەرفەتێکی تردا بیکەم بەکتێبێک بۆرێزمانی ئەم زارە، بۆ نموونە: دیاردەی جێگیرکردنی راناوی کەسی سەربەخۆ بەلکاو لەزمانی ئەدەبیماندا شێوەی راناوە سەربەخۆکە دەگۆرێت، کەچی لەزاری شوانی کێشکدا ئامرازە پەیوەندییەکە وەکو خۆی دەمێنێتەوەو راناوە کەسییە سەربەخۆکە دەگۆرێت نموونە:

لەئەوم پرسی ـــــــ لەی پرسیم (شوان)

بەمنی وت ـــــــ بەم وەت

ئەمانەی لای راستەوە لەزمانە ئەدەبییەکەدا دەبێتە لێم پرسی، پێمی وت، بەلام نموونەکانی لای چەپەوە لەزاری شواندا ئامرازەکانی نەگۆراون وراناوەلکاوەکانی کەوتوونەتە کۆتای فرمانەکەوە، کەپێچەوانەی زمانە ئەدەبییەکەیە.

* * *



## ژیانی نووسەر لەچند دێڕێکدا:

- لە سالی ١٩٥٣ لە دێی نارۆجەی گەورەی ناوچەی شوانی سەر بە پارێزگای کەرکووک، لە بنەماڵەیەکی فەلاحی ملکدار لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی لە دێیەکەیان و لە ڕێداری سەڵبەندی ناوچەی شوان و ناوەندی و ئامادەیی لە کەرکووک و زانکۆ لە سلێمانی و ماجستێر لە زانکۆی سەلاحەدین و دکتۆراش لە زانکۆی بەغدا تەواوکردووە.
- هەردوو خوێندنی ماجستێر و دکتۆرای بە چوار ساڵ تەواوکردووە و ماجستێر بە ساڵ و نیوێک و دکتۆراش بە دوو ساڵ و نیو، لەم ڕووەوە خەلات کراوە و سوپاس و ڕێزی بەهەمان مەبەست پێدراوە.
- سالی ١٩٦٨ چۆتە ریزی یەکێتی قوتابیانی کوردستان و بەپلەی ئەندامی لیژنەی قوتابخانە و لیژنەی کۆلێژ و پاشان ئەندامی کۆنگرەی (ی.ق.ک) لە سالی ١٩٧٢ و لە سێ ئۆردوگای هاوینەی قوتابیان لە قەرەحەسەن و هەشەزینی و ئاغجەلەر لە سالی ١٩٧١، ١٩٧٢ ، ١٩٧٣ بەشداری کردووە.

لە ١٩٧٤/٤/٢٤ لە بۆمبابارانی شاری قەلادزێدا بە خەستی بریندار بووە و لە نەخۆشخانەکانی ئێران چاک بۆتەوە و پاشان لە هەمان ساڵدا کراوە بە مامۆستای شۆڕش لە پێنجوێن لە دێی هەرگێنە.
- ئێستا مامۆستای زمانەوانی بەشی کوردی کۆلێژی ئادابی زانکۆی سەلاحەدینە بەپلەی پرۆفیسۆری یاریدەدەر.